
تصوير ابو عبدالرحمن الكردي
المعلقات العشرة
بەکوردی
دە چامە هەڵواسراوە زێڕینەکانی چاخی نەفامی
بە کوردی کردنی
مەلا عبداللطیف باموکی
التفسیر



**( المعلقات العشرة )**

**بەکوردی**

**دە چامە هەڵواسراوە زێڕینەکانی**

**چاخی نەفامیی**

| | |
|---|---|
| نـــاوی کتێـــب بـــەکوردی: | ( المعلقات العشرة ) بەکوردی<br>دە چامە هەڵواسراوە زێڕینەکانی چاخی نەفامیی. |
| وەرگێـــــڕ و ڕافـــــەکار: | مەلا عبداللطیف بامۆکی |
| پێداچوونەوەی زمانـەوانیی: | ئاری عبداللطیف |
| بڵاوکردنـــــــــــەوەی: | نوسینگەی تەفسـیر بـۆ بڵاوکردنـەوەو ڕاگەیانـدن/ هەولێر |
| تایـــــــــــــپ : | جیهاد غەریب |
| وردبینیـــی و هەڵەچـــن: | ئارام بامۆکی |
| نەخشەســازی نـــاوەوە: | جمعە صدیق کاکە |
| خـــــــــــە ت: | نەوزاد کۆیی |
| بـــــــــــەرگ : | أمین مخلص |
| نـــۆرە و ســـاڵی چـــاپ: | یەکەم ١٤٣٢ك – ٢٠١١ز |
| تـــــــــــیراژ: | ١٥٠٠ دانە |

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپیاردنی (٢٧١٧) ساڵی ٢٠١٠ پێدراوە





بۆ بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن
هەولێر- شەقامی دلدگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس
ت : ٢٢٢١٦٩٥ - ٢٢٢٠٩٠٨- ٢٥١٨١٣٨
مۆبایل : ٠٧٥٠ ٤٦٠ ٥١ ٢٢ - ٠٧٧٠ ١٣٨ ٧٢ ٩١
tafseeroffice@yahoo.com
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com

# ( المعلقات العشرة )

# به كوردی

## ده چامه هه‌ڵواسراوه زێڕینه‌كانی چاخی نه‌فامیی

( ئیمرءئولقه‌یس، تورفه‌ی كوڕی عه‌بد، زوهه‌یری ئه‌بی سولما، له‌بیدی كوڕی ڕه‌بیعه، عه‌نتەره‌ی كوڕی شه‌داد، عه‌مری كوڕی كولسوم، حاریسی كوڕی حیلله‌زه، ئه‌عشای گه‌وره، نابیغه‌ی زوبیانی، عه‌بیدی كوڕی ئه‌برەس ).

به‌كوردی كردنی

**مه‌لا عبداللطیف باموْكی**



به ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

# چامە هەڵواسراوەکان

گومانی تێدا نییە کە چامە هەڵواسراوەکانی عەرەب کە بەزاراوەی خودی خۆیان لەسەردەمی بەناو نەفامیی پێش ئیسلام گوتراون، پلەو پایەی بەرزی ویژەیی و زمان و زانستی زمانەوانیی لەوانەوە سەرچاوەی گرتووە، کۆدەنگی توێژەران و ڕەخنەگرانی ئەدەبی کۆن و نوێ هەیە لەسەر ڕەسەنی دەق و ناوەڕۆك و باری کۆمەڵایەتیی و نەریتی خێڵایەتیی و داب و ڕەوشتی ئەو سەردەمە بەڕوونی نیشان دەدات و عەرەب زۆر بایەخی پێداون و پەسەندی کردوون و لە هۆنراوەکانی کۆن و نوێی عەرەبی جیاکراونەتەوە و بە چامە زێڕینەکان ناوبراون، چونکە لەسەر قوماشی نایابی بەزێڕ ئاودراو نوسراونەتەوەو لەسەر دیواری کەعبەی پیرۆزی ئەو سەردەمە هەڵواسراون، بەڵام هەندێ لە زانایان دەڵێن نازناوی هەڵواسراو لەبەر ئەوەیە کە لەنامەخانەو خەزێنەی پادشا و میرە دەسەڵاتدارەکان پارێزراوبوون، وەك شتێکی بەنرخ و عەنتیکە، لەگەڵ ئەوەش کە دەڵێن گوایە نوسەرێکی وەك (حماد الراویە) ئەم چامانەی نوسیوەتەوەو هەڵبەستراوەو داتاشراوەو زانای وەك دکتۆر (تەها حسێن) بە داتاشراویان دەزانێ و بە نوکتەی سوعبەت و قسەی نەستەق ناویان دەبات، بەڵام هەندێکیکە زۆر بەتوندی بەلایانەوە ڕاست و دروست و ڕەسەن و خاوەن و بوێژی خۆیان هەیەو ناسراون وەك (ئیمرەئولقەیس،

نابیغەی زوبیانی، زوهەیری ئەبی سولما و عەنتەرە، تورفە و عەلقەمە و ئەعشا).

لەلایەکی ترەوە هەندێ زانا بەلایانەوە وایە وشەی (مُعَلقات) بەمئاوی گەوهەر و مرواری بەنرخ و شازادەکان وەك ملوانکەی مورو و وشەی گرانبەها لە ملیان کردووە.

ئەگەر زۆر بەوردی تەماشای نەریتی چاخی نەفامیی بکەین، دەبینین جگە لە چامە، گەلێ پەیماننامە و قەواڵە و ڕۆژنامە لەسەر دەرگای کەعبە هەڵواسراون، وەك ئەو ڕۆژنامەی کە بۆ گەمارۆی پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێت) کرا لەلایەن قورەیشییەکانەوە، یان دانانی هارونەڕەشید ئەمین و مەئمون بە جێگر و هەڵواسینی بە دیواری کەعبەدا، نیشانەی ئەوەیە ئەم نەریتە باوبووە، ئەوە لەناو عەرەب بۆ شیعر کراوە و لەبارەی نەژاد و نەسەب و قەواڵەی بنەچەوە زۆریان مەبەست بووە پاراستنی ناوی باوك و باپیر و هۆز و خێڵ و بنەماڵە، تەنانەت ئەگەر کەسێك بە ساختە خۆی هەڵواسیبێ، زۆر زوو ناسراوە و ناوی نراوە (پەنادراو).

لە کوردەواری قەواڵەی زۆر گرنگ پاش نوسینەوەی بەخەتێکی جوان لولەکراوە و لەناو دارێکی هەڵواسراو یان قامیشی شمشاڵ دانراوە و هەردوو سەری قایم کراوەو لە بنمیچی دیوار دانراوە بۆ مێژوو و لە ئەدەبی گریکیشدا باوبووە، چامەی پەسەند بەزێڕ نوسراوە و لە پەرستگای ناوبانگدا پارێزراوە.

# خاوەن هەڵواسراوەکان

توێژەران و مێژوونووسانی وێژەی عەرەبی ناکۆکن لەژمارەی ئەم چامە هەڵواسراوانە و ناوەڕۆك و هەتا خاوەنەکانیان و نازناوەکانیشیان، وەك: هەڵواسراو، زێڕین، درێژ.

هەندێك دەڵێن ژمارەیان حەوتە کە ئەمانەیە: ئیمرەئول قەیس، تورفەی کوڕی عەبد، زوهەیری کوڕی ئەبی سولما، لەبیدی کوڕی ڕەبیعە، عەمری کوڕی کەلسوم، حارسی کوڕی حیللەزە، عەنتەرەی کوڕی شەداد. لای بازێك لە ئەدەبناسەکان کراوە بە هەشت، کە: نابیغەی زوبیانییە، کە دێڕی یەکەمی لای ئەبوزەیدی قوڕەیشی لەکتێبی (جمهرة اشعار العرب) ئەمەیە:

عُجُوا فَحَيّوا لَنُعْمَ دِمْنَةُ الدارِ
ماذا تُحيّونَ مِنْ نُؤيٍ وأحجارِ

بەڵام خەتیبی تەبریزی دەڵێ: ئەو چامە نییە بەڵکو ئەمەیە:

يا دارَ ميّةَ بالعلياءِ فالسند
أقوَت وطالَ عيها سالف الأبَدِ

بەشێکی دیکە لە مێژوونووسان دەڵێن: ئەوانە دە چامە و دە خاوەنەکەن، نۆیەم ئەعشای قەیس و دەیەم عوبەیدی کوڕی ئەبرەسە.

بەهەرحاڵ ئەم چامانە لە چامە بەرزەکانی ئەدەبی عەرەبییە و خوێنەری کورد مەگەر لە کتێبی مەکتەب و لە بەشی زمان و ڕێزمانی

عەرەبیدا ئەم دەقانەی چاوپێكەوتبێ و هەتا ئێستە وەك دەقی تەواو لەبەرگی كوردیدا ڕاڤە نەكراوە و بۆ زیاتر ئاشنابوون بە زمانی عەرەبی ڕەسەن و ڕەوان و پەسەند وامان بە چاكزانی بەرهەمی هەوڵی خۆمان لە پێشانگای فەرهەنگ و زمانی كوردیدا دابنێین.

ئەوجا پلە و پایە و پاش و پێش و مێژوو و ژیاننامەی شاعیرەكان زۆر مەبەستی ئێمە نییە، لەگەڵ گۆڕین و مانای دەقەكان لە زمانی عەرەبیدا، كە ئەركی توێژەری عەرەب و كورد پێویست ناكات خۆی پێوە ماندوو بكات، بەڵكو ئێمە لە سەرچاوەكانی ئەدەبی عەرەبی دەقەكان ڕاستەوخۆ دەكەین بە كوردی، بە سود وەرگرتن لە شەرح و ڕاڤەی زانایانی وەك (زەوزەنی و تەبریزی و سیوطی) و بەكەڵك وەرگرتن لە قاموس و فەرهەنگی عەرەبی.

# ئیمرەئولقەیس

ئیمرەئولقەیس کوڕی حوجر کوڕی حارس، کە نازناوی (پادشای وێڵ)ی بۆ دانراوە، کە باوکی کوژراوە و مەزنایەتی لەدەستچووە و نازناوی (زامدار)ی پێوە نراوە، چونکە بە گیایەکی ژەهراوی مردووە، ئەم شاعیرە وەك شازادە پەروەردە کراوە و ژیانی نەرم و گەرم و خۆش بووە، جوان و شۆخ و شەنگ بووە و زۆر سەرگەرم بووە بە ڕابواردن و عەشقبازیی و مەی و ڕاووشکار و کۆڕی گۆرانی و شیعر خوێندنەوەوە.

ناوەڕۆکی چامەکەی ڕابواردنی بێ پەردەی لێ دەچۆڕێ و (٨٠) بەیتە و لە بەحری طەویلە بە یاسای عەروزی عەرەبی و مەبەستی جگە لە وەسفی هەوارگە و شوێن و لەوەڕگە و ڕۆژانی هەرزەکاری و دڵداری، باسی شەو و دەشت و گورگ و درندەی جەنگەڵ و ئەسپ و ڕاوونێچیر و ئاو و هەوای سروشت و هەور و باران و لافاو و گوڵ و گیای بەهاری دورگەی عەرەبە.

ئەم شاعیرە زۆر هەستێکی ناسك و چێژێکی نەرم و وردی هەیە و لە باسی ئاسك و کارمامز و باڵندە و ئافرەتدا کەم وێنەیە، ئەم شاعیرە مەزنە بە زاراوەی ئەدەبی نەفامیی، بەڵام لەڕاستیدا تەنها لەڕووی ئاینەوە نەفامبوون، لە نەجدی دورگەی عەرەبیدا لەدایکبووە و باوکی پادشای خێڵەکەی بووە و ساڵی (٥٠٠)ی زاینی لەدایکبووە و لە هەرەتی لاویدا باوکی کوژراوە و کەوتووە، لە بیری تۆڵەکردنەوەدا بووە، بەڵام بێ ئاکام بووە و سەردانی پادشای بێزەنتی کرد و کراوە بە میری فەلەستین،

بەڵام تووشی نەخۆشی ئاوڵە بووە و لە تەمەنی (٤٠)ساڵیدا مردووە ساڵی (٥٤٠)ی زایینی، قەسیدەکەی باسی هەوار و خەمی جیابوونەوەی خۆشەویست و سەردەمی لاوی و ڕابواردن و شەوانی سەفەر و باسی شیوی چۆڵ و پڕ مەترسی و باسی ئەسپسواری و ڕاو و شکار و هەورەبروسکە و باران و لافاو دەکات.

قِفَا نَبْكِ مِنْ ذِكْرَى حَبِيبٍ وَمَنْـزِلِ  بِسِقْطِ اللِّـوَى بَـيْنَ الـدَّخُولِ فَحَوْمَـلِ

قفا: بوەستن، نبك: بگرین، ذکری: یاد، حبیب: خۆشەویست، منزل: هەوار، سقط: تەنك، اللوی: ڕێز و لمی شیوی نەرم و ناسك.

ئەم شاعیرە دەگری و گوێگرانی دەکاتە گریان و وەستاوە و داوای وەستان دەکات، کە یادی دۆست و خۆشەویست و هەوارگەی دەوارنشینی شیوی لێژەواری ڕێز و وردە داخوراوەکەی بینی کە دۆڵی مەنزڵ و ماوای یارەکەیەتی، داوا لە دووکەس دەکات، بەڵام لەکوردیدا دوو نییە، پاش یەك و تاك و کۆ هەیە، ئەم تاکە بەیتە ڕەوانبێژیی و کورتبێژیی و ناسکیی و جوانیی تێدا جێگە کردووەتەوە.

(دەخول) و (حەومەل) ناوی دوو هەوارگەی خۆشەویستی شاعیرە، کە دەڵێ: ڕاوەستن وەك من ڕاوەستام و بگرین وەك من دەگریم بۆ یادی خۆشەویست و هەوارگەی کە لە ڕێزە لێژەکەی نێوان (دەخول) و (حەومەل) بنە و بارگەیان داناوە و خۆشەویست لەناو خێڵی خۆی و منیش وێڵ و داماوم.

فَتُوضَحَ فَالمِقْرَاةِ لَـمْ يَعْـفُ رَسْـمُهَا  بِمَـا نَسَـجَتْهَا مِـنْ جَنُـوبٍ وَشَـمْأَلِ

لـم يَعْـف: كوێرنەبووەتـەوە و نەكوژاوەتـەوە، رسـم: ئاسـەوار و شـوێن، نسجت: هۆنـراوەتەوە و لەيەك هەڵبەسراوە.

دەڵـێ: شـوێنی خۆشەويسـتەكەم لـەنێوان (دەحـول) و (حەومـەل) و (توزەح) و (ميقرات) دايە، بەڵام چونكە بـای باشـوور و بـاكوور بەسـەريدا هـاتووە، وێنـەی ئـاگردان و هەوارگـە نەكوژاوەتـەوە هـەتا مـن لـە بيريبەرمەوە.

تَـرَى بَعَـرَ الأَرْآمِ فِـي عَرَصَـاتِهَا    وَقِيعَانِهَـا كَأَنَّـهُ حَـبُّ فُلْفُـلِ

بعر: پشقل، الأرام: ئاسكی سپی، عرصات: گۆڕەپان، قيعان: چاڵاو، حب: دانە، ناوك، فلفل: بيبەری توون و تيژ.

دەڵـێ: كـە لەنزيكـەوە تەماشـای ئـەم هـەوارە بكـەيت دەبينـی پشـقلی ئاسكی سـپی لەبـەری گۆڕەپـان و پەچـەی ئاژەڵەكانيانـدا كـەوتووە، ئـەڵێی ناوكی بيبەری توونە كـە درەنـگ دەڕزێ، (مەبەسـتی ئەوەيـە زۆر لەمێـژە لێرە باريانكردووە).

كَـأَنِّي غَـدَاةَ الْبَيْـنِ يَـوْمَ تَحَمَّلُـوا    لَدَى سَـمُرَاتِ الْحَـيِّ نَـاقِفُ حَنْظَـلِ

غداة: بەيانی، تحملوا: باريـانكرد، سمُرات: داری دڕكاويی بيابـان، حـیّ: خێڵ و گەڕەك و گوند، ناقف: هەڵمژ، حنظل: گوژاڵكەی زۆر تاڵ.

دەڵـێ: ئـەو ڕۆژەی كـە باريـان بـاركرد و جيابوونـەوە مـن لـەناو دارە دڕكاويـەكانی هەوارگـە فرمێسـكم دەهاتـە خـوارەوە وەك ئـەو كابرايـە كـە

شەمامەی گوژاڵەی هەڵمژی لەبەرماڵێ کە چاوی پڕ ئەبێ لەئاو، بەو شێوە بووم.

وُقُوفاً بِهـا صَـحْبِي عَلَـيَّ مَطِـيَّهُمْ    يَقُولُـونَ: لاَ تَهْلِـكْ أَسـىً وَتَجَمَّـلِ

وقوف: ڕاوەستان، صحب: هاوڕێ، مطيّ: وشتری سواریی، تهلك: فەوتان و تیاچوون، أسی: خەم و پەژارە، تجمّل: جوان و باش خۆنیشاندان.

دەڵێ: وتم ڕاوەستن: ئەوانیش ڕاوەستان بەخۆیان و بە وشتری سواریانەوەو پرسە و دڵدانەوەیانکردم و وتیان: بابەگیان بۆچی بەخەم و پەژارە خۆت ئەفەوتێنی و خۆڕاگربە و بە شێوەیەکی جوان خۆت نمایشکە، باوەڕت بەرزبێت.

وَإِنَّ شِـفَائِي عَبْـرَةٌ مُهَرَاقَـةٌ    فَهَلْ عِنْـدَ رَسْـمٍ دَارِسٍ مِـنْ مُعَـوَّلِ؟

شفاء: دەرمان و چاکبوونەوە، عبرة: دڵۆپێك فرمێسك، مُهراقة: ڕژاوە، رسم: شوێنەوار، دارس: ڕزیو، معوّل: شوێنی گریان، یان پاڵپشت و شوێنی حەوانەوە.

دەڵێ: دەرمانی دەردی من ئەو دڵۆپە فرمێسکەیە کە لەسەر شوێنەواری دۆستم ئەیرێژم، بەڵام لەهەوارگەی چۆڵ و هۆڵ ون بووە و ڕزیوە و شوێنگەیان ماوە، یان ئاگردانێك بەردی سێ کوچکە ڕماوە، کە من پاڵی پێوە بدەم و بۆی بگریم تە بەخواڵچونکە خۆشەویستەکەم باریکردووە و هەوارگەی چۆڵە، تەنها لە دڵما ماوە.

كَـدَأْبِكَ مِـنْ أُمِّ الحُـوَيْرِثِ قَبْلَهَـا وَجَارَتِهَـا أُمِّ الرَّبَـاب بِمَأْسَـلِ
إِذَا قَامَتَـا تَضَـوّعَ المِسْـكُ مِنْهُمَـا نَسِـيمَ الصَّبَا جَـاءتْ بِرَيّـا القَرَنْفُـلِ

دأب: عـادەت، خـوو، تضوّع: بـۆنێكی خۆشـی لێـدێ كـە میسكە، نسـيم الصّبا: سروەی بەیان، ريّا: بۆن، القرنفل: مێخەك.

دەڵـێ: وەسـتام و دەوەسـتم وەك خـووم پێـوە گرتبـوو لەگـەڵ دایكـی (حويريس) و هاوسێكەی دایكی (ڕەباب) لـە (مەئسـەل)، كـە نـاوی شـوێنە، ئەم دوانە كە خۆیان بەرز بكردایەتەوە بۆنی میسك و عەنبەر بە سـروەی شەماڵی بەیانی بۆنی بڵاو دەبووەوە، دیارە ڕۆژانێـك لەگـەڵ ئـەم كیژۆڵەیـە ژیاوە!.

فَفَاضَتْ دُمُـوعُ الْعَـيْنِ مِنِّي صَـبَابَةً عَلَى النَّحْرِ حَتَّى بَـلَّ دَمْعِيَ مِحْمَلِـي

فاضـت: لافـاوی كـرد، صـبابة: بـیرەوەری نـازك، النحـر: سـنگ، بـل: تەڕبوون، محمل: زريزەی شمشێر بۆ هەڵگرتن لەگەڵ كێلان.

دەڵـێ: لـەو هەڵوێسـت و بیرەوەرییـەدا لافـاوی فرمێسـك لـە چـاوم وەك شەتاو هاتەخوارەوەو بیرەوەریـی لاویـی و سـركیی و كەمئـەزموونیی خـۆم كردەوەو سنگم تـەڕبوو، شمشێرەكەمی تـەڕكرد كـە لەسـەر شـان و لەسـەر سنگم بوو.

أَلاَرُبَّ يَـوْمٍ لَـكَ مِـنْهُنَّ صَـالِحٍ وَلاَسِـيَّمَا يَـوْمٌ بِـدَارَةِ جَلْجُـلِ

ألا: ئاگاداربە، لاسیما: بەتایبەتی.
مانای ئەم بەیتە لەگەڵ بەیتی پاشەوە ڕوون دەبێتەوە.

وَيَــوْمَ عَقَــرْتُ لِلْعَــذَارَى مَطِــيَّتِي    فَيَــا عَجَبَــا مِــنْ رَحْلِهَــا الْمُتَحَمَّــلِ

عقرت: سەرم بڕی، غذاری: کەنیشکگەل، عجبا: سەرم سووڕداناوە، رحل: بارەکەی، المتحمّل: کە بارکراوە لە وشترە سەربڕاوەکە.
دەڵێ: زۆر ڕۆژی خۆش و چاك و باشم هەبووە لەگەڵ ئەو کیژۆڵانەی کە لەگەڵ خێڵەکەیان بەجیا سەفەریانکردبوو، بەتایبەتی لەسەر کانی و ئاوی جول جول، ئەو ڕۆژە ئەو وشترەم بۆ سەربڕین و دامام بە دەست بارەکەیەوە کە چۆن هەڵیبگرم.

فَظَــلَّ الْعَــذَارَى يَــرْتَمِينَ بِلَحْمِهَــا    وَشَــحْمٍ كَهُــدَّابِ الــدِّمَقْسِ الْمُفَتَّــلِ

یرتمین: بۆ یەکتریان فڕێ دەدا، شحم: بەز و چەوریی، هدّاب: برژانگ، پەراوێز، الدمقس: ئاوریشم، المفتل: بادراو.
دەڵێ: لە نیوەڕۆژی ئەم کاروانەدا کە شاعیر وشترە قەڵەوەکەی سەربڕی بۆ کچگەل و ئەوانیش ئاگریان کردەوەو نێڵەی ئاگر و ئاوی سارد و گۆشتی برژاوی سەر پشکۆ و سکڵ، پلە گۆشتی برژاوی چەوریان بۆ یەك فڕێ دەدا، کە وەك پەراوێزی ڕەفتەی ئاوریشمی بادراو تووند و تۆڵ و پتەو خەز و بەزی وشترە قوربانییەکە، دیمەنێکی سەرنجراکێشە، کۆمەڵە کیژێکی هەرزەکار لەگەڵ تەنها گەنجێکی لاوی شازادە و سەرۆککۆمار و لە نزیك چاڵاوێکی ئاوی سارد و پاك، پلە گۆشت ئەوەندە زۆرە گاڵتەو گەپی

پێ دەکەن و بە برژاوی وەك پەراوێزی ڕەفتەی بادراو، ئاوریشمی ئاو، سێبەر، پشکۆ، گۆشتی چەور، کیژی تازە پێگەیشتوو، کورێکی لاوی شارەزا لە ژیانی ناو کیژانی شۆخ و شەنگ و پاکیزە و ڕەوشت بەرزی عەرەبی بیابان کۆبێتەوە، کێ ئەتوانێ وێنەی بگرێ!؟.

وَيَـوْمَ دَخَلْـتُ الْخِـدْرَ خِـدْرَ عُنَيـزَة فَقَالَتْ: لَكَ الْوَيْلاَتُ! إنَّـكَ مُرْجِلِـي

الخدر: کەژاوە، الویلات: نزای خراپە، مُرجل: پیادەڕێ.

دەڵێ: لە ڕۆژە خۆشەکانم ئەو ڕۆژەیە کە چوومە تای کەژاوە کچە خزمی خۆم عونەیزەخان،بەلام بەناز و شۆخ و خەمزەوە وتی: بەخوا منیش پیادە ئەکەی! خوا بتگرێ وەك وشترەکەی خۆت ئەمیش لەناو ئەبەی.

تَقُـولُ وَقَـدْ مَـالَ الْغَبِـيطُ بِنَـا مَعـاً: عَقَرْتَ بَعِيرِي يَا امْـرَأَ الْقَيْـسِ فَـانْزِلِ

فَقُلْتُ لَهَـا: سِـيرِي، وَأَرْخِـي زِمَامَـهُ وَلاَ تُبْعِـدِينِي مِـنْ جَنَـاكِ الْمُعَلَّـلِ

مال: لار بوو، غبیط: کەژاوەی دووتاك، سیری: بهاژوو، ارخی: جڵەوی بۆ شل بکە، جناك: کوڵمی وەك سێوە لاسورەو شوێنی ماچ، مُعَلل: دووبارە ئاودراوەو خڕو تەڕو پڕ.

دەڵێ: بە نازو شۆخییەوە ئەیفەرموو کاتێك لاباری لای من شۆڕ بوویەوە، وشترەکەی من فەوتاو هەتیوو دەبوو، (ئیمرەئول قەیس) دابەزە!، منیش بە گرژەوە پاڕامەوە و وتم لێخوڕەو ڕەشوی وشترەکە شل

بکە، توخوا دوورم مەخەرەوە لە ماچێکی کوڵمی وەك سێوە لاسورەی تێـر ئاو!.

فَمِثْلِكِ حُبْلَى قَـدْ طَرَقْـتُ وَمُرْضِـعٍ    فَأَلْهَيْتُهَـا عَـنْ ذِي تَمَـائِمَ مُحْـوِلِ
إِذَا مَا بَكَى مِنْ خَلْفِهَـا انْصَـرَفَتْ لَـهُ    بِشِـقٍّ، وَتَحْتِـي شَـقُّهَا لَـمْ يُحَـوَّلِ

حُبلی: دووگیـان، طرقـت: چومەتە تەڵەوی، مرضـع: شـیردەر، الهیتهـا: وازم پێ لێهێناوە، ذی تمـائم: منـداڵی دوعـا لەسـەر شـان، محول: سـاڵی پـڕ نەکردووەتـەوە، خلـف: پشـتەوە، انصـرفت: لای کـردەوە، شـق: لایـەکی، لم یحول: نەیجولاند.

دەڵێ: ئەوە تۆ چی ئەفەرموی؟، واتەزانی گەمـژەو گێـل و نـەفامم، زۆر کـەس کـە دووگیـانیش بـووە، یـان منـداڵی شـیرەخۆری کـەمترە لـە سـاڵ چـوومەتە تەڵـەوی کـە ئـەم جـۆرە ژنانـە زۆر ئـارەزووی پیـاو ناکـەن و حەزیان لێ نییە، زۆریش بەتایبـەتی ژنـە منداڵوبـەر، لـەکاتی (....)، ئـەو ژنــە منالۆبــەرەی کــە منالەکــەی لــە باوەشــگرتووە، ئەگــەر منداڵەکــەی بگریایە لای سەرەوە، مەمکی لەدەمی منداڵەکە دادەنا و ژێری ئەکردەوە و بەشێکی تری لاشەی لەژێر منەوە جوڵەی نەدەکرد.

(ئەدەبی بێ پەردەی چاخی نەفامییەو زۆر بێ شەرم و ڕووقایمە، باسی ئازایەتی خۆی ئەکات، هەر بۆیە سوك و ترۆ بوو، باوکیان کوشـت و کـەس نــەبوو تۆڵـەی بـۆ بکاتـەوە، چـونکە ئـەوە کـوڕە جێنشـینەکەیە، لەگـەڵ ڕەعیەتەکەی ئاوایە هـەرگیز داوێنپیسـی لەگـەڵ سـەروەری و پێشـەوایی و ڕابەری کۆ نابێتەوە، بەڵام ئیسلام کۆتایی بەم ڕەوشتە هێنا)

وَيَوْماً عَلَى ظَهْرِ الكَثِيبِ تَعَذَّرَتْ  عَلَيَّ، وَآلَتْ حَلْفَةً لَمْ تَحَلَّلِ

كثيب: تەپۆڵكەى لم، تعذرت: دەپاڕايەوەو بڕو بيانووى هەبوو، آلت: سوێنى دەخواردو سوێنى دەدام، لم تحلل: بێ كەفارەت و بێ دەرهاوردە، حلفة: سوێنخورادن.

دەڵێ: باسى ئەو ڕۆژەت بۆ بكەم كە دۆستەكەم بردە سەر تەپۆڵكەى بەردەوارەكە و دەستم گرتبوو و ئەويش دەپاڕايەوەو بڕوبيانووى دەهێنايەوە گوايە نايەت لەگەڵ مندا و سوێندى دەخوارد و سوێندى منى دەدا و بەتەماش نەبوو كەفارەتى سوێندەكەى بدات و حەلاڵى بكات، ئەوە بەڵگەيە بۆ (عونەيزە) كە ئەم گەنجە دەسەلاتدارە و بڕو بيانوو لەكەس قەبوڵ ناكات.

أَفَاطِمُ مَهْلاً بَعْضَ هَذَا التَّدَلُّلِ  وَإِنْ كُنْتِ قَدْ أَزْمَعْتِ صَرْمِي فَأَجْمِلِي
وَإِنْ تَكُ قَدْ سَاءَتْكِ مِنِّي خَلِيقَةٌ  فَسُلِّي ثِيَابِي مِنْ ثِيَابِكِ تَنْسُلِ

مهلاً: هێواش، التدلل: خەمزە و نازى گەورە كچ، أزمعت: نيازت هەيە، صرمى: جيابوونەوەت، يان بڕين و زامداركردن، أجملى: بە جوانى و بەخۆشى و بێ توڕەبوون، ساءت: پێت خراپە، خليقة: ڕەوشت، سلى: داڕنە و جيابكەرەوە!.

بەسە، بە هێواش ئەم نازو نووكە كەمكەرەوە، من بەرگەى ئەم نازە ناگرم، ئەگەر نيازت هەيە جێم بێڵى و بمكوژى بەخەم و پەژارە، مەمكوژە بە شيرينى و خۆشى بمكوژە، خۆ ئەگەر بەلاتەوە ڕەوشتى

خراپم هەیە دەی دڵ و دەروون و بەرگی من جیا بكەرەوە لەبەرگ و دڵی خۆت، بە ئاسانی لەیەك جیا دەبینەوە.

أَغَــرَّكِ مِنِّــي أَنَّ حُبَّــكِ قَــاتِلِي ... وَأَنَّـكِ مَهْمَـا تَـأْمُرِي الْقَلْـبَ يَفْعَـلِ؟

وَمَــا ذرَفَــتْ عَيْنَــاكِ إِلاَّ لِتَضْــرِبِي ... بِسَـهْمَيْكِ فِـي أَعْشَـارِ قَلْـبٍ مُقَتَّـلِ

أغرّك: لەخشتەی بردووی، ذرفت: هەڵڕشتووە، أعشار: پارچە پارچە، مقتل: شكار و كوژراو.

دەڵێ: ئەزانم چی لەخشتەی بردوی، خۆشەویستی تۆ هۆی كوشتنی منەو تۆش هەر فەرمانێ بدەی بەسەر دڵ و ژیریی و هەستمدا، بێ فەرمانیت ناكەن و ئەنجامی دەدەن، ئەو فرمێسكە لە چاوەكانتەوە دێنە سەر كوڵمت بۆ ئەوەیە بەو دوو چاوە وەك تیر و كەوان دڵی پارچە پارچە و شكاوم كە وەك سوراحی شكاوی لێ هاتووە و كردووتە بە نیشانە، چاوە جوانەكانت خانم!.

وَبَيْضَــةِ خِــدْرٍ لاَ يُــرَامُ خِبَاؤُهَــا ... تَمَتَّعــتُ مِـنْ لَهْـوٍ بِهَـا غَيْـرَ مُعْجَـلِ

تَجَــوَزْتُ أَحَرَاســاً إِلَيْهَــا وَمَعْشَــراً ... عَلَـيَّ حِرَاصــاً لَـوْ يُسِـرُّونَ مَقْتَلِـي

بيضة خدر: كەیبانووی بنەماڵەی پارێزراو و دوور لە چاوی پیس، خباء: دەوار، تمتعت: لەگەڵیدا ڕامبواردووە، غیر معجل: بەبێ ترس و پەلەپروزە، تجاوزت: تێپەڕمكردووەو هەنگاوم ناوە، احراس: پاسەوان، معشر: چاودێر و خزم و مەحرەم و خزمەتكار، حراص: زۆریان مەبەست بوو، یسرّون: بەنهێنی لەناوم بەرن.

دەڵێ: زۆر ژنی ماڵ و كەیبانووی ناو حەرەمسەراو پارێزراو لە دەرەوە كە كەس نەیوێراوە نیازی چوونە دەوارەكەی بكات من لەگەڵیدا ڕامبواردووە و بەخۆشی لەگەڵیدا ژیاوم و زۆریش پەلەم نەكردووەو نەترساوم كە پێم بزانن و قسەی ناشیرینم پێ بڵێن، ئەو چوونەم بۆلای ئەو ژنە بە دزیەوە بووە و دوور لە چاوی دەیان پاسەوان و خەدەم و حەشەم و زۆریش حەزیان دەكرد بە نهێنی لەناوم بەرن و بمكوژن و كەس نەزانێ، بەڵام ژنە لە خۆشەویستی من هەموو تەكبیرێكی كردووە.

(ئەوە باسی ئازایەتی و چاو نەترسی خۆی ئەكات لە پێناوی ڕابواردن).

إِذَا مَا الثّرَيَّا فِي السَّمَاءِ تَعَرَّضَتْ تَعَرُّضَ أَثْنَاءِ الْوِشَاحِ الْمُفَصَّلِ
فَجِئْتُ وَقَدْ نَضَّتْ لِنَومٍ ثِيَابَهَا لَدَى السِّتْرِ إِلاَّ لِبْسَةَ الْمُتَفَضِّلِ

الثریا: كۆ و ترازوی ئاسمان، تعرضت: بكەویتە ناوەندی ئاسمان و لەسەر نەهەنگ(حوت) ببینرێ، اثناء: توك و سەری هەرشتێك، وشاح: پشتێنی كەمەرەو هەیاسەی پشتی ژن، المفصّل: دوراوەو هۆنراوەتەوە بە مت و مووروەو زێرو زیو، نضّت: دایكەندبوو، ستر: پەردە، لبسة: ئاوەڵكراسی ژێرەوە، المتفضّل: زیادە بەرگی خەوتن.

دەڵێ: كە دەچووم بۆلای دۆستەكانم لەو كاتانەدابوو كە ئەستێرەی كۆ لە ئاسمان لەناوەندی ئاسماندا بووەو بەرەو ئاوابوون چووە، واتە درەنگ بوو وەك چمك و قەدی ئەو كەمەربەند و پشتێن و هەیاسەی كە نەخش و نیگاری پێدا دەدورێ و ژن بۆ شایی و خۆشی و سەما دەیپۆشێ، ئەو دۆستەم لەخۆی كردبووەوە و بۆ پشوو و خەوتن خۆی ئامادە كردبوو كە

من دەچوومە لای، جل و كراس و كەواو پشتێن و سەرپۆش و لەشپۆشی هەموو لەخۆ كردبووەوە و لە نزیك پەردەی چیخ و دەوارەكە دایناببوو، تەنها ژێركراسی خەوتنی لەبەردابوو، بە كورتی زۆر ماندوو نەدەبووم بۆ كردنەوەی پشتێن و دووخێن و بەرگی زیادە، بەكورتی بووكی ڕازاوەی بۆ ئامادەكراوە و جەنابی دەچێتە پەردە كوللەو ماڵەكەش زۆر جەنجاڵ و قەرەباڵغ و خاوەن پاسەوانە و ترسی كوشتنی هەیە!.

فَقَالَـتْ: يَمِيـنُ اللهِ، مَالَـكَ حِيلَـةٌ، وَمَـا إِنْ أَرَى عَنْـكَ الغَوَايَـةَ تَنْجَلِـي
فَقُمْـتُ بِهَـا أَمْشِـي تَجُـرُّ وَرَاءَنَـا عَلَـى إِثْرِنَـا أَذْيَـالَ مِـرْطٍ مُرَحَّـلِ

يمين الله: سوێند بە خودا، حيلة: فێڵ، الغواية: بێ بەندوباویی، أذيال: پاڵێم و داوێنی كراس، مرط: ماكسی ئاوریشم و گوڵدار بە جۆرەها وێنە، مُرحل: شێوەی كۆچ و باری لەسەر نەخش كرابوو.

دەڵێ: كە چوومە ژوورەوە گوتی: قەسەم بە خودا، نازانم بە چ جۆرە فێڵێ وازم لێ دێنی، تۆ دەست لەم جۆرە بێ بەندوباوییە ناهێنی و دەستم لە كۆڵ ناكەیتەوە، نازانم چۆن خۆم ڕزگار بكەم لەدەستی هەوەسبازیی تر!، منیش دەستمگرت و قۆڵم كرد بە قۆڵیداو بە جلی شەوەوە، كراسە شۆڕەكەی بەدوای خۆیدا لەزەوی دەخشان بۆ ئەوەی شوێن پێمان بكوژێتەوەو پێمان نەزانن، جا كام ماكسی؟ ئەو ماكسییە كە ئاوریشمە و بە نەخش و وێنە ڕازاوە بوو، واتە دوورم خستەوە لە ئاوەدانی و بردم بۆ داوێنی گوندەكە.

فَلَمَّـا أَجَزْنَـا سَـاحَةَ الْحَـيِّ وَانْتَحَـى بِنَـا بَطْـنُ خَبْـتٍ ذِي قِفَـافٍ عَقَنْقَـلِ
هَصَـرْتُ بِفَـوْدَيْ رَأْسِـهَا فَتمايَلَـتْ عَلَـيَّ هَضِـيمَ الكَشْـحِ رَيَّـا المُخَلْخَـلِ

أجرنا: تێپەڕی، ساحة الحيّ: گۆڕەپانی گوندەکە و پارگێنەدەوارەکە، انتحی: پەنایدا، کەوتە کەنارەوە، بطن خبت: ناوسکی دۆڵ و شیوو، ذی قفاف: کە دارای کەمێ بەرزایی و ڕەقانی بوو، عقنقل: ڕەگی چاڵ و چۆڵی ناو لی نەرم و نۆڵ، وەك سەرو سمی بزنمژە، هصرت: گوشیم بە هێواشی و ناسکی، فودی الرأس: ئەولاو ئەولای زلْفی، تمایلت: لایدایەوە، هضیم الکشح: سمت و کولْك، ریّا المخلخل: ڕان و سمتی قەڵەو و تێر و گۆشتن.

دەڵێ: ئەوکاتەی کە لەدامێنی دەوارەکە چوینە دەرەوە پێکەوە چوینە ناو شیوەکەو کەوتینە پەناوەو لەسەر سکی لەوەڕگایەك لە چاڵ و چۆڵاویەکەی ناو شیوەکە هەردوو دەستمگرت بە زلْف و ڕومەتی و بۆلای خۆم ڕامکێشا و ئەویش بە ناسکیی و ئارەزووەوە سمت و سێ بەندی نەرم و چەورو قەڵەوی خستە باوەشمەوە، بەڕان و پوزی قەڵەو و ناسکەوەو هیچ لاری لە ڕابواردن نەبووە، لەمن زیاتر هەستی بەخۆشی دەکردو ترسی ئێستەو پاشەڕۆژی نەبوو.

(بەڕاستی ئەوە وێنەیەکی ئەدەبی بێ سەرپۆشەو تەنها کۆمەڵگەی نەفامیی دەتوانێ وێنەی بکێشێ، بەڵام لەم سەردەمەی جیهانگیرییەدا گەلێ وێنەی بەو شێوەیە لەسەر شاشەی تیڤی دەبینرێ و نمایش دەکرێ و لەبەر تیشك و ڕوناکیدا و لەبەرچاوی گەنج و لاوی بێ بەندوباری شارستانی ئەمڕۆ دادەنرێ).

مُهَفْهَفَــةٌ بَيْضَــاءُ غَيْــرُ مُفَضَــةٍ    تَرَائِبُهَــا مَصْــقُولَةٌ كَالسَّــجَنْجَلِ
تَصُــدُّ وَتُبْــدِي عَــنْ أَسِــيلٍ وَتَتَّقِــي    بِنَــاظِرَةٍ مِــنْ وَحْــشِ وَجْــرَةَ مُطْفِــلِ

مُهَفْهفةٌ: سووك و سۆڵ و باريك و ناسك و قەدباريك، غير مفضة: ناوك و سكی شوّڕ نەبومتەوەو دانەخزاوە، ترائب: نێوان و هەردوو مەمك و سنگ و بەرۆك، مصقولة: ساف و بێگەرد و ناسك و لووس، سجنجل: ئاوێنە، خشتی ئاڵتون، تصُدّ: ڕووی وەردەگێڕێ، تبدی: ڕووی تێدەكات، اسيل: كوڵم نەرم و نازك و لووس، تتقی: خۆی دەشارێتەوە، ناظرة: چاو، وحش: ئاسكە كێوی، مطفِل: كاری بە بەرەوەيە.

دەڵێ: ئەم شۆخە ناسك و نازدارە تەمەنی منداڵە، گەورە نييە، سووك و باريك و ناسكۆڵەيەو قەدی باريكەو وركی شوّڕ نەبووەتەوە، سنگ و جوتێ مەمكی ناسك و پتەو و ترتی هەيە، پاك كراوەتەوە لە گەردو تۆز و ساف و لووسە، وەك ئاوێنە، يان خشتی زێڕ و زيو، زۆر بە ناز و عيشوە و مەكرەوە جارێك ڕووم لێ وەردەگێڕێ و جارێك ڕووم تێئەكات، بە چاوێكی پڕ لە غەمزەوە، وەك چاوی كارمامزی دەشتی وەجرە و جەيرانی ناو واحەو تەپۆلكەكانی هەوارگەكە، كە بەجوانی بۆ پاشەوەی تەماشاكارە مامزەكەی دەكات.

(ئەوە تەنها لە دورگەی عەرەبدا كيژی چاوڕەش و نەرم و ناسك و پڕ لە غەمزە و نازی تێدايە، واتە عيشق و خۆشەويستی بە شيرەوە خواردەوەو زۆريش ئاساييە).

وَجِيدٍ كَجِيدِ الرِّئْمِ لَيسَ بِفَاحِشٍ إذَا هِيَ نَصَّتْهُ وَلاَ بِمُعَطَّلِ
وَفَرْعٍ يَزِينُ المَتْنَ أسْوَدَ فَاحِمٍ أثِيثٍ كَقِنْوِ النَّخْلَةِ المُتَعَثْكِلِ

جيد: گەردەن و مل، رئم: ئاسکی سپی، نصّته: بەرزیکاتەوە، مُعطل: بێ ملوانکە و بێ گەردانە، فرع: پەلکەی ژنانەی دواوە، متن: ناوشان و پشت، فاحم: ڕەش وەك ڕەژوو و خەڵوز، أثیث: چڕ و پڕ و لەیەك هەڵپێکراو، قِنو: هێشووی خورمای زەردی پێگەیشتوو، مُتعثکِل: چووە بەناو یەکدا و شۆڕبووەتەوە.

دەڵێ: ئەم شۆخەی کە هێناومە بۆ ژوان، گەردن و ملێکی پێوەیە وەك گەردن و ملی ئاسکی سپی جوان و ناسکە، نە درێژە و نە کورتە و نە بێ ملوانکەی خشڵ و ملەپڕەیە و پەلکەی پشتەوەی ناوشان و سەرشان و پشتی نەخشاندووە، بەڵام کام پەلکە؟ ڕەشی قەترانی وەك خەڵوز هۆنراو و پڕ و چڕە وەك هێشوی گەیشتووی خورما شۆڕبووەتەوە.

غَدَائِرُهُ مُسْتَشْزِرَاتٌ إلَى العُلاَ تَضِلُّ الْعِقَاصُ فِي مُثَنًّى وَمُرْسَلِ

غدائر: قژی هۆنراوە، مستشزرات: کۆکراوەتەوە بۆ سەرەوە لەبەر جوانی وەك تاجی پادشایی لێ هاتووە، تضِلّ: ونەبێ، عقاص: ئەو بەشە پرچەخاوەی ژێرەوە، پەلکەکان، مثنی: نوشتاوەتەوە، مرسل: بەرەڵاکراوە.

دەڵێ: قژی زۆر جوانەو کردویەتی بە سێ بەشەوە، درێژییەکەی کردووە بە پەلکە و کورتە خاوەکەیشی کردووە بە دۆشەك، بە کلکەکەی

تێدا گرێ داوەو هەموویان جێگەیان بووەتەوە لەناو زوڵف و پەرچەمی خاوی نووشتاوەو شۆڕکراوە.

(ئێستە ئەم تەسریحە لەناو کچە گۆرانی بێژەکانی عەرەبدا بووەتە باو، دروست نییە دەنا وێنەیم دەگرت).

وَكَشْحٍ لَطِيفٍ كَالجَدِيلِ مُخَصَّرٍ    وَسَاقٍ كَأُنْبُوبِ السَّقِيِّ الْمُذَلَّلِ

وکَشح: ناوقەد و کەلەکە، لطیف: ناسك و باریك و بەئاسانی لەباوەش دەگیرێ، جدیل: قەمچی لە پێستی ناسك دروستکراو، مُخصَر: باریك، ساق: پوز و پالێم، خوار ئەژنۆ، أنبوب: خەڵف، لق، السَقیّ: تێر ئاو، المُذلل: بەردەست بۆ بەر سێبەر.

دەڵێ: قەدی باریك و جوان و بەنەزاکەت و بنەو قەمچی شۆڕەسواری نەجیب، لە پێستی ناسك و درووستکرابوو، شۆخ و شەنگ و بێ گرێ و خۆشدەست و لاق و پوزی لووس و نەرم، وەك خەڵفی شۆڕە خورمای تێر ئاو، یان وەك شمشاڵی نزیك ڕوباری سارد و شیرین لە جوانیدا.

وَيُضْحِي فَتِيتُ المِسْكِ فَوْقَ فِرَاشِهَا    نَؤُومُ الضُّحى لَمْ تَنْتَطِقْ عَنْ تَفَضُّلِ
وَتَعْطُو بِرَخْصٍ غَيْرِ شَثْنٍ كَأَنَّهُ    أَسَارِيعُ ظَبْيٍ أَوْ مَسَاوِيكُ إِسْحِلِ

یُضحي: پاش خۆر هەڵهاتن و چێشتەنگان، فتیت: هاڕاوەی میسك، نؤوم: درەنگ، ئاخێزی جێگەی خەوتن، لم تنتطق: بێ پشتێن، تفضل: لەبەر ناز و نیعمەتی و کارەکەر نییە، تعطو: دەست و پەنجەی بۆ شت دەبا، رَخص: پەنجە باریك و سپی و نەرم، شَثن: زبر، اساریع: کرمی ناو

لى شێدار، مساويك: شێوان، إسحِل: داری خەنە، يان هەر دارێك كە خەڵفی ناسك بێ.

دەڵێ: ئەم كیژە بەنازپەروەر و سەرومنازە كە چێشتەنگاو لە خەو هەڵئەسێ، بۆنی جێگەكەی وەك میسكی هاڕاوی پێدا كرابێ بۆنی خۆشە و درەنگ لەخەو هەڵئەستێ و پشتێن نابەستێ، چونكە كاری ئەو ئیشكردن نییە، هەر ئەو كەنیشكە نازدارە دەست و پەنجە باریك و ناسك و نەرم و بەدەرەوە لە زبریی و ڕەقیی، وەك ئەو كرمە وایە كە لەناو لى شێداردا دەژی كە لووس و ناسك و پاكە، لەو شێوەی كە ناوی (ظبی)یە، (لەوانەیە ئەبو زەبی ئەمرۆبێ)، یان وەك خەڵفی وەك سیواكی داری خەنە لە نەرمی و ناسكی و شل و شۆخیدا.

(فەقیر!، ئێستە لەو شوێنەدا كە تۆ لەگەڵ ئەو كەنیشكەدا ژیاوی كیژۆڵەی لەوە جوانتری لێیە!).

تُضَـيءُ الظَّـلاَمَ بِالعِشَـاءَ كَأَنَّهَـا — مَنَـارَةُ مُمْسَـى رَاهِـبٍ مُتَبَتِّـلِ
إِلَـى مِثْلِهَـا يَرْنُـو الحَلِـيمُ صَـبَابَةً — إِذَا ما اسْبَكَرَّتْ بَيْنَ دِرْعٍ وَمِجْـوَلَ
كَبِكْـرِ الْمُقَانَـاةِ البَـيَضُ بِصُـفْرَةٍ — غَـذَاهَا نَمِـيرُ الْمَـاءِ غَيْـرَ مُحَلَّـلِ

منارة: تیشكی چرا، ممسی: شەو، راهب: ڕەبەند، متبتِل: كەنارەگیر بۆ بەندایەتیی، یرنو: بەدیقەت تەماشای دەكات، صبابة: مەیل و شەوق، اسبكرت: درێژ دەبێتەوە، درع: كراس، دەرەدامان، ماكسی، مجول: ژێركراسی، بكر: هێلكەی نۆبەرە، المقاناة: تێكەڵ، نمیر الماء: ئاوی بێگەرد، غیر مُحلل: زۆری بەسەر نەهاتبێ.

دەڵێ: لەش و هەموو بەدەنی، شەو ڕوناكی دەداتە دەوروبەری، وەك مەنارەی ڕەبەندی شەو بێدارە، كە بەندایەتی خودا دەكات و چرای داناوە بۆ ڕێنومایی ڕێبوار، ئەو شۆخە لەوانەیە كە پیاوی زانا و خۆگر و خۆپارێز دڵی بۆی دەڕوانێ، ئەوكاتە كە خۆی درێژ دەكات لەسەر جێگەی خەوتن بە كراسی درێژ و ئەوەڵكراسی كورتەوە دەچوێنرێ بە هێلكەی نۆبەرەی نەعامە، كە سپی و زەردی دڵڕفێنە، بەڵام لەشی ئەم نازدارە شۆراوە بە ئاوی پاكی ساردی بێگەرد، كە زۆر هامشۆی لەسەر نەبێ، یان ئەوەتا لەشی چواندووە بە مرواری تازە لە ئاو دەرهاتووی ناو سەدەف و هێشتا كوننەكراو، لە ڕەنگ و نرخ و جوانیدا بێ وێنەیە!.

تَسَلَّت عَمَايَاتُ الرِّجَال عَنِ الصِّبا وَلَيْسَ فُؤَادِي عَنْ هَوَاهُ بِمُنْسَلِ
أَلاَ رُبَّ خَصْمٍ فِيكِ أَلْوَى رَدَدْتُهُ نَصِيحٌ عَلَى تَعْذَالِهِ غَيْرُ مُؤْتَلِ

تسلت: وازی هێناوە لە خەم و پەژارە، عمایات: هەرزەیی و نەفامیی و جەحێڵیی، صبا: ڕابواردن، مُنسل: وازهێنان و دەستبەرداری، خصم: دوژمن، ألوی: ڕقئەستور، تعذال: سەرزەنشت، مؤتل: زۆر توند لە ئامۆژگاریدا.

دەڵێ: خەڵك و پیاوێ كە دەستبەرداری هەرزەیی و نەفامیی بوون و سەبووریی خۆیان داوەتە دڵداری و عیشقبازی، بەڵام دڵی لە خۆشەویستی ئەو شۆخە هەرگیز ژیر نابێتەوە و گوێ نادات بە ڕەخنەو ئامۆژگاری، زۆرنەیار و دوژمن سەرزەنشتی من دەكەن و زۆریش توونـدن لە گلەیی و گازندەو ئامۆژگاری، بەڵام من بە قسەیان ناكەم و داوەمەتە دواوە.

وَلَيْـلٍ كَمَـوْجِ الْبَحْـرِ مُـرْخٍ سُـدُولَهُ    عَلَـيَّ بِـأَنْوَاعِ الْهُمُـومِ لِيَبْتَلِـي
فَقُلْـتُ لَـهُ لَمَّـا تَمَطَّـى بِصُـلْبِهِ    وَأَرْدَفَ أَعْجَـازاً وَنَـاءَ بِكَلْكَـلِ:
ألاَ أَيُّهَـا اللَّيْـلُ الطَّوِيـلُ أَلاَ انْجَلِـي    بِصُـبْحٍ، وَمَـا الإِصْبَاحُ فِيـكَ بِأَمْثَـلِ

موج: شەپۆل، مُرخ: پەردەی ڕەشی داداوەتەوە، سدول: پەردە، يبتلی: تاقی دەکاتەوە، تمطی: درێژبووەو باڵی ڕاکێشاوە، صُلب: پشت، أردف: لە پاشکۆی داناوە، اعجاز: پشتەوەی هەر شتێ، ناء: گەڕاوەتەوە، کلکل: سنگ و پێشەوە، انجلی: ڕوناکیکەرەوە، إصباح: ڕۆژ بوونەوە.

دەڵێ: لەپێناوی ژوانی ئەم کیژەو کیژانی دیکەدا زۆر تووشی دەردەسەریی و ماندووبوون بووم، زۆر شەوی تاریك وەك شەپۆلی دەریاو ڕەشایی بەهەموو پەردەکانییەوە بەسەرما دادراوەتەوە، تەنها بۆ ئەوەی تاقیم بکاتەوە، بزانێ خۆڕاگرم، منیش لەوەڵامدا پێم وتووە لەکاتێکدا بەهەموو توانای شەوی تاریك پشتی لەسەرم داناوەو بەهەموو توانای خۆیداوە بەسەرمدا و سنگی لەسەرم داناوە، واتە سەرەتای شەو و ناوەڕاستی و ئاخر و ئۆخری هەر تاریکبووە، لەوەڵامدا گوتم: شەوگاری درێژ کەمێ لەسەرم خۆت لابدەو وامەزانە ڕۆژەکەت بۆمن باشترە، نەخێر شەوی تاریك و ڕۆژی ڕوناك بۆمن وەك یەکە، چەندە توانات هەیە تاریکبە، چونکە ڕۆژم ڕۆشن نییە!.

فَيَـا لَـكَ مِـنْ لَيْـلٍ كَـأَنَّ نُجُومَـهُ    بِكُـلِّ مُغَـارِ الْفَتْـلِ شُـدَّتْ بِيَـذْبُلِ
كَـأَنَّ الثُّرَيَّـا عُلِّقَـتْ فِـي مَصَـامِهَا    بِـأَمْرَاسِ كَتَّـانٍ إِلَى صُـمِّ جَنْـدَلِ

مُغار: توند شەتەكدراو، الفتل: بادان و ڕێستراو، يذبُل: ناوى شاخێكە لە نەجد، الثريا: كۆ و تەرازوو، علقت: هەڵواسراو، مصام: شوێن، وەستان، أمراس: گوريس و پەت، كتان: كەتان، صُمّ: ڕەق، جتدَل: تاش و بەردى گەورە.

دەڵێ: كام شەو؟ ئەو شەوەى كە سەرم سوڕمابوو لە درێژيى و نەڕۆيشتنى كە ئەستێرەكانى ئاسمانى وەك وڵاخ بە گوريسى مەحكەم و پتەو و بادراوى كەتان بەسترابوونەوە بە چياى (يەزبول) كە شاخێكە لە نەجدى حيجاز، وەكو وتراويشە لە شوێنى خۆيان هەڵواسرابوون بە پەتى هۆنراوەى كەتان، بەتاشە بەردى گەورەوە.

(مەبەستى ئەوەيە ئەو شەوە جوڵەى نەبوو لە جێگەى خۆيدا).

وَقِرْبَــةِ أَقْــوَامٍ جَعَلْــتُ عِصَــامَهَا    عَلَــى كَاهِــلٍ مِنِّــي ذَلُــولٍ مُرَحَّــلِ

قربة: كونەى ئاو، عصام: پەتى بەستنى دەمى كونە، كاهل: ناوشان، ذلول: فێر و ڕاهاتووە لەسەر كاركردن، مرحل: كاروانچيى.

دەڵێ: زۆر جار دەچووم بۆ ئاوهێنان بۆ هاوڕێكانم و كونەم دەدا بەسەرشانى فێرە ئيشكردومداو دەمى كونەكەم بەدەست دەبەست بۆ ئەوەى ئاوەكە دابەش بكەم بەسەرە بەسەرياندا.

وَوَادٍ كَجَــوْفِ الْعَيْــرِ قَفْــرٍ قَطَعْتُــهُ    بِــهِ الــذِّئْبُ يَعْــوِي كَــالخَلِيعِ الْمُعَيَّــلِ

وادى: شيوودۆڵ، جوف: ناوسك، العير: وشتر، قفر: چۆڵ، يعوى: ئەيلوران، خليع: سەرسەرى و بێ بەندوباو، المعيل: كڵفەتدار، خێزاندار.

دەڵێ: زۆر شیوودۆڵم بڕیوە و تێیدا سەفەرمکردووە، چۆڵ و هۆڵ وەك ناوسکی وشتر پێچاوپێچ و پڕ لە شتی پیس کە لەو شیوەدا گورگ ئەیلوراند، وەك کابرای قومارچیی و دۆڕاوی ماڵ و منداڵ زۆر و لەبێ نان و ئاوی و دۆڕاندنی سامانی، ئەیلوران و هاوار هاواری بوو.

فَقُلْتُ لَهُ لَمّا عَوَى: إنَّ شَأْنَنَا قَلِيلُ الغِنَى إنْ كُنْتَ لَمّا تَمَوَّلِ
كِلانَا إذَا مَا نَالَ شَيْئاً أَفَاتَهُ وَمَنْ يَحْتَرِثْ حَرْثِي وَحَرْثَكَ يُهْزَلِ

عوى: لورانی، لماتمول: خاوەن سامان نەبووی، أفاتە: لەناوی دەبات، یحترث: بەشوێنیدا بگەڕێ، یهزل: لەڕولاواز دەبێ.

دەڵێ: لەوکاتەی گورگەبۆر لە شیوەکە دەیلوراند و برسی و تینوو بوو، منیش پێمگووت: کاری من و تۆ ئەوەیە بێ سامان و بێ دەسکەوتین، تۆش وەك من هێشتا نەبووی بە خاوەنی ماڵ و سامان و هەردوولامان ئەگەر شتێکی دەستکەوت زۆر زوو لەناوی دەبات و ئەم و ئەو سوودی لێ وەردەگرن، هەرکەس وەك من و تۆ کاسبی بکات و دەستبڵاوبێ لەڕولاوازە.

وَقَدْ أَغْتَدِي وَالطَّيْرُ فِي وُكُنَاتِهَا بِمُنْجَرِدٍ قَيْدِ الأوَابِدِ هَيْكَلِ
مِكَرٍّ مِفَرّ مُقْبِلٍ مُدْبِرٍ مَعاً كَجُلْمُودِ صَخْرٍ حَطَّهُ السَّيْلُ مِنْ عَلِ

أغتدی: شەبەقی دەردەچم، وکنات: کون، هێلانە، درزی ناوشاخ، مُنجرد: ئەسپی کەمتووك و یاڵ، قید: زنجیر، الأوابد: حەیوانی کێوییی ناو جەنگەڵ، هیکل: گەورەو زل، مکر: ڕاکەر بۆ پێشەوە، مفر: ڕاکەر بۆ

دواوە، مقبل: بەرو پێش، مدبر: بۆ دواوە، جلمود: تاشەبەردى زۆر گەورەى ڕەق، حطه: خلۆركرابێتەوە، السيل: لافاوى زۆر، عل: لەبەرزايى.

دەڵێ: بەيانى زۆر زوو لەگەڵ گزنگى ڕۆژ، من دەردەچم بۆ ڕاو و شكار، باڵندە هێشتا لە كون و هێلانەكانى دەرنەچووە، ئەسپێك لەژێرمايە، ئەوەندە شكارم پێكردووە تووك و ياڵى وەريوەو زۆر ئازايە لە ڕاكردن، كۆت و زنجير لەپێى حەيوانى كێوى دەكات و زۆر پەيكەرى گەورەيە لەڕاكردن و گەڕانەوەو بۆ پێشەوەو بۆ پاشەوە، وەك بەرداشى زۆر گەورە كە لافاو بۆ خوارەوەى خلكردبێتەوە، تەنها نێچيرێك لەدەستى دەرناچێ، بەو بەيانييە زووە.

(مەبەستى ئەوەيە بەو ئەسپە زۆر تيژڕەوە وەك ئەو بەردە گەورەيە كە لە سەرەوە لافاو بۆ خوارەوەى خلكردووەتەوە وايە).

كُمَيْتٍ يَزِلُّ اللِّبْدُ عَنْ حَالِ مَتْنِهِ ... كَمَا زَلَّتِ الصَّفْوَاءُ بِالْمُتَنَزِّلِ
عَلَى الذَّبْلِ جَيَّاشٍ كَأَنَّ اهْتِزَامَهُ ... إِذَا جَاشَ فِيهِ حَمْيُهُ غَلْيُ مِرْجَلِ
مِسَحٍّ إِذَا مَا السَّابِحَاتُ عَلَى الوَنَى ... أَثَرْنَ الغُبَارَ بَالكَدِيدِ المُرَكَّلِ

كميت: ئەسپى كوێتى چوارپەل چەرمك، يزلّ: ئەخزێ، اللبد: لەباد، ژێر زين، حال متنه: شوێن زين و جل و كۆپان، الصفواء: تاشەبەردى ساف و ڕەق، المتنزل: باڵندە كە دەنيشێتەوە، الذبل: سكى خاڵى و ماندووبوون، جياش: قوڵە قوڵەى كولاف، إهتزامه: پژمەى ئەسپ، حميه: كوڵان، مرجل: قازان و تيانچەى سەر ئاگر، مسح: غار و وێڵغە، السابحات: ئەسپەكانى

گۆڕەپانی غارغارێن، الونی: بەهێواشی، الكديد: زەوی ڕەقان، المركل: شوێن سمکۆڵانی ئەسپ و ماین.

دەڵێ: ئەم ئەسپە زۆر دەگمەنە، ئەسپێکی کوێتییە، چوارپەل سپییە، قەڵەوە، گۆشتنە، ژێر زین بەسەر پشتییەوە ناوەستێ لەبەر لووسیی و دەخزێ و لەسەر پشتی ناوەستێ، وەك باڵندە دەخزێ لەسەر بەردی ساف و ڕەق و خۆی ناگرێ، لەگەڵ برسییەتی و سکخاڵێدا قرمەی سکی دێ و دەنگی پرمەی لەکاتی غارکردنی وەك قوڵە قوڵی قازانی بەکوڵ بەرز دەبێتەوە، سمکوڵانی لەسەر زەوی ڕەق و تەق کاتێ لە گۆڕەپانی ڕمبازیی و ئەسپسواریی دادەنا، ئەدات لەبەردی ڕەق و تۆز بەرز دەکاتەوە، لەبەر بەهێزیی و توانایی و چالاکیی و ماندوونەبوونی.

يَـزِلُّ الغُـلاَمُ الخِـفُّ عَـنْ صَـهَوَاتِهِ وَيُلْـوِي بِـأَثْوَابِ العَنِيـفِ المُثَقَّـلِ
دِرِيـرٍ كَخُـذْرُوفِ الوَلِيـدِ أَمَـرَّهُ تَتَـابُعُ كَفَّيْـهِ بِخَـيْطٍ مُوَصَّـلِ

يزل: ئەخزێ، الخف: سووك و منداڵڕەنگ، صهوات: سەری زینەکەی، يلوی: پێچی ئەدات و سوڕی دەدات، العنيف: تیژپەڕ و کۆڵەسوار، المثقل: قورس، درير: سوڕ دەخوات بەدەوری خۆیدا، خذروف: مزراح، امره: توونـد بادراو.

دەڵێ: ئەم ئەسپەی من کە شکاری پێ دەکەم هەرزەکاری تازەسوار ناتوانێ خۆی لەسەری ڕابگرێ و دەخزێ و ئەکەوێتە خوارەوە لەسەر زینەکەی و ئەو کەسەی کە تورەیەو ئازاری ولاخ دەدات خۆی ناگرێ لەسەری و ناتوانێ خۆی کۆبکاتەوەو هەڵئەتۆرێنێ و دەیخاتە خوارەوە،

دەبێ ئەوەی سواری دەبێ بە ئەزموون بێ لەڕامیاریی ولاخدا، چونکە دەسوڕێتەوە و دەخولێتەوە، هەروەك مزراحی دەستی منداڵ کە بەندی دەزووی بادراوە بەدەوری مزراحەکەدا پێچیدەدا و دەیخولێنێتەوە.

(دیارە یاری مزراحێن لەو زەمانەدا هەبووە، ئەسپەکانی یانەی کێبەرکێ سواری بەشێکی ولاتانی کەنداوی عەرەبی بە نەژاد دەچنەوە سەر ئەسپی ئیمرەئولقەیس!).

لَـهُ أَيْطَـلاَ ظَبْـيٍ، وَسَـاقَا نَعَامَـةٍ، وَإِرْخَـاءُ سِـرْحَانٍ، وَتَقْرِيـبُ تَتْفُـلِ
ضَـلِيعٍ إِذَا اسْـتَدْبَرْتَهُ سَـدَّ فَرْجَـهُ بِضَـافٍ فُوَيـقَ الأَرْضِ لَـيْسَ بِـأَعْزَلِ
كَـأَنَّ سَـرَاتَهُ لَـدَى الْبَيْـتِ قَائِمـاً مَـدَاكُ عَـرُوسٍ أَوْ صَـلاَيَةُ حَنْظَـلِ

أيطلا: کەلەکەی ئاسك و بنباڵی، ساقا: هەردوو ڕانی نەعامە، ارخاء: قونەی گورگ، تقریب: نزیککردنەوەی هەردوو قاچ لە هەردوو دەست کاتی ڕاکردن، ضلیع: هەردوو گوپی قەڵەو و گۆشتنە، فرج: ناوڕانی کە زاوزێی تێدایە، ضاف: کلکی درێژ، اعزل: لارووێر، سراة: پشت، مداك: هێلەساوەی ماڵ سواقدان، یان دەساڕی ساوەر هاڕین، صلایة: بریسکەی ڕەنگی گوژاڵکە گەیشتوو.

دەڵێ: ئەم ئەسپە هەموو سیفەتی ئەسپی ڕەسەنی هەیە، بە نموونە: هەردوو بنباڵی و لاتەنگەی هەردوو دەستی، وەك بنباڵی ئاسك ناسکە و هەردوو قاچی دواوەی وەك لاقی وشترمر ڕەق و درێژ و پتەوە لە قونەکردندا، ئەڵێی گورگە لەبەکارهێنانی هەردوو دەست و هەردوو قاچیدا، لەڕاکردندا وەك ڕێوییە، بنهەنگڵی ئاسك ساف و بێ گرێیە، قاچی

نەعامــە ڕەق و درێــژە، بــە هێــزە، قونــەی وەك گورگــە و بــەكارهێنانی هەردوو قاچ و هەردوو دەست تەنها لە ڕێویدا جوانە، دەم و گپ و كولمی پڕەو لەڕو لاوازو قوپاو نییە كە پشتت تێ دەكات، كلكی ئەسپەكەیان ڕێك و درێـژە هـەتا زەوی و نزیـك و لارو وێـر نییـە، پاشـەوەو ئـامێری زاوزێـی شـاردراوەتەوە، پشـتی كـاتێ زینـی لەسـەر پشـت لادەبـرێ سـاف و لووسـە، ئەڵێی ئەو بەردە هێلەساوەیە كە سملّ و مێخەكی بـووكی لەسـەر دەهاڕن، یان لە بریسكەو جـوانی ئـەو گوژاڵەیـە كـە لەناو ئـاو دانـراوە، بـۆ ئـەوەی تاڵییەكــەی بــڕوا، ئەوكاتــە ڕەنگێكــی زەردی زۆر جــوانی هەیــە، وەك ئەسپەكەی شاعیرە.

كَـــأَنَّ دِمَـــاءَ الهَادِيَـــاتِ بِنَحْـــرِهِ     عُصَـــارَةُ حِنَّـــاءٍ بِشَـــيْبٍ مُرَجَّـــلِ

الهادیات: ئەو حەیوانە كێوییەی كـە هەمیشـە ڕێنیشـاندەرە بـۆ جڵـەوی هەمووان، نحـر: سـەر سـنگ و بـەرەكی ماینەكـە، عصـارة حنـاء: پاشمـاوەی خەنەی گیراوەو بەكارهاتوو، شیب مرجل: مووی سپی شانەكراو.

دەڵـێ: ئـەم ماینـەی مــن یەكـەم سـوارە كـە دەگاتــە سـەر مــەڕ و بزنەكێویـەكان و بەتایبـەتی سـەرقافڵەكەیان و ڕابەرەكـەیان كـە ئـەویش شـكاركرا، دوو شـوانەكە باشـتر دەسـتگیر دەكرێ و خـوێنی ئـەو حەیوانـە پـێش قەرەوڵـە بـە سـنگ و بـەرەكی ئەسـپەكەوە وشـك بوومەتـەوە، ئـەڵێی پەڵـەی خەنەیـە بـە مـووی سـپی شـۆراو و شـانەكراو، چـونكە ئارەقـەی ئەسپەكە خوێنەكەی شۆردووەتەوە.

فَعَنَّ لَنَا سِرْبٌ كَأَنَّ نِعَاجَهُ  عَذارَى دَوَارٍ فِي مُلاَءٍ مُذَيَّلِ
فَأَدْبَرْنَ كَالْجِزْعِ المُفَصَّلِ بَيْنَهُ  بِجِيدِ مُعِمٍّ فِي العَشِيرَةِ مُخْوِلِ
فَأَلْحَقَهُ بِالهَادِيَاتِ وَدُونَه  جَوَاجِرُهَا فِي صَرَّةٍ لَمْ تَزَيَّلِ

عـنّ: برپانـدەداو دەكەوێتـە ناوەڕاسـتیانەوە، سـرب: ڕانەمـەڕ، نعـاج: مەڕەكان، دوار: بتی پیرۆز، ملاء: عەباو سەرپۆش، مذیل: داوێندار، أدبـرن: پشت ئەكەنەوە، جزع: مووررووی هۆنـراوە لە ملەوەندا كە ڕەش و سپی بێ، معمّ: مامدار، مخول: خاڵدار، جواجر: دووا بەرخ و كارەكان، صـرّة: شاڵینە یان بوخچە، تزیلّ: لەیەك نەتراز بوو.

دەڵـێ: كـە بـەم ئەسـپەوە دەچـم بـۆ شـكارو ڕاوی حەیوانـەكێویی و گاكێویی توشم دەبێ بە ڕانێك لەو حەیوانە جوانانە، كـاوڕ و گێـسكە تـازە پێگەیشتووەكانی ئەڵێی كچە عازەبی تازە و ناسكۆڵەیە و لـە دەوری بتێـك دوعاو نزا ئەكات و بەرگی ئاودامانی لەبەرەو پەراوێزەكـەی بـە ئاوریشـمی ڕەش نـەخشكراوە، واتە دەچنەوە بە ناو یەكداو بەدەوری پێشـڕەوەكەیاندا دەسوڕێنەوە، وەك داوای دوعاو نزاو پاڕانەوە بكەن، ئەوجا ئەو ڕانەمەڕەی حەیوانـە كێویـە كـە پشـت دەكەنـە مـن و سـەرئەكەن بـە یەكـدا وەك ملەوەندی مـووروی هـۆنراوە لەگـەردنی منـداڵێكی ڕەسـەنی نـاو هـۆز، كـە خاوەن مـام و خـاڵێكی زۆر بـێ و نـازدار بـێ، كـام مـووروو جوانـە لـە ملـی ئەكەن، ئا لەوكاتەدا ئەسـپەكەم دەكەوێتـە ناویانـەوەو لـە پێشـڕەوەكانەوە دەست پێ ئەكات و پاشماوەكان وەك بوخچەیەكی نـەكراوە لـەدەوری یـەك

کۆبوونەتەوە، چونکە سەرکردەیان نەماوە و بێ سەرن و نەتەوەو ماڵی ئەم سوارە چالاکەیە.

فَعَادَى عِدَاءً بَيْنَ ثَوْرٍ وَنَعْجَةٍ    دِرَاكاً، وَلَمْ يَنْضَحْ بِمَاءٍ فَيُغْسَلِ
فَظَلَّ طُهَاةُ اللَّحْمِ مِنْ بَيْنِ مُنْضِجٍ    صَفِيفَ شِوَاءٍ أَوْ قَدِيرٍ مُعَجَّلِ

عادا: ئەسپ ڕائەکات بەدوای، ثور: بەران، نعجة: مەڕ، دراکا: بەهەموویاندا دەگات و فریا ئەکەوێ بۆ ڕاوکردنیان، ینضح: ئارەقە ناکات و ماندوو نابێ، طهاة: چێشتکەرەکان، صفیف شواء: شیشی کەباب لەسەر پشکۆ، قدیر معجل: قازانی زووپەز.

دەڵێ: ئەسپەشێ ئەکەوێتە ناویان لەسەر گەورەکانەوە شکار ئەکات و لەبەران و نێرەکانەوە دەست پێ ئەکات بۆ مەڕو بزنەکێوییەکان و بەهەموویان ڕادەگات و ئارەق ناکات، هەتا پێویستی بە شۆردن بێت و ماندوو نابێ، ئەوجا ئاشپەز و چێشتلێنەرەکان ئەکەونە ئامادەکردنی گۆشتی کەڵ، هەندێ بە شیشی برژاوی سەر پشکۆ و هەندێ بە تیانچەی زوو ڕەس و زووپەز خواردن ئامادە دەکەن.

(دەك بەزەهری ماری بێ کە ئەوەندە دڵڕەقە بەرامبەر بەو گیاندارە جوانانە، وەك ئەو ڕاوچیانەی ئێستای کوردستان کە حەیوانە کێوی و پۆڕ و کەوایان لە ناو بردووە!).

وَرُحْنَا يَكَادُ الطَّرْفُ يَقْصُرُ دُونَهُ    مَتَى مَا تَرَقَّ الْعَيْنُ فِيهِ تَسَهَّلِ

دەڵێ: کە دەرۆشتین و بەسواری ئەم ماینە تەواو وەسفە، هەرگیز چاوی لێ تێر نەدەبوو، ئاوی چاوی دەبرد، وەك چۆن تەماشای تیشکی بەهێز چاو ماندوو دەکات وَ کول ئەبێ، ئەمیش وا هەر کات تەماشای سەرەوەی دەکرد دەگەڕایەوە بۆ خوارەوە لەبەر جوانی و شۆخی ماینەکە.

فَبَــاتَ عَلَيْــهِ سَــرْجُهُ وَلِجَامُــهُ    وَبَــاتَ بِعَيْنِــي قَائِمــاً غَيْــرَ مُرْسَــلِ

دەڵێ: ئەم ئەسپە ڕەسەنە کە دەگەڕامەوە لەم ڕاو و شکار و نێچیرگرتنە ماندوویەتی پێوە دیار نەبوو، زین و لەغاو و ڕەشوەی لە پشت و دەم و سەرشانی بوو، لەسەر چوار پەل ڕائەوەستا و لەبەر چاوی خۆم هەولی بەرەڵاکردنی نەئەدا و ئامادەبوو بۆ جەولەی شەوڕاو، ئەوە نیشانەی ئەوەیە کەمخۆر و نەجیب و ئەصڵ و فەصڵداربووە.

أَصَـاحِ تَـرَى بَرْقـاً أُرِيـكَ وَمِيضَـهُ    كَلَمْـعِ اليَـدَيْنِ فِـي حَبِـيّ مُكَلَّـلِ
يُضِـيءُ سَـنَاهُ أَوْ مَصَـابِيحُ رَاهِـبٍ    أَهَـانَ السَّـلِيطَ بِالـذُّبَالِ المُفَتَّـلِ
قَعَـدتُ لَـه وَصُـحْبَتِي بَـيْنَ ضَـارِجٍ    وَبَـيْنَ الْعُـذَيْبِ، بُعْـدَ مَـا مُتَـأَمَّلِي

صاح: ڕەفیق و هاوڕێ، برق: بروسکەی هەور، أریك: نیشانت دراوە، میض: تیشکەکەی وەك سەرەبزوت، لمع: ڕەنگدانەوە، حبیّ: هەوری بارانـاویی بەرز، مکلل: تاجەگوڵینە، سناه: ڕوناکی، السّلیط: ڕوونی ناو چرای قەشە، الذبال: فتیلە، المفتل: بادراو و هۆنراوە، بُعد: ڕەهەند.

دەڵێ: ئەوە باسی ڕاو و شکار و سوارچاکی، ئەوجا باسی ڕۆژانی باران و تۆف و هەورە بزیسکە و هەورە تریشقە دەکات و دەڵێ: هاوڕێ گیان چاوت

لێ بوو کە بروسکەو چەخماخەی هەورەکە تیشکی چاوی کوێر ئەکرد، وەك دەستڕاوەشاندنی هەورەچڕ و تورەکە، تاجەگوڵینە کەوانەی دابوو، دنیای ڕۆشن ئەکردەوەو هەردوولای هەورەکە ماندوو نەدەبوون، یان وەك چرای ئەو ڕەبەندە کە زۆر مەبەستی نییە پلیتەی چراکەی ڕۆن سەرف بکات و شەوی تاریك ڕووناك بکاتەوە و ترس و سام لە دڵی ڕێبوار لابدات، بەڵام من زۆر لام ئاسایی بوو دانیشتم لە نێوان شاخی زارج و عوزەیبدا بە ڕەهەندی بیرکردنەوەوە سەرنجم ئەدایە ئەو دیمەنە سامناکە کە لەدورگەی عەرەب بێ وێنەیە.

عَلاَ قَطَنـاً– بِالشَّيْمِ– أَيْمَـنُ صَـوْبِهِ وَأَيْسَـرُهُ عَلَـى السِّـتَارِ فَيَـذْبُلِ
فأَضْحَى يَسُـحُّ الْمَـاءَ حَـوْلَ كُتَيْفَـةٍ يَكُـبُّ عَلَـى الأَذْقَـانِ دَوْحَ الكَنَهْبَـلِ

علا: سەردەکەوێ بۆ سەرەوە، ایمن: لای ڕاست، الشیم: تەماشاکردنی بروسکەی هەور، صوب: بارانی بەخوڕ، أضحى: لەبنەڕۆژ، یسح: دادەبارێ و دەڕژێنێ، یکب: وەك دەمی کونە دەڕێژرێ، الأذقان: دەم و چەناگە، الدوح: داری گەورەی پەل و خەڵفزۆر، کنهبل: درەختی دڕکداری وشترخۆر.

دەڵێ: ئەو هەورە پڕ لە باران و بروسکەو هەورە تریشقە لەسەر چیای قەتەن کە لەیەمەنەوە لای ڕاستی گرتووە کە تەماشای بکەین و لای چەپی لەسەر چیاکانی سەتار و یەزبولە، کە لە بەحرەینە، واتە ناوچەکەی کەنداوی گرتووەتەوە، هەر لەچێشتەنگاو دەستی کرد بە ڕێژانی ئاو لە دەوری چیای کوتەیفە، وەك دەمی کونەی پڕ لە ئاو

سەرەوخوار بكەيتەوە، داری بەرز و گەورەی وشترخۆری لار دەكردەوە و زۆر بە توونديی دادەباری بەسەر دارو دۆڵ و چيادا.

| | |
|---|---|
| وَمَــرَّ عَلَــى القَنَــانِ مِــنْ نَفَيَانِــهِ | فَـأَنْزَلَ مِنْـهُ العُصْـمَ مِـنْ كُـلِّ مُنْـزَلِ |
| وَتَيْمَـاءَ لَـمْ يَتْـرُكْ بِهَـا جِـذْعَ نَخْلَـةٍ | وَلاَ أُجُمــاً إلاَّ مَشِــيداً بِجَنْــدَلِ |
| كَــأَنَّ ثَــبِيراً فِــي عَــرانِينِ وَبْلِــهِ | كَــبِيرُ أُنَــاسٍ فِــي بِجَــادٍ مُزَمَّــلِ |
| كَــأَنَّ ذُرَى رَأْسِ المُجَيْمِــرِ غُــدْوَةً | مِــنَ السَّـيْلِ وَالغُثَـاءَ فَلْكَـةُ مِغْـزَلِ |

قنـان، تيمـاء، ثـبير، مُجيمـر: نـاوگرد و چـيا و شـاخن، لـە حيجـاز و مەدينە.

دەڵێ: ئـەو هـەورە عالـەمگيرە، ڕۆيشـت بەسـەر چـياى قەناتـدا، پرشـى بارانەكـەى و دڵۆپـە گـەورەكانى، مەڕەكێوييـەكانى لەشـوێنە بەرزەكانـەوە هێنايە خوارەوەو لە لافاو خۆيان حەشارداوە و تـەماى گرتـەوە و هەرچـى بنـەدارخورماى گـەورە هـەبوو هـەمووى لـەبن هەڵكەنـد و هـەموو جـۆرە كـەيلێ و خانوويـيـەكى ڕامـاڵى و ڕوخانـدى، مەگـەر ئـەوەى بەبـەردى زۆر گـەورەو گـەچ دروسـت كرابـێ و تەماشـاى چـياى (سـوبەير)ت كردبـا لەسـەرەتاى بارانـە بەخوڕەكـەوە بەسـەر كـەپوو لوتيـدا دەهاتـەخوارەوە، واتدەزانى عەرەبى بەدەوى عەباى لەسەر شانى چنراوە، چونكە بارانەكە زۆر بەخوڕ ئەبارى، وەك تاڵەدەزو دەردەكـەوت، سـەرى چـياى موجەيمـەر دەمە و عەسر ئەوەندە لافاوى بەملاوئەولادا هاتەخوارەوە دەتگوت سـەرى تەشى و خورى ڕستنە دەخولێتەوە، ئەم سەرسوڕمانەى شاعير لەوەيـە كـە

بارانی وا زۆر و لافاوی بەهێز و پووش و پەلاش و خاشاکی ڕامالیوه هەتا ئەو ڕۆژه لە نیوەدورگەی عەرەب نەبووە.

وَأَلْقَى بِصَحْرَاءِ الغَبِيطِ بَعَاعَهُ   نُزُولَ الْيَمَانِي ذِي العِيَابِ الْمُحَمَّلِ
كَأَنَّ مكَاكِيَّ الجَواءِ غُدَيَّةً   صُبِحْنَ سُلافًا مِنْ رَحِيقٍ مُفَلْفَلِ
كَأَنَّ السِّبَاعَ فِيهِ غَرْقَى عَشِيَّةً   بِأَرْجَائِهِ القُصْوَى أَنَابِيشُ عُنْصُلِ

القى: فڕەی داوە، بعاع: درزی شەبەق، وەك كۆلۆسن، العياب: كوتاڵ و قوماشی ئەعرابی، المحمّل: بارگە، مكاكىّ: پەپوسلێمانە، غديّة: بەیانی زۆر زوو، الجواء: درزی قولّی زەوی، صبحن: دەمی بەیانی، سلاف: شەرابی تازە پالێوراو، رحيق: پوختەی بن كوپە، مفلفل: بەهارات پێوەكراو و تیژ، أنابيش: سەلكی پیاز و شتی تر، عنصل: پیازەخوگانە.

دەڵێ: كە بارانەكە باریبوو و لەپێشەوە هەموو جارێ باری بوو و لەو بیابانەی دەشت و دەرەو لەناو كەرسەكە قوڕاودا گژو گیا سەوزبووبوو، دیمەنی وەك ئەو چەرچییە بەدەویە یەمەنییە جولەكەیە، چونكە بارە قوماشەكەی ڕاخستبوو بۆ فرۆشتن، ئەوجا پەپوسلێمانەی ناو گژو گیا لە خۆشی دانەو گیای سەوز بوو، وەك ئەو بەو مەستەدابوو كە سەرلەبەیانی تێر تێر خۆی مەست كردبێ لە مەی تازەدەم و پڕ لە بەهارات و زۆر تیژ، ئەوجا دڕندەكانی وەك شێر و پڵنگ و گورگ و ڕێوی و چەقەڵ لەناو تەنكاوەبارانە ئاوەكەدا تەنها سەراپای دیار بوو، وەك پیازە خوگانە سەر ئاو كەوتبوون.

ئەوە شاعیرە کە زۆر بەتواناوە باسی سەیرانی هەواری جول جول دەکات و لەگەڵ عونەیزەخان ڕائەبوێری، وە وشتری بۆ ئەکات بە قوربانی و ڕۆژێکی پڕ لە عەیش و نۆش و ماچ و موچ دەگوزەرێنێ، کە هۆکاری ئەم چامە شیعرەیە کە جگە لەوەسفی دڵدارەکەی باسی شەو، ئەسپ، بروسکە، باران، کە لە هەشتاو دوو بەیتدا زۆر بە وردی وەسفی ئەو کاتە دەکات، لە یەکەم دێڕ هەتا هەشتەم، باسی جیابوونەوە لە دۆست ئەکات، لە دێڕی نۆیەم هەتا چل و دوو، باسی ڕابواردن دەکات، لە چل و سێ هەتا چل و شەش، باسی شەدارەکان، لە چل و حەوت هەتا پەنجا، باسی سامناکیی و ژێر شیوو دەکات، لە پەنجاو یەکەوە هەتا شەست و هەشت، باسی ئەسپەکەیە، لە شەست و نۆ هەتا حەفتا، بروسکە باس دەکات، لە حەفتاو یەکەوە هەتا هەشتا، باسی باران و لافاوە.

# تەرفەی كوڕی عەبد

عـەمری كـوڕی عەبـدی بـەكری، كـەناوی تـەرفەیـە، بـەمانای ڕەسـەن و وەجاغزادەیـە، لـە بـاوك و لەدایكـەوە، بـە منـداڵی بـاوكی مـردووەو لـەپاڵ مامەكانی زۆر سەخت ژیاوەو لـە دەسـتی وەردەی دایكـی تـاڵاوی چەشـتوە، دەستیداوەتە ژیانی لەهولەعب، هەموو سامانی ماڵە باوكی فەوتان، ئـەوجا پەیوەندی كرد بە عەمری كوڕی هینـد، بـەڵام دەمشـڕی بـووە هـۆی ئـەوە لەپادشـای حـیرەوە نامەیـەكی بـۆ نووسـرا بـۆ مـیری بـەحرەین و ئـەوەی تێـدابوو كـە بكـوژرێ و لەگەنجیـدا كـوژرا، ئـەوە ژیـانی ئـەم شـاعیرەیە بـە كورتی.

توێژەران و ڕەخنـەگرانی ئەدەبی عـەرەبی زۆریـان وتـووە لـەبارەی ئـەم گـەورە شـاعیرەوە، بـەڵام بـۆ كـورد زۆر پێویسـت نییـە جگـە لـەوەی ئـەم شاعیرە زۆر وردە لەباسی هەوارگـەو نـەریتی عـەرەبی لـەوكات و ڕەخنـە و باسی وردی وشـتر و شـانازی خـۆی و باسـی وردی ژیـان و مـردن و سـتەمی خێڵەكەی و هەستی ناسكی خۆی جوان دەربڕیوەو زۆر درێژدادڕ نییە.

# هەڵواسراوی تەرفەی کوڕی عەبد

لِخَوْلَـةَ أَطْـلاَلٌ بِبُرْقَـةِ ثَهْمَـدِ    تَلُوحُ كَبَاقِي الْوَشْمِ فِي ظَـاهِرِ الْيَـدِ

اطلال: پاشماوەو شوێنەوار، تلوح: دەردەکەوێ، وشم: خاڵ.

خەوله کەناوی ئەو کچە دەشتەکییە کە تەرفە حەزی لێ بووە، هەوار و دەوار و کـەپری خـۆی هەیـە لەسـەر تەپۆڵکـەی سـەهمەوە، هـەرماوەو نەفەوتاوە و لـەناو ئـەو بـەردو لـەدا دەبینـرێ، وەك ئـەو خاڵـەی کـوتراوە لەسەر پشتی دەست و پەنجەی کیژی عـەرەب، کـە زۆر حـەزی لێ دەکـەن و بەدەرزی زامداری دەکەن و بەکل ڕەنگی لێدەنەخشێنن.

وُقُوفاً بِهَا صَحْبِي عَلَـيَّ مَطِـيَّهُمْ    يَقُولُـونَ: لاَ تَهْلِـكْ أَسَـى وَتَجَلَّـدِ

هاوڕێکـانم بەدیارمـەوە وەسـتان و وڵاخـەکانیان ڕاگـرت و ئامۆژگاریـان کـردم، خـۆت مەفەوتێنـە بەخـەم و پـەژارەوە، وەك ئـازا خـۆت ڕابگـرە و ژیانی خۆش بگوزەرێنە.

كَـأَنَّ حُـدُوجَ الْمَالِكِيَّـةِ غُـدْوَةً    خَلاَيَـا سَـفِينٍ بالنَّوَاصِـفِ مِـنْ دَدِ

کەژاوەکانی هۆزی مالیك لە ئێوارەوەختێکدا و (گەمی) بەلەم و کەشتی ڕاگیراوبوون، لەناو شیوەکانی مۆڵیان دابوو بۆ کۆچکردن.

عَدَوْلِيَّــةٍ أَوْ مِــنْ سَــفِينِ ابْــنِ يَــامِنٍ    يَجَــورُ بِهَــا الْمَــلاَّحُ طَـوْراً وَيَهْتَــدِي

ئــەو گــەمی و بەلــەم و کەشــتییە ڕاوەســتاوە لــە عــەدەن، لای نزیــك عومانەوە هاتبوون و سەر بە کەشتیوان و گەمیـداری کوڕی یـامین بـوون، هەندێ جار بـەملاو ئـەولادا لایانـدەداو هەنـدێ جاریش ڕێگـەی ڕاسـتیان دەگرت، مەبەستی ئەوەیە کەشتی بیابان کە وشـترە لـە دوای یەکـەوە وەك گەلەگەمی ناو دەریا و نزیك دورگە دەبینران.

يَشُــقُّ حُبَــابَ الْمَــاءِ حَيْزُومُهَــا بِهَــا    كَمَــا قَسَــمَ التُّــرْبَ الْمُفَايِــلُ بِالْيَــدِ

ئەو گەلە وشترە وەك گەلەگەمی ڕێگەی ئاویان دەبڕی و سـنگی خۆیـان لە دەشتی وەك دەریا دەهاویشت، وەك ئەو مندالّەی کە مالّەبەشکێ دەکـات و شتێك لـەناو کۆمـەلێك دەشـارێتەوەو پەنجـەی دەکـات بـە دوو بەشـەوەو بەهاوڕێکـەی دەلّـێ: دەی لـەکام بەشـدایە، ئــەو ڕەوە وشــترە بــەو شــیوە بەڕێکەوتن.

وَفِي الْحَيِّ أَحْوَى يَنْفُضُ الْمَرْدَشَادِنٌ    مُظَــاهِرُ سِــمْطَيْ لُؤْلُــؤٍ وَزَبَرْجَــدِ

لەناو هەوارگەکەدا کارمامزی چاوڕەش هەیـە کـە ئاسـکی گـەورە بـەری ئـەداو ئـەراك ئـەوەرێنێ بـۆی کـە ملوانکـەی مـرواری و دانـەی گەوهـەری لەملدایەو بەجوانی سروشتی وا، جوانی دەستکردی هەلّواسیوە.

خَــذُولٌ تُرَاعِــي رَبْرَبــاً بِخَمِيلَــةٍ تَنَــاوَلُ أَطْــرَافَ الْبَرِيــرِ وَتَرْتَــدِي

ئەو دایکە مامزەی بەبەرەوومیەو شیری پێ ئەداو لە ڕەوە ئاسکەکان جیابووەتەوە بۆ بەخێوکردنی کارەکەی و لەناو ڕەوەکەدا ئەلەوەڕێ بەجیا، لەبەر نازداری بێچوەکەی چاوێکی هەمیشە لە خواردنی بەری داری ئەراکەو چاوەکەی تری لەسەر کارەکەیەتی، ئەو هەموو چواندنە مەبەستی ژنێکی شۆخەو مندالۆمبەرە.

وَتَبْسِــمُ عَــنْ أَلْمــى كَــأَنَّ مُنَــوِّراً تَخَلَّــلَ حُــرَّ الرَّمْــلِ دِعْــصٌ لَــهُ نَــدِ

کە ئەو ئاسکە ناسکە سرکە پێ ئەکەنێ، پوکی گەنم ڕەنگ دەردەکەوێ، کە ڕەونەقی داوە بە ددانە سپییەکانی، وەك گوڵی بەیبوون دیارە، وردو ساغ و سپی، وەك وردە ڕێزی شۆڕاوەیە، لەو ڕۆژەوە هەتا ئەمڕۆ کەسێك نەبووە بەو جۆرە وەسفی دەم و لێوو ددان و چاو و گەردن و ملوانکە بەو زیندوییە بکات، کە ئەم لاوە کردویەتی.

سَــقَتْهُ إِيَّــاهُ الشَّــمْسِ إِلاَّ لِثَاتِــهِ أُسِــفَّ وَلَــمْ تَكْــدِمْ عَلَيْــهِ بِإِثْمِــدِ

ئەو ڕێزە وردەی کە ددانی پێ چواندووە تیشکی خۆر ئەوەندەی تر سپی کردووەتەوە، بەڵام پووك و لێوی وەك خۆی ماوەتەوە، (ئەڵێی بە گەڵا گوێزی تەوێڵە ڕەنگکراوە)، وەك زامدار کرابێ و کلی بەسەردا کرابێ، واتە هەر هەموو ڕەنگەکان سروشتییە.

وَوَجْهٌ كَأَنَّ الشَّــمْسَ حَلَّــتْ رِدَاءَهَــا عَلَيْــهِ، نَقِــيُّ اللَّــوْنِ، لَــمْ يَتَخَــدَّدِ

ئەو شێوە ئاسکە ڕومزەتێکی هەیە، دەڵێی خۆری ئاسمان سەرپۆشی داوە بە ڕوویدا، جوان، پاك، بێگەرد، ڕەنگی گەش، هیچ جۆرە لەکەی لەسەر نەماوەو چاڵ و چۆڵ و عازەبەی لەسەر نییە و وەك ئاوێنەیە!.

وَإِنِّـي لأُمْضِـي الْهَـمَّ عِنْـدَ احْتِضَـارِهِ    بِعَوْجَــاءَ مِرْقَــالِ تَــرُوحُ وَتَغْتَــدِي

دەڵـێ: بـەڵام مـن هـەرکات خـەم و پەژارەیـەکم هـەبێ بـەهۆی ئـەم نازدارەوە دەری دەکەم و دەچم بۆلای بەسواری ئەو وشترە سووك و سۆڵ و تیژڕەوە، کە لەهاتن و چوون ماندوو نابێ.

أَمُــونٍ كَــأَلْوَاحِ الأِرَانِ نَسَــأْتُهَا    عَلَـى لاَحِـبٍ كأَنَّـهُ ظَهْـرُ بُرْجُـدِ
تُبَــارِي عِتَاقــاً نَاجِيَــاتٍ، وَأَتْبَعــتْ    وَظِيفــاً وَظِيفــاً فَــوْقَ مَــوْرٍ مُعَبَّــدِ

وەسفی وشترەکەی دەکات و لە بەیتی پێشوودا هەندێکی باسکرد و لێرەش دەڵێ: ئارام و لەسەرخۆیەو مەترسی لێ ناکرێ و پشتی پان و تەختە، ئەڵێی دارە تەختەکەی فیرعەونەکانە کە کۆیلە هەڵیاندەگرت و منیش بە قەمچی لێی دەخورم، لەسەر ڕێگەیەکی تەخت وەك قوماشی هێڵداری ساف، پێش پێشێنی پێ ئەکەم، لەگەڵ وشتری ڕەسەنی دەگمەنی سپی و جەحێڵ و جوان و لاقەکانی پاشەوەی هاوڕازن لەگەڵ هەردوو دەستی کە بەسەر زەوی و خۆڵ و خاکدا دەڕوا.

تَرَبَّعَــتِ الْقُفَّــيْنِ بالشَّــوْلِ تَرْتَعِــي    حَــدَائِقَ مَــوْلِيٍّ الْأَسِــرَّةَ أَغْيَــدِ
تَرِيــعُ إِلَـى صَـوْتِ الْمُهِيـبِ، وَتَتَّقِـي    بِـذِي خُصَـلٍ رَوْعَـاتِ أَكْلَـفَ مُلْبِـدِ
كَــأَنَّ جَنَــاحَيْ مَضْــرَحِيّ تَكَنَّفَــا    حِفافَيْـهِ شُـكَّا فِـي الْعَسِـيبِ بِمِسْـرَدِ

هەر لە باسی وشترەكەی دەڵێ: زۆر جوان گوێڕایەڵە لە دەنگی شوان و خاوەنەكەی و ڕام و دەستەمۆیە، بەڵام بە كلكی چرووپری خۆی دەبوێری لە نێرەی كارامەو بەهێز و لە ڕەشیدا سوور دەنوێنێ و كلكی ناوە بەنێرینەی پشتی و بۆ مێینەیەك دەگەڕێ و زۆر بە شەوق و زەوقەو كلكی ئەو وشترە نێرە دەڵێی باڵی هەڵۆی بەتەمەن و پیرەو لە هەردوولایەوە بە حەبلی هۆنراوە و بە تویكڵی دارخورما بەیەكەوە گرێدراوەو دووراوە بە درەوش و دەرزی قایم كە دیارترین سیفەتی نێرمیە.

ئەوە وەسفە، ئەوەندە سادەیە، تەنها خەیاڵی ئەعرابییەكی لاوی عەرەب نەبێ كێ بە خەیاڵیدا دێ كلكی وشتر بچوێنێ بە دووباڵی داڵێكی كۆنی باڵ ڕووتاوە و بە حەبلی شلێفی دارخورما بەیەكەوە دوورابێتەوە.

فَطَوْراً بِهِ خَلْفَ الزَّمِيلِ، وَتَارَةً ... عَلَى حِشِفٍ كَالشَّنِّ ذَاوٍ مُجَدَّدِ

لَهَا فَخِذَانِ أُكْمِلَ النَّحْضُ فِيهِمَا ... كَأَنَّهُمَا بَابَا مُنِيفٍ مُمَرَّدِ

وَطَيٌّ مَحَالٍ كَالحَنِيِّ خُلُوفُهُ ... وَأَجْرِنَةٌ لُزَّتْ بِدَأْيٍ مُنَضَّدِ

دەڵێ: ئەم كلكە وشترە لە پێشەوە باس كرا، هەمیشە لەكاردایە، جارێ ئەیدات لە پشتی ئەو كەسەی لەدواوە سواربووە، یانی شوێنی ئەو ئەگەر هەبوو جارێكیش ئەیدات لەناو گوانەكانی كە وشكبوومتەوەو شیری تێدا نییە، وەك كونەی (چەوت)نی كۆنی لێهاتووەو پوكاوەتەوەو بێ شیرە و ئەوانەش لەناو دوولاقدایەو گۆشتی زۆری گرتووە وەك دوو لاشیپانی

دەرگای كۆشكێكی بەرزو بڵند و لەمەڕمەڕ درووستكرابێ ساف و لووس و بێگرێ و گۆڵە.

ئـەوجا برِبـڕەی پشـتی وەك كـەوان پێچـراوە لەپەراسـووەكانی و ژێـر چـەناگەی بەمەحكـەمی گرێـدراوە بـە ملیـەوەو لەگـەڵ برِبـڕەی شـان و دووگی سەرپشتی گرێدراوە، هـەموو وشـترێك ئـەوە وەسـفی بـێ دەبـێ زۆر كارامەو تیژڕەوبێ.

كِنَاسَـــــيْ ضَــــالَةٍ يَكْنُفَانِهَـــــا وَأَطْــرَ قِسِــيِّ تَحْــتَ صُــلْبٍ مُؤَيَّــدِ
لَهَـــا مِرْفَقَـــانِ أَفْـــتَلاَنِ كَأَنَّمَـــا تَمُـــرُّ بِسَـــلْمَيْ دَالِـــجٍ مُتَشَـــدِّدِ
كَقَنْطَــرَةِ الرُّومِــيِّ أَقْسَــمَ رَبُّهَــا لَتُكْتَــنَفَنْ حَتَّــى تُشَــادَ بِقَرْمَــدِ
صُــهَابِيَّةُ العُثْنُــونِ مُؤْجَــدَةُ الْقَــرَا بَعِيــدَةُ وَخْــدِ الرِّجْــلِ مَــوَّارَةُ الْيَــدِ

ئەوە هەر باس باسی وشترەكەیە، كە هەردوو قەبووغەی وەك ئـەو دوو چاڵەیە كـە گا بـە هـەردوو دەسـتی هەڵیدەكـەنێ لـە بنـی داری مـۆردا بـۆ فێنكیی و پاڵكەوتن و دەڵێی چەمینەوەی كەوانە لە نێوان پشت و هەردوو لاقیدا، بەڵام تووشی گەرمەژەن و گەڕۆڵیی نەبووەو بۆشایی بـێ نەخۆشـی لاق و ئەژنۆو بن هەنگڵ، هەردوو مەچەكی لكاون بە سنگییەوە، وە ئەڵێی دوو دۆڵچەی ئاو هەڵكێشانەو بەدەست ئاوی لەبیر پـێ دەردێـنن و قـۆڵی لێ هەڵماڵیوە، وەك پردی ڕۆمەكان كە وەستاكەی بە جوانیی بەخشت و گـەچ كەوانەی بۆ دروستكردووە، بۆ هاتووچۆی خەڵك، ڕەنگی سپی بەرەو سوور و لـەژێر توكەكەیـەوە ئـەو دوو لاقـە لكـاون بـە بنڕانیـەوە، سـنگی لەگـەڵ دەستی و پاشەوەی لەگەڵ قاچی هاوتەریب كاردەكەن.

أُمِرَّتْ يَدَاهَا فَتْلَ شَزْرٍ، وَأُجْنِحَتْ    لَهَا عَضُدَاهَا فِي سَقِيفٍ مُسَنَّدِ
جَنُوحٌ، دُفَاقٌ، عَنْدَلٌ، ثُمَّ أُفْرِعَتْ    لَهَا كَتِفَاهَا فِي مُعَالًى مُصَعَّدِ
كَأَنَّ عُلُوبَ النِّسْعِ فِي دَأَيَاتِهَا    مَوَارِدُ مِنْ خَلْقَاءَ فِي ظَهْرِ قَرْدَدِ
تَلاقَى، وَأَحْيَاناً تَبِينُ كَأَنَّهَا    بَنَائِقُ غُرٌّ فِي قَمِيصٍ مُقَدَّدِ

دەڵێ: لاقی بادرابوو، وەك گوریسی پتەوی زیادە، ئەڵێی بەنەکەی وەك ڕەگڕەگ و باربوو بۆ پێشەوە، وەك باڵی باڵندە دەرچووبوون، هەردوو باسك و ئانیشکی وەك تاشە بەردی قایم بە پشتییەوە لکابوون، لاقەکەی ئەملاو ئەولای دەکرد، وەك لاربێتەوەو تەکانی دەدا بۆ پێشەوە، خاوەن کەللەیەکی گەورە بوو، بەرز ڕاگیری کردبوو بۆسەرەوە، لەسەر دوو سەرشانی هەڵکشاوە بەرەو سەرەوە، ئەوشان و ملەی شوێنەواری پەت و گوریسی چەرم و دروستکراو لەسەر پەراسوەکانی دیار بوو، بەڵام کاری تێ نەکردبوو، هەروەك جۆگەلەی ئاوی کەم کە کار ناکاتە سەر تاشە بەردی گەورەو ڕەق، واتە تەنگەوژێر تەنگەوژێر، سك و پاڵوو گوریس و قەیاسە هەر تواناى نەبوو، کار لە پشت و پەراسوی بکات، چونکە ئەو جۆگەلە ئاوە هەندێ جار پێکەوەو هەندێ جار بەجیا ڕێگەی دەکرد، ئەڵقەی تەنگەو چەڵەمەی لای پەراسووی وەك قۆپچەی کراسی سپی لەسەر قوماشی دادڕاو دیار بوو.

(ئەم وەسفە سەرەتایی و دەشتەکییە، وەك باسی سەیارەی تەواو مواسەفاتی ئەمڕۆی باس کردووە، تەنها شوێنێك نییە کە باسی نەکردبێ، ئەوەش جۆرە لەزەتێکی هەبووە وەك ئەمڕۆ!!)

وَأَتْلَـعُ نَهّـاضٌ إِذَا صَعَّدَتْ بِهِ كَسُكّانِ بُوصِيٍّ بِدِجْلَةَ مُصْعِدِ
وَجُمْجُمَةٌ مِثْلُ العَلاَةِ كَأَنَّمَا وَعَى المُلتَقَى مِنْهَا إِلَى حَرْفِ مِبْرَدِ
وَخَدٌّ كَقِرْطَاسِ الشّآمِي وَمِشْفَرٌ كَسِبْتِ الْيَمَانِي قَدُّهُ لَمْ يُحَرَّدِ

ئەم وشترە ملی زۆر درێژەو لەکاتی ڕۆیشتن بەرزی ئەکاتەوەو بەرەو سەرەوە هەنگاو دەنێ، ئەڵێی سەوڵی بەلەمی ناو ڕووباری دجلەیە، بۆ سەرەوەی ڕووبار دەئاژوێ، کەللەی سەری ئەڵێی دەزگای ئاسنگەرەو سندانی مزگەرە، دەڵێی ئێسقانەکەی سووچی تیژی شاخی بەرزو ڕەقە، وادەردەکەوێ کە بڕبەندی تیژکردنی تیغ و شمشێرە، واتە زبر و ڕەق و سەختە.

لای هەردوو گوپی و چەناگەی وەك کاغەزی نوسین وایە کە لە شام دروست دەکرێ و تووکی پێوە نەماوە لەبەر کۆنیی و ڕەسەنیی و لچ و لێوی ئەم وشترە وەك پێستی چێلی دەباغکراوی لێهاتووە، کە بەتاڵ و جەوت دەواغی کرابێ و پان و درێژە وەك کەوشی یەمانی نەرم و ڕەق و مەحکەم و پتەو.

وَعَيْنَانِ كَالْمَاوِيَّتَيْنِ اسْتَكَنَّتَا بِكَهْفَيْ حِجَاجَيْ صَخْرَةٍ قَلْتِ مَوْرِدِ
طَحُورَانِ عُوّارَ الْقَذَى، فَتَرَاهُمَا كَمَكْحُولَتَيْ مَذْعُورَةٍ أُمِّ فَرْقَدِ
وَصَادِقَتَا سَمْعِ التَّوَجُّسِ لِلسُّرَى لِهَجْسٍ خَفِيٍّ أَوْ لِصَوْتٍ مُنَدَّدِ

ئەو وشترە دووچاوی گەشی هەیە، وەك ئاوێنە سافەو شتبینە، لەناو تاقێك یان دوو تاق کە بە قەدی شاخێك، یان دوو شاخ وەك ئەشکەوتی

بچووك دەردەکەون، لەژێر دوو ماى سەختى دەرچوو لە چیا کە وێنەى هەردوو ئەبرۆى بوو لەژێریاندا، دوو چاڵاوى باران دەردەکەوێ کە ئاوى پاکى ڕوونى تێدابێ، ئەو دوو چاوە کە وەك چاڵاوى ناو بەردى سەر چیایە، فڕێدەرى پوش و کا و وردەگەڵایە، وەك دووچاوى گاکێوى ترساو، لەناوچوونى خۆى و گۆلکەکەى کە زۆر جوان دەردەکەوێ، ئەوجا دوو گوێى ڕاست بیست و هەڵۆڵ و بیسەرى دەنگى نزم و گوێبیستى خشەى نزم لە شەوى تاریکدا، یان سووکترین چپەى لێ دەبیستێ.

(ئەوە نازکترین وەسفى گوێیە لەو ڕۆژەدا!).

مُؤَلَّلتَانِ، تَعْرِفُ الْعِتْقَ فِيهِمَا ... كَسَامِعَتَيْ شَاةٍ بِحَوْمَلَ مُفْرَدِ

وَأَرْوَعُ نَبَّاضٌ أَحَذُّ مُلَمْلَمٌ ... كَمِرْدَاةِ صَخْرٍ فِي صَفِيحٍ مُصَمَّدِ

وَإِنْ شِئْتَ سامَى وَاسِطَ الكُورِ رَأْسُها ... وَعَامَتْ بِضَبْعَيْهَا نَجاءَ الْخَفَيْدَدِ

هەردوو گوێى نیشانەکردووە وەك ئامێرى نیشانەى ڕم، کە ڕەسەنیى و نەجابەتى لێدەردەکەوێ، وەك دوو گوێى ئەو مەڕەکێوییە کە لەناوچەى حەومەل دەژى و تاکبووەتەوەو گوێقوڵاخە بۆ دۆزینەوەى ڕێگەچارە، خاوەن دڵێکى هۆشیارە بۆ هەر مەترسییەك و بە توونديى لێدەدات وەك سەعاتى چەڵەم بەڵام سووك و بێدار و زیرەك و ئامادەو بە وزە و ورە وەك دەسکەوانى بەردى ناو دەنگى خوێکوتان بە زۆر ئیشى پێ کرابێ، ئەگەر بتەوێ سەرى بەرز دەکاتەوە هەتا ڕێك لەگەڵ پاش تەرکى سوارەکەى ڕێك دەبێ و کەڵپوسى لەگەڵ ئاو زەنى تەنیشتى، وەك

مەلەوانیی بكات لەناو ئاودا نەعامەیەو هەردوو باڵی بەكار دێنێ بۆ مەلەوانیی.

(لە ڕاستیدا وشتر كە ڕێگە دەبڕێ وەك سیمرغ وایە كە بەكوردی وشترمرە!).

وَإِنْ شِئْتَ لَم تُرْقِلْ، وَإِنْ شِئْتَ أَرْقَلَتْ     مَخَافَةَ مَلْوِيّ مِنَ القْقَدِّ مُحْصَدِ
وَأَعْلَمُ مَخْرُوتٌ مِنَ الأَنْفِ مَارِنٌ     عَتِيقٌ مَتَى تَرْجُمْ بِهِ الْأَرْضَ تَزْدَدِ
عَلَى مِثْلِهَا أَمْضِي إِذَا قَالَ صَاحِبِي:     أَلاَ لَيْتَنِي أَفْدِيكَ مِنْهَا وَأَفْتَدِي
وَجَاشَتْ إِلَيْهِ النَّفْسُ خَوْفاً وَخَالَهُ     مُصاباً وَلَوْ أَمْسَى عَلَى غَيْرِ مَرْصَدِ

لەسەر باسی وشتر بووەو دەڵێ: بە ئارەزووی خۆتە چۆن حەز دەكەی بەو جۆرە دەڕوا حەزت لێیە بە لەز بڕوا وا دەڕوا و حەزت لێیە سووك دەڕواو پەلە ناكات، ترسی شوولّ و قەمچیی هەیە كە لەپێست دروستكراوەو ئێشی زۆرە، دەم و لچی بۆ سەرەوە بەرز بووەتەوەو لە نزیك كونی لوتییەوە لەت بووەو نەرم و خۆشكارە بۆ خواردنی گەڵای دڕكاویی و هەركات سەری نزمكردەوە لە زەوی نیازی تیژ ڕۆیشتنە.

دەڵێ: من بەم وشترە سەفەر دەكەم، هەندێ جار هاوڕێی سەفەرەكەم دەڵێ: ترسمان هەیە لەم دەشتە چۆڵە ترسناكە تێدا بچین و زۆر بە ڕاستی دەڵێن: خۆزگە ئێمەش بەقوربانی وشترێكی وا بووینایە و خۆمان ئەكەین بە سەدەقەی تۆ كە ئەم وشترەت هەیە، مرۆڤ دڵی دێتە جۆش و خرۆش و دەكوڵێ لەترسان، وا گومان دەبا كە تووشی كارەسات بووەو ڕێگەی بێ

نیشان دەبڕین لەشەوی تاریکدا، بەڵام من بەهۆی ئەم وشترەوە ڕزگارم دەبێ و ئەوانیش ڕزگار دەکەم.

إِذَا الْقَوْمُ قَالُوا مَنْ فَتَى خِلْتُ أَنَّنِي    عُنِيتُ فَلَمْ أَكْسَلُ، وَلَمْ أَتبَلَّدِ
أَحَلتُ عَلَيْهَا بِالْقَطِيعِ فَأَجْذَمَتْ    وَقَدْ خَبَّ آلُ الأمْعَزِ الْمُتَوَقِّدِ
فَذَالَتْ كَمَا ذَالَتْ وَلِيدَةُ مَجْلِسٍ    تُرِي رَبَّهَا أَذْيالَ سَحْلٍ مُمَدَّدِ

دەڵێ: لەسەرەتای ئەم سەفەرە سامناکە پڕ مەترسییە هاوڕێیان دەڵێن: کێ هەیە سەر کاروانی ئەم ڕێگەیە؟، دەزانم مەبەستیان لە منە کە کوڕی ئەو ڕێگایەم و منیش تەمەڵیی ناکەم و خۆم گێل ناکەم، ئەوکاتە شووڵی لێڕادەکێشم و وشترەکەش پەلە دەکات لەڕۆیشتن لەناو گەرمی توانابڕ و تراویلکە باڵی کێشاوە بەسەر بەردو و لی گرگرتوودا، ئالەم کاتەدا وشترەکەی من بە دەعیەو فیزەوە هەنگاو دەنێ و خۆی با ئەدا، ئەڵێی کیژێکی سەماکارەو لەناو کۆڕی ڕابواردن سوڕوسەما ئەکات بە کراسی سپی کە لە ئەرز دەخشێ، ناوەناوە هەڵی ئەداتەوە بۆ نیشاندانی کۆڕگێڕەکان.

وَلَسْتُ بِحَلاَّلِ التِّلاعِ مَخَافَةً    وَلَكِنْ مَتَى يَسْتَرْفِدِ الْقَوْمُ أَرْفِدِ
وَإِنْ تَبْغِنِي فِي حَلْقَةِ الْقَوْمِ تَلْقَنِي    وَإِنْ تَقْتَنِصْنِي فِي الْحَوَانِيتِ تَصْطَدِ
مَتَى تَأْتِنِي أَصْبَحْكَ كَأساً رَوِيَّةً    وَإِنْ كُنْتَ عَنْهَا غَانِياً فَاغْنَ وَازْدَدِ
وَإِنْ يَلْتَقِ الْحَيُّ الْجَمِيعُ تُلاَقِنِي    إِلَى ذِرْوَةِ الْبَيْتِ الرَّفِيعِ الْمُصَمَّدِ

دەڵێ: ئەگەر باسی خۆم بکەم، من لەوانە نیم خۆم حەشاردەم لە دۆڵ و شیوو گردۆلکە لە ترسان و لەبرسان و خۆم لە میوان و ڕێبوار بشارمەوە، بەڵکو لەناو سابات و دیوەخان دادەنیشم و چاوەڕوانی هەرکەسێك دەکەم کە داوای هاوکاریم لێ بکات، هەر لەشوێن من بگەڕێ لەناو کۆڕو کۆمەڵ و ڕاوێژ و پرس پێکردن، من ئامادەیی و حزورم هەیە، خۆ ئەگەر لە مەیخانەش بۆم بگەڕێن لەوێ بوونم هەیە بۆ خۆم و بۆ خەڵك.

هەرکەس دیدەنیم بکات لە بەیانیدا پەرداخی پڕ لە مەی پێشکەش دەکەم و ئەگەر خۆم مەست و سەرخۆش بووم هەوڵ ئەدەم بۆ میوانەکەم زیاتر و خۆشتر خواستی جێبەجێ بکەم، لەبارەی بنەچەو ڕەسەنایەتییەوە، ئەگەر خەڵك کۆبوونەوە بۆ باسکردن لە شانازیی هۆز و خێڵ ئەوە من خۆم لەگەورە مالان و ڕەسەن و یاراندار دەبینم و جێگەی ئومێد و پەنای خەڵك و دەوروبەرم.

نَــدَامَايَ بِــيضٌ كَــالنُّجُومِ وَقَيْنَــةٌ    تَــرُوحُ إِلَيْنَــا بَــيْنَ بُــرْدٍ وَمُجْسَــدِ
رَحِيبٌ قِطَـابُ الجَيْـبِ مِنْهَـا، رَفِيقَـةٌ    بِجَــسِّ النَّــدَامَى، بَضَّــةُ المُتَجَــرَّدِ

دەڵێ: هاوپیالەو هاوجامە مەیەکانم دیارو بەرچاو و ڕۆشن و ناودارن، وەك ئەستێرەن، بەهاوڕێی بەزم و کەنیزەك و کیژۆڵەی نەرم و ناسك دێن و دەچن و هەرجارەی بەرگێك لەبەر دەکەن، هەندێ جار کراسی شۆڕ و هەندێك جار سادەو سپی و هەندێ جاریش ڕەنگاو ڕەنگ و هەندێ جار فش و فووڵ و هەندێ جار لکاو بە لەشیانەوە، بەڵام یەخەبەرەڵاو گەردن

و سینگ و مەمك دیار و ڕام و دەستەمۆ بۆ دەستبازیی و دەست لەگەردنـدان، کە سپی و گەرم و نەرم و چەور و غەزوبەز، وەك کوڕی شازادەکان و گەورە سەرکۆمارەکان.

(ئەوە وێنەی سەردەمی نەفامییە یان شانۆی ئەمڕۆی دنیا!).

ئەو کۆڕەی کە مەی و ئافرەت و سەماو گۆرانیی و موزیك و کوڕی دەستبازیی و مەیبازیی تێدابێ لەکاتی نەفامیی و ئەمڕۆ جیاوازیی تێدا نەماوە.

بۆیە زانای خواپەرست دەڵێ: (ئەم سەدەیە سەدەی نەفامییە).

إِذَا نَحْـنُ قُلْنَـا أَسْـمِعِينَا انْبَـرَتْ لَنَـا    عَلَـى رِسْـلِهَا مَطْرُوفَـةً لَـمْ تَشَـدَّدِ
وَمَـا زَالَ تَشْـرَابِي الْخُمُـورَ وَلَـذَّتِي    وَبَيْعِـي وَإِنْفَـاقِي طَرِيفِـي وَمُتْلَـدِي

دەڵێ: ئەو کەنیزەك و کیژۆڵەی لە کۆڕی ڕابواردن و خواردنەوەدا ئامادەی گۆرانیی و سەمان و هەموو جوانیی خۆیان نمایش کردووە داوایان لێ بکەین ئامادەن گۆرانیی بڵێن، ئەوان زۆر بە هێمنیی و ئارامیی و لەسەرخۆ و بێ شڵەژان خۆشترین ئاوازی بەسۆز بەچاوی خومار و مەی ئاسان و دوور لە زبریی و زیادەڕۆیی پێشکەشدەکەن.

ئەم ژیانە زۆری نەبرد سەرگەرمی مەی خواردنەوە بووم و ڕام دەبوارد، هەموو ماڵ و سامان و دارایم فرۆشت و لەناوبرد و بەخشیی، هەموو سامانی میرات و کۆن و نوێ کرا بە قوربانی ڕابواردنم.

(ئەوە دانپێدانانی شاعیرە کە هەموو سامانی بۆ ڕابواردن خەرج کردووە).

إِلَــى أَنْ تَحَــامَتْنِي الْعَشِــيرَةُ كُلُّهَــا    وَأُفْــرِدْتُ إِفْــرَادَ الْــبَعِيرِ الْمُعَبَّــدِ
رَأَيْــتُ بَنِــي غَبْــرَاءَ لاَ يُنْكِرُونَنِــي    وَلاَ أَهْــلُ هَــذَاكَ الطِّــرَافِ الْمُمَــدَّدِ

دەڵێ: ئەو ژیانە بێ سنوور و بێ بەندو باوەی من کارێکی کرد کە هۆزەکەم هەموو لەمن تورە ببن و دەرم بکەن و خۆیان دووربگرن لەمن، بەتاك و تەنها و بێ کەس و هاودەم، وەك وشتری گەڕ و بیمار دوورخرامەوە، بێ کەس و هۆزو ماڵ مامەوە، چونکە ژیانی سەرسەریی و بێ بەندو باویم هەڵبژارد، ڕاستە نەوەی داناو و هەژار و لێقەوماوەکان چاك من دەناسن، چونکە میواندۆست و خاوەن دیوەخان و ناندەر بووم و هەرکات هەرچەند ئامادەبوونایە خزمەت ئامادەبوو بۆیان، هەروەها دەوڵەمەند و خاوەن سامان دەمناسن کە چۆن دەوار و سفرەم لە خزمەت هەمواندا بووە.

أَلاَ أَيُّهــذَا اللاَّئِمي أَحْضُــرَ الــوَغَى    وَأَنْ أَشْهَدَ اللَّذَّاتِ، هَلْ أَنْتَ مُخْلِدِي؟
فَــإِنْ كُنْــتَ لاَ تَسْــطِيعُ دَفْــعَ مَنِيَّتِــي    فَــدَعْنِي أُبَادِرْهَــا بِمَــا مَلَكَــتْ يَــدِي
فَلَــوْلاَ ثَــلاَثٌ هُــنَّ مِــنْ عِيشَــةِ الْفَتَــى    وَجَــدِّكَ لَــمْ أَحْفِــلْ مَتَــى قَــامَ عُــوَّدِي

دەڵێ: ئەی کابرای سەرزەنشتکاری من، کە دەتەوێ نەچم بۆ جەنگ، نەوەك بکوژرێم و داوا دەکەی کە ئەوەندە دەستگوشادبم، نەوەك لات و هەژار و ڕیسوابیم، لە وەڵامم بۆ ئەو سەرکۆنەکردنە ئەوەیە: ئەتوانم کە نەمریم؟ کە ناتوانی وازبێنە با ماڵ و سامانم لە دووی خۆشی و چاکەدا خەرج بکەم، وازم لێ بێنە برا، کە ناتوانی مردن دوور بخەیتەوە لە من، باخۆم بەرەو مردن بڕۆم، بە هەموو تواناو ئارەزووی خۆم ژیانی لاو و

گەنجیم ئەو سێ شتەیە کە لەمەولا باسیان دەکەم، بە گیانی باپیرەت (کە نەماوە) گوێم لێ نییە کەی شین و شەپۆڕم بۆ دەکرێ و پرسەو (وای شێرە)م بۆ دەڵێن.

فَمِنْهُنَّ سَبْقُ الْعَاذِلَاتِ بِشَرْبَةٍ كُمَيْتٍ مَتَى مَا تُعْلَ بِالْمَاءِ تُزْبِدِ
وَكَرِّ إِذَا نَادَى الْمُضَافُ مُحَنَّباً كَسِيدِ الْغَضَا نَبَّهْتَهُ الْمُتَوَرِّدِ

دەڵێ: یەکێك لەو سێ شتەی ژیانی گەنج پێك دێنن ئەوەیە پێش ئەوەی سەرزەنشتکاران تانەو تەشەر بدەن، فرێك مەی نۆش بکەین لەو مەیەی لە سووریدا مەیلەو ڕەش دەنوێنێ، کە دووبارە ئاوی تێ دەکرێ بۆ ئەوەی خەستییەکەی کەمبکرێتەوە، بڵقی لێ بەرز دەبێتەوە لەبەر کۆنیی و تیژیی.

دووەم دیاردە ئەوەیە کە من ئەسپەکەم دەگێڕمەوە کە چوار پەلی لەبەر جوانیی و خۆشەویستیی گیراوەتە خەنە، لە هەرکاتداو کارێك بۆ یارمەتیی و هاوکاریی پەنام بۆ بهێنێ وەك گورگی ناو جەنگەڵ پەلاماری ئاوخواردنەوە بدات و خاوەن ئاوەکە ڤاڵی لێ بکات بەو شێوەیە بەدەمیەوە دەچم.

وَتَقْصِيرُ يَوْمِ الدَّجْنِ وَالدَّجْنُ مُعْجِبٌ بِبَهْكَنَةٍ تَحْتَ الطِّرَافِ الْمُعَمَّدِ
كَأَنَّ الْبُرِينَ والدَّمَالِيجَ عُلِّقَتْ عَلَى عُشَرٍ أَوْ خِرْوَعٍ لَمْ يُخَضَّدِ

سێیەم: شێوازی ژیانی لاو کورتکردنەوەی ڕۆژی سەرماو باران و تەم، بەڕابواردن لەگەڵ ژنێکدا لە جێ ژواندا کە جگە لە جوانیی و ناسکیی و

نەرم و نۆلّیی لەماڵە گەورەشدا دەژی و دەوروبەری هەمیشە قەرەباڵغە کە هەردوو دەستی پڕە لە خرخاڵ و بازن و مەچەك و قۆڵی ئەڵێی خەڵفی شۆڕەبییە، یان خەڵفی گەرچەکەو ناسکەو کاتی بینینی نەهاتووە، ژوان لەگەڵ ئەم جۆرە ژنە بەهەموو کەس ناکرێ مەگەر بە تورفە!.

فَــذَرْنِي أُرَوِّ هَــامَتِي فِــي حَيَاتِهَــا    مَخَافَــةَ شِــرْبٍ فِــي الْحَيَــاةِ مُصَــرَّدِ
كَــرِيمٌ يُــرَوِّي نَفْسَــهُ فِــي حَيَاتِــهِ    سَــتَعْلَمُ إِنْ مُتْنَــا غَــداً أَيُّنَــا الصَّــدِي

دەڵێ: ئامۆژگارکار وازم لێبێنە دەست لە کۆڵم بکەرەوە، لێگەڕێ با گیانی خۆم تێر بکەم لە خواردنەوەو سەری خۆم گەرم بکەم، ترسم نییە لە ژیان کە کورت بێ و ببڕێتەوە، من پیاوێکی بەخشندەم بۆ خۆم و بۆ خەڵك، ڕەزیلی ناکات لە خۆی و لەخەڵك و لەژیاندا مەست و سەربەستە، ئەو دەزانێ ئەگەر سبەی مردین کام لە ئێمە لەگۆڕەکەی بایەقوش ئەخوێنێ و ببوومکەڕە و دەنکەومرە بۆی دەخوێنێ بۆ تۆڵەی خوێنی ڕژاوی کام لامان تینومانەو دەممان وشکە.

أَرَى قَبْــرَ نَحَّــامٍ بَخِيــلٍ بِمَالِــهِ    كَقَبْــرِ غَــوِيٍّ فِــي الْبَطَالَــةِ مُفْسِــدِ
تَــرَى جُثْــوَتَيْنِ مِــنْ تُــرَابٍ عَلَيْهِمَــا    صَــفَائِحُ صُــمٌّ مِــنْ صَــفِيحٍ مُنَضَّــدِ
أَرَى الْمَوْتَ يَعْتَامُ الْكِــرَامَ، وَيَصْــطَفِي    عَقِيلَــةَ مَــالِ الْفَــاحِشِ الْمُتَشَــدِّدِ

دەڵێ: ماڵم بۆچییە؟ ئەگەر بۆخۆم و خەڵك نەبێ، دەبینم گۆڕی ڕژدی دەست قوچاوو ڕەزیل وەك گۆڕی ڕابوێری بوێر بە ماڵ و سامانی بۆ خۆی و بۆ ئەوانەی داوای لێ دەکەن وەك یەکە، هەردوو گۆڕەکە کۆمایەك گڵی

لەسەرە و بە بەردی تاشراو و نەقارپی سەری گیراوەو لە ناو گۆڕەکەدا وەك یەك نێژراون، خۆ مەرگ بە ئارەزووی خۆی خەڵك دەست نیشان دەکات، جیاوازی ناکات لە نێوان شەریف و ناشەریف و سەخیی و ڕەزیل و پوختەماڵی ئەو کەسەی کە کۆیلەی سامانە لەناو دەبات، ماڵ و سامان زینەماڵە دەڕوات.

أَرَى الـدَّهْرَ كَنْـزاً نَاقِصـاً كُـلَّ لَيْلَـةٍ    وَمَـا تَـنْقُصِ الأَيَّـامُ وَالـدَّهْرُ يَنْفَـدِ
لَعَمْـرُكَ إِنَّ المَـوْتَ مَـا أَخْطَـأَ الفَتَـى    لَكَـالطِّوَلِ الْمُرْخَـى وَثِنْيَـاهُ بِالْيَـدِ

دەڵێ: زەمانە و ڕۆژ و مانگ و ساڵ وەك خەزنەیەك وایە، پڕە لە زێڕو زیوو دراو، بەڵام هەموو کاتژمێرێك لێی کەم دەبێتەوە، ئەوەی کەم دەبێ تەمەنی مرۆڤە، دەنا کات وەك خۆیەتی، ئەوجا دەڵێ: بەگیانی تۆ برای گوێگر، مەرگ بوار نادات بە مرۆڤ و وەك ئەو پەتە گوریسەیە کە سەرێکی وا بە دەست خاوەنەکەیەوە و سەرێکی پەیوەندە بە قاچی ولاخەوە بۆ لەوەڕاندن و شەواژۆ توونەدکردن و شلکردنی لە دەستی خاوەنەکەشیدا مەرگە!.

فَمَـالِي أَرَانِـي وَابْـنَ عَمِّـي مَالِكـاً    مَتَـى أَدْنُ مِنْـهُ يَنْـأَ عَنِّـي وَيَبْعُـدِ
يَلُـومُ وَمَـا أَدْرِي عَـلاَمَ يَلُـومُنِي    كَمَا لاَمَنِي فِي الْحَيِّ قُـرْطُ بْـنُ أَعْبَـدِ
وَأَيْأَسَـنِي مِـنْ كُـلِّ خَيْـرٍ طَلَبْتُـهُ    كَأَنَّـا وَضَـعْنَاهُ إِلَـى رَمْـس مُلْحَـدِ

دەڵێ: تێناگەم بۆچی مالیکی ئامۆزام دوورەپەرێزە لە من، من خۆم نزیك دەکەمەوە، بەڵام ئەو خۆی دوور ئەخاتەوە، ڕووم پێنادات، لۆمەو

سەرزەنشتم دەكات و قسەم پێ دەڵێ و نازانم بۆچی وا دەكات، وەك كاورای بیانیی و دوور لە من كە ناوی قورتی كوڕی ئەعبەدە و هەمیشە لۆمەم دەكات، كەواتە جیاوازی خزم و بیانیی چییە!؟.

داوای هەرچی دەكەم و هەر خواستێكی لێ داوا دەكەم وەك داوا لە مردووی گۆڕستان بكەم بێ وەڵامە، هەرچۆن مردووی ناو گۆڕ وەڵامی نییە ئەم ئامۆزایەشم وەڵامی نییە.

(ئەم شاعیرە زۆر سەرسەریی و بێ بەندوباو بووە و ئامۆزاكەی پیاوی ناو پیاوان بووە، ئامۆژگاری كردووە كە واز لەبەزم و ڕابواردن بهێنێ).

عَلَى غَيْرِ ذَنْبٍ قُلْتُهُ، غَيْرِ أَنَّنِي ... نَشَدْتُ فَلَمْ أُغْفِلْ حَمُولَةَ مَعْبَدِ

وَقَرَّبْتُ بِالْقُرْبَى وَجَدِّكَ إِنَّنِي ... مَتَى يَكُ أَمْرٌ بِلنَّكِيثَةِ أَشْهَدِ

وَإِنْ أُدْعَ فِي الْجُلَّى أَكُنْ مِنْ حُمَاتِهَا ... وَإِنْ يَأْتِكَ الْأَعْدَاءُ بِالْجَهْدِ أَجْهَدِ

دەڵێ: بێ گوناح و بێ تاوان و بێ گوتارێكی بێ جێ كە پێم گوتبێ بەو شێوەیە لەگەڵم خراپەو دوورەپەرێزە، بەڵام من تەنها ئەوەم داوا كرد كە یارمەتیم بدات بۆ گەڕان بەدوای وشترە ونبووەكانی باركێشی مەعبەدی برای شاعیر، كە هەرگیز كەمتەرخەم نەبووم بە گەڕان بەشوێن ئەو وشترانەدا، جگە لەوەش من نازم هەبووە بەسەر مالیكی ئامۆزامدا، (بەبەختت سوێندم ئەی ئامۆزا) هەركات تۆ كاری گەورەت بكەوێتە من، ئامادەم ئەنجامی بدەم، چونكە هەر كات داوام لێ كرابێ بۆ كاری گەورە و قورس، من كوڕی مەیدان بووم و شەڕ دەكەم لەپێناویدا.

وَإِنْ يَقْذِفُوا بالقَقَدْعِ عِرْضَكَ أَسْقِهِمْ بِكَأْسِ حِيَاضِ الْمَوتِ قَبْلَ التَّهَدُّدِ
بِلاَ حَدَثٍ أَحْدَثْتُهُ وَكَمُحْدِثٍ هِجَائِي وَقَذْفِي بِالشَّكَاةِ وَمُطْرَدِي

دەڵێ: ئامۆزا گیان بۆچی وا ئەکەی؟ خۆ من بۆتۆ وانیم، ئەگەر جنێوو قسەی ناشیرینت پێ بڵێن و باسی ناموس و شەرەف بکەن، پێش ئەوەی هەڕەشە بکەم لەگەڵ مەرگ من فنجانەیان بۆ پڕ ئەکەم و دەرخواردیان دەدەم، بەڵام کارو کرداری ئامۆزا دژی من بێ سەبەبە و بێ هۆکارەو هیچ جۆرە خراپەیەکم نەکردووە، بەڵام دژایەتیی و جنێودانی و هەجوی بۆ من و سکاڵای دژی من وەك ئەو کەسەیە کە تاوانێکی گەورەی ئەنجامدابێ‌و شایستەبێ بۆ سزا و تۆڵەو دوورخستنەوە.

فَلَو كَانَ مَولاَيَ امْرَءًا هُوَ غَيْرُهُ لَفَرَّجَ كَرْبِي لأَنْظَرَنِي غَدِي
وَلَكِنَّ مَولاَي امْرُؤٌ هُوَ خَنِقِي عَلَى الشُّكْرِ وَالتَّسْآلِ أَوْ أَنَا مُفْتَدِ

دەڵێ: گوناهم نییە ئەگەر سەردار و سەردەم کەسێك بوایە جگە لەو کە ڕقی لێمە و بەچاوی دووژمنایەتیی تەماشام دەکات، بێگومان کاری بۆ ئاسان دەکردم، یان مۆڵەتی دەدا بۆ سبەی کە چاکبم، بەڵام زۆر بەداخەوەم گەورەو سەرومرم زۆر ڕقی لە منەو ئامۆزایەکی باش نییە، خۆشی لەمن نایە، بە هیچ جۆرێ چ سوپاسی بکەم و چ داوای لێ بووردنی لێ بکەم و چ خۆم بگێڕم لەدەوری و بەقوربانی ببم ڕازی نابێ!.

وَظُلْـمُ ذَوِي القُرْبَـى أَشَـدُّ مَضَاضَـةً عَلَى المَـرْءِ مِـنْ وَقْـعِ الْحُسَـامِ المُهَنَّـدِ
فَـذَرْنِي وَخُلْقِـي" إِنَّنِـي لَـكَ شَـاكِرٌ وَلَـوْ حَـلَّ بَـيْتِي نَائِيـاً عِنْـدَ ضَـرْغَدِ
فَلَوْ شَاءَ رَبِّي كُنْـتُ قَـيسَ بْـنَ خَالِـدٍ وَلَوْ شَاءَ رَبِّي كُنْتُ عَمْـرو بْـنَ مَرْثَـدِ

دەڵێ: ئەم ئازارەی ئامۆزا زۆر نارەحەتم دەکات، چونکە ستەم لە خزم و کەس و کارمەوە کە حەق وایە ستەم لابەرن، ئێش و ئازاری زۆری هەیە و گڕو سووتانی بەژان و بەسۆیە، کەواتە وازم لێ بێنە، خۆم و دۆستم زۆر سوپاست ئەکەم، خودام ئەکرد ماڵم دوور ئەکەوتەوە بۆ شاخی زەرغەم، کە ڕوون و بێ لەوەڕەو کەس لەسەری ناژێ، ئەوە بەخت و ناوچاوی خۆمە، دەنا منیش حەزم ئەکرد قەیسی کوڕی خالید بوومایە، ئەگەر خودا بیویستایە، یان عەمری کوڕی مەسەد دەبووم، کە خاوەن ماڵ و منداڵ.

فَأُلْفِيـتُ ذَا مَـالٍ كَـثِيرٍ، وَعَـادَنِي بَنُـونَ كِـرَامٌ سَـادَةٌ لمسَـوَّدِ
أَنَـا الرَّجُـلُ الضَّـرْبُ الَّـذِي تَعْرِفُونَـهُ خَشَـاشٌ كَـرَأْسِ الْحَيَّـةِ المُتَوَقِّـدِ

دەڵێ: ئەوکاتەی وەك ئەو دوو سەرۆك خێڵە خاوەن سامان و کوڕ بوومایە، دارایی زۆرم هەبوو، هەمیشە کوڕانی وەجاغزادە لەدەورم دەبوون، نەجیب و کوڕە نەجیب و شەریف و کوڕە شەریف دەبووین، بەڵام من کابرایەکی سووکم و چاکم دەناسن کە چەند بلیمەت و زیرەکم و بزێوم، وەك سەری ماری هۆشیار زیرەك و بزێو.

فَآلَيْتُ لاَ يَنْفَكُّ كَشْحِي بِطَانَةً | لِعَضْبٍ رَقِيقِ الشَّفْرَتَيْنِ مُهَنَّدِ
حُسَامٍ إِذَا مَا قُمْتُ مُنْتَصِراً بِهِ | كَفَى الْعَوْدَ مِنْهُ الْبَدْءُ لَيْسَ بِمِعْضَدِ
أَخِي ثِقَةٍ لاَ يَنْثَنِي عَنْ ضَرِيبَةٍ | إِذَا قِيلَ مَهْلاً قَالَ حَاجِزُهُ قَدِي
إِذَا ابْتَدَرَ الْقَوْمُ السِّلاَحَ وَجَدْتَنِي | مَنِيعاً إِذَا بَلَّتْ بِقَائِمِهِ يَدِي

لێرەوە دەكەوێتە باسی ئازایەتیی خۆی و نەبەردیی دەست و مەچەك‌و شمشێرەكەی.

دەڵێ: سوێندم خواردووە هەرگیز شمشێر لە قەوی خۆم ناكەمەوەو هەمیشە لەگەڵمایە، كام چەكی سەردەمە؟ ئەو شیرەی كە لە كەمەرم بەستوە تیژە، بڕندەیە، هەردوو دەمی تیژ و باریكە و لە هیندوستان دروستكراوە، ئەوەندە تیژو بڕندەیە ئەگەر جارێك بەكارم هێنا پێویستم بە دووبارەكردنەوەی نییە و كاری خۆی كردووە، كول و كۆڵەوارو دارنەبڕ نییە، برای متمانەو جێگەی باوەڕە، هەرگیز لار نابێ و دەمخوار نابێ و ناچەمێتەوە بە وەشاندن و كار پێ كردن، ئەوەندە بەكارە ئەگەر ئەو زەلامەی بۆی بەكار هاتووە، گوتی: بەسە دووبارەی مەكەرەوە، تیژییەكەی لەوەلامدا دەڵێ: كاری خۆم كردووەو پێویست ناكات بە دووبارە!، خۆ ئەگەر خەڵك دەستی دایە چەك و ئامادەی نەبەردیی بوون ئەتۆ من دەبینی بە گورجیی دەستم بە مشتووی شمشێرەكەمەوەیە و ئامادەم!.

وَبَـرْكٍ هُجُـودٍ قَـدْ أَثَـارَتْ مَخَـافَتِي مَنِيعـاً إِذَا بَلَّـتْ بِقَائِمِـهِ يَـدِي
فَمَـرَّتْ كَهَـاةٌ ذَاتْ خَيْـفٍ جُلاَلَـةٌ عَقِيلَـةُ شَـيْخٍ كَالْوَبِيـلِ يَلَنْـدَدِ
يَقُـولُ وَقَـدْ تَـرَّ الْـوَظِيُ وَسَـاقُهَا: أَلَسْـتَ تَـرَى أَنْ قَـدْ أَتَيْـتَ بِمُؤْيَـدِ؟
وَقَـال: أَلاَ مَـاذَا تَـرَوْنَ بِشَـارِبٍ شَـدِيدٍ عَلَيْنَـا بَغْيُـهُ مُتَعَمِّـدِ؟

دەڵێ: بە ڕادەیەك ترس هەیە لەدەست وەشاندنم كە بڕۆم بۆ ناو گەلەوشترێك كە هەندێك چۆكى داداوەو پاڵكەوتووەو هەندێك خەوتووە، كە چاویان بە شمشێرى ڕووتم دەكەوێ هەموو لە پەچەكەیاندا ڕادەپەڕن و ترسیان هەیە سەریان ببڕم، ئا لەم كاتەدا بەلاما دەرچوو وشترێكى گەورەو زەبەلاح، پێستى گوانى شۆڕبوبووە، لەدەرماڵەى پیرێكى بە ساڵاچوو دەچوو، بەڵام بە تواناو توند و ئازاو شەڕانیى، هاوارى كرد كە چاوى كەوت بە ساق و سمى كە بەشمشێر جیام كردەوە، وتى: بۆچى ئەو كارەت كرد!، ئیشێكى خراپت كرد و ڕووى كردە خەڵكەكە و وتى: تەماشا بكەن ئەم شەرابخۆرە چى ئەكات!، چۆن ماڵمان وێران ئەكات و بە ئارەزوو ئەو كارە ئەكات و ترسى كەمى نییەو بەخۆمى گوت كارێكى گەورەو ناپەسەندت كرد، كە ئەو وشترەت سەربڕى، ئەوجا وتى: ئەوە كارى ئەم سەرخۆشەیە و خراپەى زۆرە و دەستدرێژە بە سەرماندا.

فَقَـالَ: ذَرُوهُ إِنَّمَـا نَفْعُهَـا لَـهُ وَإِلاَّ تَـرُدُّوا قَاصِـيَ البَـرْكِ يَـزْدَدِ

ئەوجا پیاوە پیرەكەی باوكی تورفە ڕویكردە خەڵكەكە، وتی: لێگەڕێن با هەر ئەوەی كوشتبێ و بەز و سوودی هەیە بۆی، دەنا ئەگەر ئەوانەش كە دەرچوون بگێڕنەوە زیاتر سەردەبڕێ.

فَظَلَّ الْإِمَاءُ يَمْتَلِلْنَ حُوَارَهَا وَيُسْعَى عَلَيْنَا بالسَّدِيفِ الْمُسَرْهَدِ
فَإِنْ مُتُّ فَانْعَيْنِي بِمَا أَنَا أَهْلُهُ وَشُقِّي عَلَيَّ الْجَيْبَ يَا ابْنَةَ مَعْبَدِ
وَلاَ تَجْعَلِينِي كَامْرِىءٍ لَيْسَ هَمُّهُ كَهَمِّي، وَلاَ يُغْنِي غَنَائِي وَمَشْهَدِي
بَطِيءٍ عَنِ الْجُلَّى، سَرِيعٍ إِلَى الْخَنَا ذَلِيلٍ بِأَجْمَاعِ الرِّجَالِ مُلَهَّدِ

دەڵێ: كە ئەو وشترەی سەربڕی كەنیزەك و كارەكەر دەستیانكرد بە گۆشت برژاندن، لەناو ژیلەمۆی ئاگردانی پڕ لە نانی بنارگی و شیشی گۆشتی نەرمەو توونەدو دووگی قەڵەویان بۆ ئێمەش هێنا، ئەوجا من گوتم: ئەگەر مردم هەواڵی مەرگم ڕابگەیەنن بەو شێوەی شایستەم و كۆڕی شیوەنم بۆ بگێڕن و یەخەی خۆتان دادڕن، ئەی كچی مەعبەد، كێ برازای شاعیرە؟، بەڵام وەك ئەو كاورایەم تەماشا مەكەن كە خەمی وەك خەمی من نەبووە، وەك من نەبووە لە ئاشتی و شەڕدا و لە خۆشی و ناخۆشیدا، ئەو كاورایە تەمەڵ و سست بووە لەكاری بەرز و گەورە و گرنگ و هەمیشە ئارەزووی لەكاری چەپەڵ و گەندەڵ بوومو سەرشۆڕ و ملكەچ بووە لە كۆڕی زۆرانبازیی پیاوان كە بە مستەكۆڵەو سیخوڕ هێرشبەریان لە خۆیان دوور خستووەتەوە، ئەو تاوانەی كە دوای مردن خەڵك شین و گریان و وایشێرە بكەن ئێستەش هەر ماوە.

فَلَوْ كُنْتُ وَغْلاً فِي الرِّجَالِ لضَرَّنِي عَدَاوَةُ ذِي الأَصْحَابِ وَالْمُتَوَحِّدِ
وَلَكِنْ نَفَى عَنِّي الأَعَادِيَّ جُرْأَتِي عَلَيْهِمْ وَإِقْدَامِي وَصِدْقِي وَمَحْتِدِي
لَعُمْرُكَ مَا أَمْرِي عَلَيَّ بِغُمَّةٍ نَهَارِي، وَلاَ لَيْلِي عَلَيَّ بِسَرْمَدِ
وَيَومٍ حَبَسْتُ النَّفْسَ عِنْدَ عِرَاكِهِ حِفَاظاً عَلَى عَوْرَاتِهِ وَالتَّهَدُّدِ
عَلَى مَوْطِنٍ يَخْشَى الْفَتَى حِنْدَهُ الرَّدَى مَتَى تَعْتَرِكْ فِيهِ الْفَرَائِصُ تُرْعَدِ

دەڵێ: حەق وایە کۆتەڵ و شینم گەرم و گوڕ بێ، چونکە کابرایەکی مژمۆڵ و گەمژە و بێ هێز نەبووم لەناو پیاوان و هاوچەشنەکانی خۆم، ئەگەر وابومایە دەبوو زۆر زیان لێ کەوتوو بوومایە، لە دوژمنایەتیی ئەوانەی کە خاوەن هۆزو خێڵ و جەنگاوەرن و خاوەن دەسەڵاتی تاکن لەشوێنی خۆیاندا، بەڵام ئازایەتیی خۆم ئەو دەسەڵاتدارانەی لەکۆڵ کردوومەتەوە، چونکە بۆیان دەرکەوتووە هێرش و پەلامار و دەستوەشاندنم و نەژاد و ڕەسەنیم لەجەنگدا چۆنە، سوێندم بە گیان و تەمەنی تۆ کاروباری من سەرپۆش و شاردنەوەی نییە و زۆر خەم و پەژارەی ژیانم نییە و سەرم لێ نەشێواوە و ڕۆژ و شەوم درێژ نییە، بە ڕۆژ و بە شەو ئاگادارم، کەس ناتوانێ شەوبدا بەسەرمدا، بە ڕۆژ کاری خۆم دەکەم و زۆر جاریش خۆم دەگرم لە شەڕ و ئاژاوەو کوشتارم بەلاوە ناشیرینە و خۆم دەبوێرم، لەبەر ئەوەی تووشی بەدناویی نەبم و خەڵك بەخۆڕایی نەکوژم، لە گۆڕەپانی قسەو کوشتارگەدا ئادەم کە کوڕی ئازاو دڵقایم دڵی دەلەرزێ لەگەرمەی کوشتار و شەڕە شمشێر و ڕم و بگرەو بەردەدا.

وَاصْـفَرَ مَضْـبُوحٍ نَظَـرْتُ حِـوَارَهُ    عَلَى النَّـارِ وَاسْـتَوْدَعْتُهُ كَـفَّ مُجْمِـدِ
سَتُبْدِي لَكَ الأَيَّـامُ مَـا كُنْـتَ جَـاهِلاً    وَيَأْتِيـكَ بِالْأَخْبَـارِ مَـنْ لَـمْ تُـزَوِّدِ
وَيَأْتِيـكَ بالأَنْبَـاءِ مَـنْ لَـمْ تَبِـعْ لَـهُ    بَتَاتاً، وَلَـمْ تَضْـرِبْ لَـهُ وَقْـتَ مَوْعِـدِ

دەڵێ: من هەمیشە دڵفراوان و بەخشندە بووم، تا زۆر جار وابووە كە پیاڵەو پەرداخە زەرد ڕەنگەكەم كە ئاگر ڕەشی كردووەتەوەو لەبەر زۆر بەكارهێنانی بۆ قاوەخواردنەوەی ڕۆژانی سەخت و سەرما، لەسەر ئاگرم داناوەو داومە بەدەستی ئەوانەی كە سەبریان كەمەو بە هەردوو دەست پەرداخەكەم لێ وەردەگرێ، ئەوجا ڕوو ئەكاتە گوێبیستی خۆی و دەڵێ: زەمان هەموو نهێنیی و دەنگ و باست بۆ ڕوون دەكاتەوە، كە نەتزانیوە، ئەو كەسە هەواڵت بۆ دێنێ كە تۆ ئەسبابی سەفەرت بۆ ئامادە نەكردووە.
(ئەوە پێشبینی شاعیرە كە ئەمڕۆ نهێنیی نەماوەو هەموو هەواڵ و دەنگ و باس لە چركەساتێكدا گوێبیستی دەبین، جیهان بووەتە گوندێكی بچووك!).

لَعَمْـرُكَ مَـا الأَيَّـامُ إِلاَّ مُعَـارَةٌ    فَمَـا اسْـطَعْتَ مِـنْ مَعْرُوفِهَـا فَتَـزَوَّدِ
عِـنِ المَـرْءِ لاَ تَسْـأَلْ وَأَبْصِـرْ قَرِينَـهُ    فَـإِنَّ الْقَـرِينَ بِالْمُقَـارِنِ يَقْتَـدِي

بە گیانی تۆ برای بەڕێز، ئەو ڕۆژ و ژیان و ژیارە هەموو خوازراوەو ئەمانەتە و ماڵ و حاڵی خۆت نییە، كەواتە چەندە دەتوانی چاكەو پیاوەتیی و میواندۆستیی و داخستنی سفرەو خوان بۆ خەڵك ئەنجام بدە و ئەگەر ویستت یەكێك بناسی لەخۆی مەپرسە، بزانە هاوڕێی كێیە و

لەگەڵ کێ دەژی؟، چونکە هاوڕێ بە هاوڕێ و هاوژین دەناسرێ و لاسایی دەکاتەوەو ڕەوشت وەك درم وایە لە کەسێکەوە بۆ کەسێك تەشەنە دەکات.

(خوێنەری بەڕێز، ئەوە کۆتا بەیتی ئەم شاعیرە لاوەیە، بە گەنجی کوژراوە و دەرکراوە، لە لایەن دەسەڵاتی سادەو ساکاری عەرەبەوە، پێش هاتنی ئیسلام لە نیوە دوورگەی عەرەب و لە نزیك کەنداوی عەرەبدا، کە ئەو کاتە بە کەنداوی فارس ناسراو بووە، کە باسی هەموو شت دەکات و لە کۆمەڵناسیی و دەروونناسیدا پسپۆڕە).

# زوهەیری کوڕی ئەبی سولما

**٥٣٠-٦٢٧ زاینی**

زوهەیری کوڕی ئەبی سولما کوڕی ڕەباحی مەزنی، لە بنەماڵەیەکی شیعریی و وێژەیی و شیعردۆستە و لە خێڵی غەتەفان ژیاوە، پەیوەندی کردووە بە (هەرەم)ی کوڕی بەنان و حەرسی کوڕی عەوف و ئەم چامە هەڵواسراوەی بۆ ئەو دوو میرەی عەرەب داناوە، کە لە ناوبژیوانی دوو هۆزی عەبس و زوبیاندا کەماوەیەك یەکتریان کوشتووە، ئەم شاعیرە پیاوێکی ژیرو خاوەن ئەزموون و ئاشتیدۆست بووەو دژی بتپەرستیی و هەندێ ئاکاری نەفامیی بووە، شیعرەکانی ئاوێنەی ژیانی خۆیەتی، ڕاست بتەوێ کارامەیی و ژیریی لێ دەچۆڕێ و حەزی لە حیکمەت و ژیریی بووەو ڕستەو دەستەواژەی کورت و پڕ مانای بەکارهێناوەو حەزی نەبووە لە بەرکاهێنانی وشەی ڕەق و نامۆ و کۆهەڵگری مانای دژ بەیەکدا، لەبەر ئەوەیە لە چینی یەکەمی وێژەی بەناو نەفامیی دادەنرێ، لە کۆنەوە جێگەی بایەخی ڕۆژهەڵاتناسان بووە، بە چاپکردن و تەرجەمەکردنی پەنجا و نۆ بەیت باسی هەوارگەو دڵدار و کۆچ و مەدح و سەناو دڵسافیی و زیانی جەنگ و چاکەی ئاشتی دەکات.

أَمِـنْ أُمِّ أَوْفَـى دِمْنَـةٌ لَمْ تَكَلَّـمِ     بِحَوْمَانَـةِ الـدَّرَّاجِ فَـالْمُتَثَلَّـمِ
دِيَـارٌ لَهَـا بِـالرَّقْمَتَيْنِ كَأَنَّهَـا     مَرَاجِـعُ وَشْـمٍ فِـي نَوَاشِـرِ مِعْصَـمِ

(ئوم ئەوفا) ناوی نازداری زوهەیرە بە لاوی، ئەوجا پرسیار ئەكات ئەو هەوارە چۆڵە بەشێكە لەبەرماڵ و سەنێرگەو شوێن و خۆڵەپۆتەی ماڵی ئوم ئەوفا، خۆی قسە ناكات كە كێ جۆگەی بەرماڵی جۆماڵ كردووە و كێ درەختەكانی ناشتووەو كێ بەری درەختەكانی چنیوەتەوە؟، كەس وەڵامی نییە تەنها شوێنەوارەكانی گردی حەومانەی دەڕاج و موتەسەلیم، ئەو شوێنە جێگەماڵی خۆشەویستەكەیە لە (ڕەقمەتەین) كە هەوارگەی هۆزی دڵدارە شوێنەواری هەرماوە، وەك دووبارە كوتانی خاڵ لەسەر مەچەك و قۆڵ و باسك و شوێن خرخاڵ و بازنە، ئەو خۆڵەكەوەی لەو دەشتە لماوییە سافەدا دیارە وەك مەچەكی پڕ لە خاڵ و بازنەی ئوم ئەوفایە!.

بِهَـا الْعِـينُ وَالأَرْءَامُ يَمْشِـينَ خِلْفَـةً     وَأَطْلاَؤُهَـا يَنْهَضْـنَ مِـنْ كُـلِّ مَجْثَمِ

دەڵێ: حەیوانەكێویی چاوگەورە و ئاسكی چاوڕەش تەراتێن دەكەن تێیدا، بەدوای دایكەكەیاندا دەڕۆن، كارمامزە بچووكەكان پۆل پۆل بە ئارامیی لە پەچەكاندا بەرەو چراگەو لەوەڕگە دەڕۆن، هەندێك بۆ پێشەوەو هەندێك بۆ دواوەو هەندێك بەرز دەبنەوەو هەندێك دێنە خوارەوە.

وَقَفْتُ بِهَـا مِـنْ بعْـدِ عِشْـرِينَ حِجَّـةً     فَلأيـاً عَرَفْـتُ الـدَّارَ بَعْـدَ تَـوَهُّمِ

أَثَـافِيَّ سُـفْعاً فِـي مُعَـرَّسِ مِرْجَـلٍ     وَنُؤْيـاً كَجِـذْمِ الْحَـوْضِ لَـمْ يَتَـثَلَّمِ

دەڵێ: وەستام لەو هەوارە كۆنەی پار، پاش بیست ساڵ، دەرەنگ ماڵەكەم دۆزییەوە و پاش بیرو خەیاڵ و یادەوەریی كۆن ئەو كات زانیم ئەوە

شوێنەواری ماڵە بابی یارە، بەچیدا زانیم بەبەردە ڕەشەکانی سێ کوچکەی ماڵە گەورەو شوێندانانی قازانە گەورەکان و شوێن پارگێنی پشت دەوارەکە بۆ لادانی ئاوی باران کە وەك دیواری گۆلاویی حەوزی ئاوە کە سەرەکەی نەمابێ و بەلام درزی نەبردبێ.

فَلَمَّا عَرَفْتُ الدَّارَ قُلْتُ لِرَبْعِهَا: أَلاَ انْعِمْ صَبَاحاً أَيُّهَا الرَّبْعُ وَسْلَمِ
تَبَصَّرْ خَلِيلِي هَلْ تَرَى مِنْ ظَعَائِنٍ تَحَمَّلْنَ بِالْعَلْيَاءِ مِنْ فَوْقِ جُرْثُمِ
جَعَلْنَ الْقَنَانَ عَنْ يَمِينٍ وَحَزْنَهُ وَكَمْ بِالْقَنَانِ مِنْ مُحِلٍّ وَمُحْرِمِ؟

دەڵێ: کە جێگەو هەوارەکەم دۆزییەوەو ناسیم، گوتم بە مەنزلی دۆست: ڕۆژباش، بێوەی بی و لەخۆشیدا بژی و هەر بە جوانیی بمێنی!.

هاوڕێ!، جوان تەماشای بکە و بڕوانەو بزانە کەژاوەی یار دەبینی کە لە سەربارەوە بۆلایەك بڕۆن لە نزیك شاری (عەلیا) و (ئاوی جورسوم)، کە خێڵی ئەسەد لەسەری دادەبەزن و چیای فەنانیان کردووە بە هەوارگە، لەدەستەڕاستەوەو بەردەلان و ڕەقانەکەیان کردووە بە ماڵ و بزانە براگیان کێ لەوێیە؟، دۆستە یان دوژمن؟، لە مانگەکانی حەرامە؟، یان مانگی حەلال؟، (چونکە شاعیر چاوی بە فرمێسك و گریانە)، بۆیە بەهاوەڵەکەی دەڵێ: ئا تەماشایەکم بۆ بکەو بزانە کەس لەوێ ماوە!.

وَعَالَيْنَ أَنْمَاطاً عِتَاقاً وَكِلَّةً وِرَادَ الْحَوَاشِي لَوْنُهَا لَوْنُ عَنْدَمِ
ظَهَرْنَ مِنَ السُّوبَانِ، ثُمَّ جَزَعْنَهُ عَلَى كُلِّ قَيْنِيٍّ قَشِيبٍ وَمُفْأَمِ
وَوَرَّكْنَ فِي السُّوبَانِ يَعْلُونَ مَتْنَهُ عَلَيْهِنَّ دَلُّ النَّاعِمِ الْمُتَنَعِّمِ

دەڵێ: ئەو نازدارانەی ناو كەژاوەكە پەردەی جوانیان داوە بەسەر بارەكانداو لەسەر وشترگەلێك باركراون كە ڕەسەن و بەئەزموون و شارەزان و ڕەنگیان سوورە، وەك دەڕوانی، وەك درەختی بەقم، یان تری مارانە، كە زۆر سوورە وەك دەستی لەخەنە گیراو، ئەو ناسك و نازدارانە لە شیووی سووباتەوە دەركەوتن و لەوێوە دەرچوون، خورج و هۆڕو بارگەیان داپۆشیوە، بە پەردەی سوور و دەڵپ و دەرەدامانە، ئەوجا لایان داوەتەوە سووبانە، بە سواری ئەو وشترانە بۆ بەرزایی، بەڵام بەنازو خەمزەی كیژۆڵەی نەرم و ناسك و نازپەروەرو نازدار.

(ئەوە وەسفی خەیاڵی كاتی لاوی شاعیر بووە، پێش بیست ساڵ بەر لەم كاتە).

كَأَنَّ فُتَاتَ الْعِهْنِ فِي كُلِّ مَنْزِلٍ   نَزَلْنَ بِهِ حَبُّ الْفَنَا لَمْ يُحَطَّمِ
بَكَرْنَ كُوراً وَاسْتَحَرْنَ بِسُحْرَةٍ   فَهُنَّ وَوَادِي الرَّسِّ كَالْيَدِ لِلْفَمِ
فَلَمَّا وَرَدْنَ الْمَاءَ زُرْقاً جِمَامُهُ   وَضَعْنَ عِصِيَّ الحَاضِرِ الْمُتَخَيِّمِ

دەڵێ: لەو شوێنانەی كە لایانداوەو پشوویانداوە، یان بۆ لەوەڕخۆری ئاژەڵەكەیان وردە پەتك و خوری و موو لكاوە بە بارو كەژاوەكانیانەوە، ئەڵێی بەری میوە ڕێوییە كە نە شكاوەو ڕەنگی سوورە و بە ساقی ماوەتەوە، ئەم كۆچ و بارەش سپێدەیەكی زۆر زۆر نزیك لە پارشێو نزیك بوونەتەوە لە شیوی (ڕەس) كە ئاو و باخی خێڵی ئەسەدە، وەك دەست لە دەمەوە نزیكە و لەسەر ئەو ئاو و حەوزە بارگەیان خستووە، ئاوێكی ڕوون و شینە، وەك ئاسمان ساف و پاك و لە نزیك ئەستێڵەكە لایانداوە، چێوی

پشوودانیان داناوە، وەك خاوەن ماڵ بێ ترس و دڵەڕاوكێ، كە ئەوانە نیشانەی دەسەڵات و شكۆ و جێگەدارییە.

وَفِـيهِنَّ مَلْهًـى لِلَّطِيـفِ وَمَنْظَـرٌ أَنِيـقٌ لِعَـيْنِ النَّـاظِرِ المُتَوَسِّـمِ
سَعَى سَاعِيا غَـيْظِ بْـنِ مُـرَّةَ بَعْـدَمَا تَبَـزَّلَ مَـا بَـيْنَ العَشِـيرَةِ بالـدَّمِ
فَأَقْسَـمْتُ بِالْبَيْـتِ الَّـذِي طَـافَ حَوْلَهُ رِجَالٌ بَنَوْهُ مِنْ قُـرَيْشٍ وَجُـرْهُمِ

دەڵێ: ئەم كیژە ناسك و نازدارانە بێ دۆست و خۆشەویست نین، بەڵكو لاوی ناسك و نەرم و دڵئارا هەیە كە سەرسام بێ بە جوانیی و دیمەن و ژیان لە گەڵیاندا و زۆر بە وردیی سۆزیان دەداتێ و بە هەموو شێوەیەك نازیان قەبووڵ ئەكات.

(ئەوجا شاعیر باسەكە دەگۆڕێ و دێتە باسی دوو سەرۆك كۆمار، دوو ئاشتیخواز، كە حارسی كوڕی عەوف و هەرەمی كوڕی سەنانە، كە دەیانەوێ خوێنی دوو عەشیرەت لەسەر خۆیان دابنێن و ئاشتی لەناو ئەو دوو هۆزەدا دابنێن، كە عەیس و زەبیانە، بە بەخشندەیی ئەو جۆگە خوێنەی كە ڕژاوە وشك بكەنەوە).

سوێندم بەو ماڵەی كە خەڵك بەدەوریدا دەسوڕێنەوەو تەوافی دەكەن و قورەیش و جورهوم درووستیانكردووە بۆ خوداپەرستیی و ئاشتیی و برایەتیی.

(ئەم دوو پیاوە بەڕاستی شایستەی هەموو مەدح و سەنایەكن و شاعیر ئەم چامەی بۆ ئەو مەبەستە داناوە، كە بەڕاستی ئەم دوو پیاوە شایستەن).

يَميناً لَنِعْمَ السَّيِّدَانِ وُجِدْتُمَا عَلَى كُلِّ حَالٍ مِنْ سَحِيلٍ وَمُبْرَمِ
تَدَارَكْتُمَا عَبْساً وَذُبْيَانَ بَعْدَمَا تَفَانُوْا وَدَقُّوا بَيْنَهُمْ عِطْرَ مَنْشَمِ
وَقَدْ قُلْتُمَا: إِنْ نُدْرِكِ السِّلْمَ وَاسِعاً بِمَالٍ وَمَعْرُوفٍ مِنَ الْقَوْلِ نَسْلَمِ

دەڵێ: ئەم دووگەورەیە، ئەم دوو هێژاو ڕێزدارە، بە ڕاستی پیاوی چاك و پاك و باشن بۆ هەموو ماڵێك، بۆ هەموو كارێك، بۆ هەموو دەستگیرێك، چ ئاسان چ قورس چ یەكتاڵ چ دووتاڵ و بادراو، ئێوە ئەی دوو سەركردەو سەرەككۆمار و سەرۆكخێڵ، گەیشتنە فریای هۆزی عەبس و هۆزی زوبیان، كە هەردوولایان یەكتریان قڕكردبوو و دەستیان جولاوە بۆ خوێنی یەكتر، وەك ئەو مرۆڤانە دەچوونە لای مەنشەمی عەتار بۆ كڕینی بۆن و كافور بۆ مردووەكانیان كە ناوی بە شووم دەركردبوو.

ئێوە بوون فەرمووتان: ئەگەر ئاشتی بەماڵ و سامان و قسەی خێر دەستكەوێ، ئێمە ئامادەین بۆ هەردوولا ماڵ و سامان و ئاشتیی و تەبایی بە دانووستان.

(ئەوە یەكەم هەنگاوی عەرەبە بۆ یەكێتی و ڕێكخستنی ماڵی نەتەوە، دوور لە خوساتی داگیركەری ڕۆم و فارس، بەڵام ئەمڕۆ زۆر دوورن لەم حیكمەتە!).

فَأَصْبَحْتُمَا مِنْهَا عَلَى خَيْرِ مَوْطِنٍ بَعِيدَيْنِ فِيهَا مِنْ عُقُوقٍ وَمَأْثَمِ
عَظِيمَيْنِ فِي عَلْيَا مَعَدٍّ هُدِيتُمَا وَمَنْ يَسْتَبِحْ كَنْزاً مِنَ الْمَجْدِ يُعْظِمِ

دەڵێ: ئێوە بە ڕاستیی جێگەی شایستەتان بۆ خۆتان دانا، کە نەك هەر دوور لە شەڕ و خوێنڕشتن و ناکۆکیی و دووبەرەکیی و شەڕی براکوژیی، بەڵکو دوور لە گوناح و تاوان و بڕینی پەتی هاوزمانیی و هاونەتەوەیی و هاونیشتمانیی، بە ڕاستی ئێوە گەورەن، سەرۆکخێڵ و خەڵك و دۆستی بەئەمەکی باوك و باپیرتان کە مەعدی باپیری عەرەبە، یاخود وا هەمیشە لەسەر ئەم ڕێگەبن و نەوە پاش نەوە شوێنکەوتووی ئێوەبێ، چونکە هەر کەس ماڵ و سامان و دارایی و ئابووریی لەژێر دەست بوو خزمەتی پێ کردو بەخشی بۆ خۆشیی و بەختیاریی میللەتەکەی، ئەوە ڕابەری ڕاستەو گەورەی دڵسۆز و پێشەوایە!.

(بەڵام مەخابن عەرەب پەیڕەوی نەکرد!).

| | |
|---|---|
| وَأَصْبَحَ يُحْدَى فِيهِمُ مِنْ تِلَادِكُمْ | مَغَانِمُ شَتَّى مِنْ إِفَالٍ مُزَنَّمِ |
| تُعَفَّى الكُلُومِ بِالمِئِينَ، فَأَصْبَحَتْ | يَنَجِّمُهَا مَنْ لَيْسَ فِيهَا بِمُجْرِمِ |
| يُنَجِّمُهَا قَوْمٌ لِقَوْمٍ غَرَامَةً | وَلَمْ يُهَرِيقُوا بَيْنَهُمْ مِلْءَ مِحْجَمِ |

دەڵێ: ئەوەیە بەخشندەیی، ئەوەیە نەتەوەدۆستیی، ئەوەیە سەرورەیی کە زینەماڵی خۆی دەبەخشێ و میرات و پاشماوەی بنەماڵەکەی لە بژاردنی خوێن و تۆڵەی خەڵکی تر چ ئەوانەی خۆتان وەدەستان هێناوە لە وشتری سەرەو چ بەچکە و بێچووی تازەبوو، کە نیشانەی ڕەسەنی لێدراوە، ئەوەیە کاری گەورە، کە زام و خوێن بە سەدان ماڵ و سامان سارێژ بکرێ لە کێوە؟، لەو کەسەوە لە دەستی نەچووە بە خوێنەکەدا و تاوانی نەکردووە، بەڵکو تەنها لە پیاوەتیی و ئاشتیی و تەبایی و پێکەوە

ژیانـدا ئـەوكارە دەكـات، ئـەوە مـاڵ و سـامانە لـە خێڵـەوە بـۆ خێـڵ، لـە هۆزێكەوە بۆ هـۆزێكی تـر چوونەتە ژێـر باری و بـژاردنیی بـەبێ ئـەوەی پڕی كەڵەشاخێك خوێن لە دەستی ئەم سەرومرانە ڕژابێ.

(بـە ڕاسـتیی ئـەوە وانەیـەكی بـە نرخـە بـۆ عـەرەب و بـۆ كـورد و بـۆ هەموو كەس پێش پازدە سەدە ئەم كارە كراوە).

أَلاَ أَبْلِـغِ الْـأَحْلاَفَ عَنِّـي رِسَـالَةً ... وَذُبْيَـانَ هَـلْ أَقْسَـمْتُمُ كُـلَّ مُقْسَـمِ

فَـلاَ تَكْـتُمُنَّ اللهَ مَـا فِي صُـدُورِكُمْ ... لِيَخْفَـى، وَمَهْمَـا يُكْـتَمِ اللهُ يَعْلَـمِ

يُـؤَخَّرْ فَيُوضَـعْ فِـي كِتَـاب فَيُـدَّخَرْ ... لِيَـوْمِ الْحِسَـابِ، أَوْ يُعَجَّـلْ فَيُـنْقَمِ

وَمَـا الحَـرْبُ إِلاَّ مَـا عَلِمْـتُمْ وَذُقْـتُمُ ... وَمَـا هُـوَ عَنْهَـا بِالْحَـدِيثِ الْمُـرَجَّمِ

(ئەو شاعیرە ڕۆشنبیرێكی ئاسایی و شـاعیرێكی سـادە نییـە و بـڕوای بـە خـوداو ڕۆژی زیندووبوونـەوە هەیـە و دۆسـتی ئاشـتیی و تـەبایی و فەرمانڕەوایی عەرەبە لەناو خۆیاندا بۆ ئەوەی چیتر پیاوی ڕۆم و عەجەم نەبن)

دەڵێ: خەڵكینە! ئـەی ئەوانـەی حـەزتان لـە ئاشـتییە، نامەیـەكم هەیـە بـۆم بگەیەننـە هـۆزی ئەسـەدو غەتـەفان، كـە سـوێندخواردنە و هـەمان نامەش بگاتە دەبیان، ئێوە سوێندی قورستان خواردووە كە لەمەولا برامن و ئاشتبن، كار بكەن بە سوێندەكەتان و هیـچ لـە خـودا مەشارنەوە، خـودا ئاگـادارە بەسـەر دڵ و دەروون و شـتی لێ وننـابێ و هەرچـی لـە خـودا بشارێتەوە پێی دەزانێ و ئاگادارە بەسەر هەموو نادیـارو نهێنییەكدا، ئـەو ئاشـتییە تێـك مـەدەن، بـەدەم ئاشـتیی بكـەن و لـە پـەناوە غـەدر بكـەن،

چونکە خودا بەو کارە دەزانێ و هەڵی دەگرێ بۆ ڕۆژی زیندووبوونـەوە و لە نامەی ئـەعمالتان دەینوسێ و ڕۆژی دادگایی و لێپرسینەوە دێت، یـان هەر لەم دنیای ڕۆشـنە تۆڵـەی غـەدر دەکاتـەوە، جـەنگ ئاسـانە و سوودی نییـەو خـوێن و کوشـتار لـە هـەردوولا دەبـێ، خۆتـان ئـەزانن ئـازارو ئەشکەنجەی شەڕ چییە، شەڕ تۆقانەو پێشبینی نییەو تەنها گوتارو وشـەو ڕستەی بریقەدار نییە، شەڕ شەڕە!.

مَتَـى تَبْعَثُوهَـا تَبْعَثُوهَـا ذَمِيمَـةً ... وَتَضْـرَ – إِذَا ضَـرَّيْتُمُوهَا– فَتُضْـرَمِ
فَتَعْـرُكُكُمْ عَـرْكَ الرَّحَـى بِثِفَالِهَـا ... وَتَلْقَـحْ كِشَـافاً، ثُـمَّ تُنْـتَجْ فَتُتْـئِمِ
فَتُنْـتَجْ لَكُـمْ غِلْمَـانَ أَشْـأَمَ كُلُّهُـمْ ... كَـأَحْمَرِ عَـادٍ، ثُـمَّ تُرْضِـعْ فَـتَفْطِمِ

(ئـەوەی بـە زمـانی ئـەمڕۆ ئـەم شـیعرە بخوێنێتـەوە، دەزانـێ گـەلانی مێـژوو پیـاوی مـەردو شـاعیری کـەڵ و ڕۆشـنبیری ئاشـتیپەروەرو پیـاوی خاوەن پەیام هەیە)

دەڵـێ: شـەڕ ئەوەیـە کـە ئێـوە چەشـتوتانەو دەزانـن ئاکـام و ئاکـار و ئـەنجامی چییە، ئەگـەر دووبـارەی بکەنـەوە کـارێکی چـەپەڵ و پۆخـڵ و قێزەون دەکەن، ئەگەر ئێوە سووربن لە سەر دەنگ و براکوژیی و دووبـارە هەڵیگیرسێننەوە، ئەوجار کڵپەو و گڕی هەمووتان دەسوتێنێ و ئـەتانهاڕێ و وردو خاشـتان ئـەکات، وەك دانـەی نـاو دەسـاڕ و ئـاش، بـەخۆتان و بـەو چـەرمەی لـەژێر دەسـاڕەکە دانـراوەو هـەموو وەرزێـك ئاوسـتان دەکـات و دەزێـن و دووانـەتان دەبـێ و بـۆ شـەڕ پـێ ئـەکات، ئـەو شـەڕە بەرهـەمی چەپەڵی ئەوەیە کۆمەڵە گەنجێ لەدایك دەبێ وەك سوورەی عادو سـەموود

كـه وشـتركەی پێغەمبـەری سـەربڕی و زوو شـیر ئـەخواو زوو لـه شـیر دەبڕێتـەوە، زوو دەبـێ بـه خـۆراكی شـەڕ، كـه وەجاخكوێریی لـه منـداڵی شووم باشترە، كوڕی نەگبەت و شەڕانیی باش نییه.

فَتُغْلِـلْ لَكُــمْ مَــا لاَ تُغِــلُّ لأَهْلِهَــا قُــرًى بِــالْعِرَاقِ مِــنْ قَفِيــزٍ وَدِرْهَــمِ
لِحَــيِّ حِــلاَلٍ يَعْصِــمُ النَّــاسَ أَمْــرُهُمْ إِذَا طَرَقَــتْ إِحْــدَى اللَّيَــالِي بِمُعْظَــمِ
كِرَامٍ" فَـلاَ ذُو الضَّـغْنِ يُـدْرِكُ تَبْلَـهُ، وَلاَ الْجَـارِمُ الْجَـانِي عَلَـيْهِمْ بِمُسْـلَمِ

دەڵێ: ئەو جەنگ و خوێنڕشتنه جگه لەو بەرهەمـه خراپانـەی باسـم كرد هەندێ دەرئەنجامی خراپتری هەیه، وەك: ئەو شـەڕە چۆن جوتیـاری عێـراق بەرهـەمی كشـتوكاڵ لـه گونـدەكان دەدورنـەوە پـڕ بـه خـەروار و كەوبێژنگ و خۆیان تێـر دەكەن لـه درهـەم و دینـار و دەغڵودان، ئێـوەش ئەوەندە دروێنه له لەش و گیـانی كوڕەكانتـان دەكـەن، (ئـەوە جۆرێكـه لـه گاڵتـەكردن بـه شـەڕكەر و ئاژاوەخواز)، ئـەوجا شـاعیر دەڵـێ: ئـەم گـەورە مەردانه كەی هەولّی ئاشتی دەدەن زیاتر قازانج و سوودیان بۆ ئەو خێڵ و گەڕەكه هەیه ئەوە بە ژمارەیەك وشتر و بەچكەی شیرەخۆری یەكساڵەو لەشیر براوە و هەرزەكاری وشتر دەدات پێیان كه بەكەڵكی ڕۆژانـی سـەخت و گرانیی بێت، ئەوە باشه بۆ سارێژكردنی ڕق و كینـەو نیـازی تۆڵـه، ئـەو خێڵه ئەسڵ و فەسڵه دەزانن كـه زیـان تـەنها لـه تاوانكـار نیە،بـەڵكو تـاوان دابەش دەبێ بەسەر هەموو خێڵەكەدا و قوله لەبێ تاوانیش دەكرێ.

رَعَوْا مَا رَاعَوْا مِنْ ظِمْئِهِمْ، ثُمَّ أَوْرَدُوا    غِمَـاراً تَفَـرَّى بِالسِّـلاَحِ وَبِالـدَّمِ
فَقَضَّـوْا مَنَايَـا بَيْـنَهُمْ، ثُـمَّ أَصْـدَرُوا    إِلَـى كَلَـإٍ مُسْـتَوْبَلٍ مُتَـوَخِمِ
لَعَمْـرِي لَـنِعْمَ الحَـيُّ عَلَـيْهِمُ    بِمَا لاَ يُـوَاتِيهِمْ حُصَيْنُ بْـنُ ضَمْضَـمِ
وَكَانَ طَـوَى كَشْـحاً عَلَـى مُسْتَكِنَّةٍ    فَـلاَ هُـوَ أَبْـدَاهَا وَلَـمْ يَتَقَـدَّمِ

دەڵێ: ئەم هۆزە گورەیە هەتا توانیان لەم پاكژەی شەڕ لەوەڕان و لە نوخردی هەردوولا تێربوون و بۆماوەیەك پشویاندا و ئەوجا دەمیان تێژەندەوە و دەستیانكرد بە بژنینی یەكتر بەچەك و بە خوێن، وەك كاورای سپێون لە نێوان دوو نینۆك ئەسپێ دەكوژێ، ئەوكات مەرگیان بڕیاردا لەنێوانداو دووبارە هاتنەوە بۆ لەوەڕ لە گیایەكی بۆگە و پیس و پۆخڵ و ئاخرشەڕ، بە گیانی خۆبەرو بەسەری خۆم ئەو خێڵە خێڵێكی زۆر باش بوون كە ئەو كابرای خۆی شاردەوە لە ئاشتی و بڕیاری تۆڵەیدا كە حوسەینی كوڕی زەمزەمەو پشتی تێ كردن و نیازی تۆڵەی هەبوو لە نهێنیدا و نیازی بوو تۆڵەی هەرەمی كوڕی زەمزەم كە وەردی كوڕی حابس كوشتبووی، لەبەر ئەوە حوسەین شەڕەكەی هەڵگیرساندەوە.

وَقَـالَ: سَأَقْضِـي حَـاجَتِي، ثُـمَّ أَتَّقِـي    عَـدُوِّي بِـأَلْفٍ مِـنْ وَرَائِـيَ مُلْجَـمِ
فَشَـدَّ وَلَـمْ يُنْظِـرْ بُيُوتـاً كَـثِيرَةً    لَدَى حَيْـثُ أَلْقَـتْ رَحْلَهَـا أُمُّ قَشْـعَمِ

دەڵێ: بە زوبانی ئەو حوسەینەی كوڕی زەمزەم كە خۆی شاردەوە لە سوڵح و نیازی تۆڵەی هەبوو و ئەنجامیش شەڕ دەستی پێ كردەوە، دەڵێ: هۆكاری خۆم جێبەجێ دەكەم و تۆڵەی هەرەمی بەرام دەكەمەوەو ئەگەر

نیازی دژەتۆڵە هەبوو لە دوژمنەوە ترسم نییە، هەزار سواری جەنگاوەرم لە پشتە کە ئەسپەکەیان لەغاو کردووە و ئامادەن، ئەوجا هەرەمی دەستکەوت و پیاوێکی کوشت لەو شوێنەی دایەنی مەرگ بارگەی خستووە.

لَدَى أَسَدٍ شَاكِي السِّلاَحِ مُقَاذِفٍ لَـهُ لِبَـدٌ أَظْفَـارُهُ لَـمْ تُقَلَّـمِ
جَـرِيءٍ مَتَـى يُظْلَـمْ يُعاقِـبْ بِظُلْمِـهِ سَـرِيعاً، وَإِلاَّ يُبْـدَ بِـالظُّلْمِ يَظْلِـمِ

ئەم کابرایە پیاوی ئازایە، هەمیشە دەستی بە چەکی خۆیەوەیە، زبر و توندڕەوەو لە ڕمبازیدا شارەزایە، قژو کاکۆڵی لە پارەی بەستووە وەك لە پارەی یاڵی شێری نێر و نینۆکی درێژە و نینۆك ناکات بۆ ئەوەی بەکاری بهێنێ وەك شێر، ئەم پیاوە یان ئەم سوپای هەزار نەفەرییە ئازاو بەجەرگەو هەرکات ستەمی لێ بکرێ زۆر بە پەلە تۆڵەی دەکاتەوە، خۆ ئەگەر ستەمی لێ نەکرێ ئەم ستەمی خۆی هەر دەکات، ئەم وەسفەی حوسەین هەرچەندە لە دوورمەودا وەك زەم وایە بەڵام زیاتر بۆ گەورە نیشاندانی قەبارەی کارەساتە، کە دوو هۆز لەگەڵ وورده خێڵ و سوێندی خوا، ماوەیەك شەڕی یەکتر بکەن کە زیاتر دوو نەوەی پێوە گلابێ زۆر زەحمەتە سوڵح و تەبایی، بەڵام ئەم دوو ناوبژیوانە لە کارەساتەکە گەورەترن.

لَعَمْـرُكَ مَـا جَـرَّتْ عَلَـيْهِمْ رِمَـاحُهُمْ دَمَ ابْـنِ نَهِيـكٍ، أَوْ قَتِيـلِ الْمُـثَلَّمِ
وَلاَ شَارَكَتْ فِي الْحَرْبِ فِي دَمِ نَوْفَـلٍ وَلا وَهَـبٍ فِيهَـا، وَلاَ ابْـنِ الْمخَـزَّمِ
فَكُـلاًّ أَرَاهُـمْ أَصْـبَحُوا يَعْقِلُونَـهُ عُلاَلَـةَ أَلْـفٍ بَعْـدَ أَلْـفٍ مُصَـتَّمِ
وَمَـنْ يَعْـصِ أَطْـرَافَ الزِّجَـاجِ فَإِنَّـهُ مُطِيـعُ الْعَـوَالِي رُكِّبَـتْ كُـلَّ لَـهْذَمِ

دەڵێ: بەتەمەن و گیانی تۆ سوێندم بێ، ئەم دوو کەڵەپیاوە تاوانیان نەکردووە و بەرمی ئەمان کوڕی (نەهیك) خوێنی نەڕژاوە و خوێنی کوڕی موسەللەم هەروەها هاوبەشییان نەکردووە لە جەنگ و خوێنی نەوفەل و وەهەب و کوڕی موخەززەمدا، بەڵام چونکە لە شەڕی خێڵایەتی کوژراون ئەمان خوێنی ئەوانیش دەدەن بە زیادەوە، هەزار بە تەواوی و بێ کەم و کووڕیی، ئەو خوێندان و سوڵحە لەبەر ئەوەیە هەرکەس بە مشتی شمشێر و قۆناغەڕم نەکات، کە پیاو ناکوژێ، بەڵام کە شەڕ گەرم بوو تەڕ و وشکی پێکەوە سووتان و بەدەمە تیژەکەی ملی زۆری پەڕان، ئەو کات ملکەچ دەکرێ بۆ سوڵح و ئاشتیی و باجەکەش خەڵکی ئەملاو ئەولا بیدەن، ئەوە ڕاستە شەڕ لەسەرەتاوە زۆر سادەو ساکار دێتە بەرچاو، بەڵام کە گەرمبوو سەری زۆر لە ساحەدا لەلاشە کرایەوە، نرخی ئاشتی دەردەکەوێ.

وَمَنْ يُوِ لاَ يُذْمَمْ، وَمَـنْ يَفْـضِ قَلْبُـهُ ... إلى مُطْمَـئِنِّ الْبِـرِّ لاَ يَـتَجَمْجَمِ

وَمَـنْ هَـابَ أَسْبَابَ الْمَنَايـاَ يَنَلْنَـهُ ... وَلَـوْ رَامَ أَسْـبَابَ السَّـمَاءِ بِسُـلَّمِ

وَمَنْ يَـكُ ذَا فَضْـلٍ فَيَبْخَـلْ بِفَضْـلِهِ ... عَلَـى قَوْمِـهِ يُسْـتَغْنَ عَنْـهُ وَيُـذْمَمِ

وَمَنْ لاَ يَزَلْ يَسْتَرْحِلُ النَّـاسَ نَفْسَـهُ ... وَلاَ يُعِفْهَـا يَوْمـاً مِـنَ الـذُّولِّ يَنْـدَمِ

ئەوجا ئەم شاعیرە فەیلەسوفە، خوداپەرستە، ئاشتی دۆستە، کۆتایی بە کۆمەڵێ حیکمەت و بیروباوەڕی ژیاری و شارستانیی وەك داهێنان دەهێنێ و دەڵێ: ئەوەی وەفاو بەڵێن و پەیمان ڕەچاو بکات هەرگیز زەمناکرێ و بەخراپە باسناکرێ، هەرکەس خورپەی دڵی بۆ ئارانیی و تەختایی چاکە

و پیاوەتیی لێبدا، ئەوە هەرگیز کۆڵ نادات لە ئاشتیی و تەبایی و بەماڵ و سامان و ماندووبوون ئەکەوێتە نێوان دوو لایەنی شەڕکەر، ئەوەی لەمەرگ ترساو خۆی حەشاربدات لە هۆکارەکانی هەر پێی دەگاو دەستی لەکۆڵ ناکاتەوە، ئەگەر بە گوریس و پەیژە خۆی بۆ ئاسمان بەرز بکاتەوە، ئەم گیانبازییەی ئەم دوو پیاوە بۆ ئاشتیی و ئازایەتیی و لەمەرگ نەترسانە، چونکە ئەو کەسەی چاکەی لە دەستە بۆ گەل و هۆزی خۆی و ڕەزیلیی و چروکیی تێدا بکات سووك و ترۆ و بێ نرخ دەبێ و خەڵك زەمی ئەکەن و هەجوی دەکرێ، هەروەها هەرکەس غیرەتی نەبێ و بە چاوی خۆی زۆر و ستەم و ئاژاوەی ناو نەتەوەی ببینێ و خۆی نەکات بە خاوەن و ترسنۆکانە خۆی گێل و گەمژە بکات و ئەو سوکایەتییە قەبوڵ بکات خۆی پەشیمان دەبێتەوە.

وَمَنْ يَغْتَرِبْ يَحْسِبْ عَدُوّاً صَدِيقَهُ     وَمَنْ لاَ يُكَرِّمْ نَفْسَهُ لَمْ يُكَرَّمِ
وَمَنْ لاَ يَذُدْ عَنْ حَوْضِهِ بِسِلاَحِهِ     يُهَدَّمْ، وَمَنْ لاَ يَظْلِمَ النَّاسَ يُظْلَمِ
وَمَنْ لاَ يُصَانِعْ فِي أُمُورٍ كَثِيرَةٍ     يُضَرَّسْ بِأَنْيَابٍ وَيُوطَأْ بِمَنْسِمِ

لەسەر حیکمەت و پەندەکانی دەڕواو دەڵێ: ئەوە سروشتی زەمانە هەرکەس لە خاك و نیشتمان و زێدی خۆی بڕوا بۆ غەریبی، جیاوازی دۆست و دوژمنی خۆی ناکات و دوژمن بە دۆست دەزانێ، چونکە نایناسێ و کەری بارەبەرە دەبێ و ڕێزی خۆی نازانێ و ڕێزی خۆی ناگرێ و ڕێزیشی ناگیرێ، چونکە نایناسن، هەرکەس بە چەك و بەرگریی و ئازایەتیی پارێزگاری لە حەوز و کانیی و هەواری خۆی نەکات زۆر زوو

بۆی دەڕوخێنن و ئەوەی زۆری نەبێ و نەتوانێ ستەم بکات ستەمی لێ ئەکرێ، ئەوە مانای ئەوە نییە ستەم بکات بەڵکو ئەگەر لاوازو بێ دەسەڵات هاتە بەرچاو دەبێتە ژێر دەست و چەوساوە دەبێ و هەرکەس لە زۆر کار و شتی ڕۆژانە چاوپۆشی نەکات و بۆ هەموو کارێکی ناشیرین هەڵبچێ و تووڕە بێ، دەکەوێتە بەر کەڵبەو وەك بنێشت دەوێنجرێ و دەبێ بە ژێر سمی وڵاخ و پۆستاڵی زۆردارترەوە، چونکە ئاسایشی ژیان تەنها لە نیشتمان و ناو قەوم و هۆزی خۆتە!.

وَمَنْ يَجْعَلِ الْمَعْرُوفَ مِنْ دُونِ عِرْضِهِ يَفِرْهُ، وَمَنْ لاَ يَتَّقِ الشَّتْمَ يُشْتَمِ
سَئِمْتُ تَكَالِيفَ الْحَيَاةِ، وَمَنْ يَعِشْ ثَمَانِينَ حَوْلاً – لاَ أَبَا لَكَ– يَسْأَمِ
رَأَيْتُ الْمَنَايَا خَبْطَ عَشْوَاءَ" مَنْ تُصِبْ تُمِتْهُ، وَمَنْ تُخْطِيءِ يُعَمَّرْ فَيَهْرَمِ

دەڵێ: هەرکەس ماڵ و سامان و چاکە و بەخشندەیی بکاتە پەرژین و دیواری ماڵ و منداڵ و نامووسی، ئەوە شەرەف و نامووسی پارێزراوەو کەم و کووڕیی نابێ و هەرکەس خۆی لە جنێو نەپارێزێ جنێوی زۆر ناشیرینی پێ دەدرێ، ئەوجا باسی خۆی دەکات و دەڵێ: بێزارم لە کارە قورسەکانی ژیانی ڕۆژانەی خۆم و پیری سەری لێ داوم و هەرکەس هەشتا ساڵ تەمەن بەسەر ببا، هەم بێ باوك هەم داماو ئەبێ و تووشی بێ هێزیی و بێ توانایی و خەمۆکیی دەبێ، چونکە مەرگ و مردن وەك وڵاخی شەوکوێر هەنگاو دەنێ و نازانێ چی لەژێر سمیدایە، بەر هەرکەس کەوت ئەیکوژێ و بەرکەسێك نەکەوت تەمەندرێژ و پیر دەبێ، وەك من کە نەکەوتومەتەبەر چەپۆکی مەرگی شەوکوێر.

(مەبەستی ئەوەیە كە مەرگ و ئەجەل بە وادەی خۆی و قەزاو قەدەرە، مەرج نییە هەركەس ئازاو جەنگاوەر بوو زوو بمرێ و هەركەس ترسنۆك و لاواز و سەركزبێ تەمەنی درێژبێ).

وَمَهْمَا تَكُنْ عِنْدَ امْرِىءٍ مِـنْ خَلِيقَـةٍ    وَلَوْ خَالَهَا تَخْفَى عَلَـى النَّـاسِ تُعْلَـمِ
وَأَعْلَمُ مَا فِـي الْيَـوْمِ وَالْـأَمْسِ قَبْلَـهُ    وَلَكِنِّي عَـنْ عِلْـمِ مَـا فِـي غَـدٍ عَـمِ

دەڵێ: هەر خووڕەوشت و كردارێك لە كەسێكەوە هەبێ، هەر چەندە وابزانێ شاراوەیە لە خەڵك بەڵام هەر دەزانرێ و دەرئەكەوێ، كەواتە هەتا ئەتوانی كاروكردارت با چاك بێت و شەرم بكە لە كاری خراپ، چونكە پێت ئەزانن، من خۆم ئەزانم ئەمڕۆ چیم كردووە و دوێنێ و پێرێم لا ڕوونە، بەڵام نازانم سبەی چی دەبێ و زانیاریم نییە لە داهاتووی خۆم و خەڵك و چاوم پێی ناكەوێ.

# بێداری ئاگاداری

لەشەرحی تەبریزیدا پەنجاو نۆ بەیتە، بەلأم لە (مجانی الحدیسە)دا ئەم چەند بەیتە زیادكراوە، زۆر نزیكە لە حیكمەت و ژیریی زوهەیرەوە، چونكە ئەم شاعیرە حەكیم و زاناو دانابووە و تەمەنی لە سەدساڵ نزیك بووەتەوە و سەرەتای پەیام و سروش مردووە.

وَكَاَيِن ترى من صامِتٍ لـك مُعْجِبٍ   زيادتـــه او نَقْصُــــه في الـــتَكَلّمِ
لسـان الفتـى نِصـفٌ ونصـف نـؤاده   فَلَـمْ يبـقَ إلاّ صـورةَ اللحـم والـدم
وأن سُــفاه الشــيخ لا حِلْــمَ بعــدَهُ   ان الفتـــى بعـــد اســـفاهةِ يَحْلِـــمِ
ســـألنا فـــأعطِتم وعُـــدنا فَعُـــدتُمُ   ومــن اكثــر التســألَ يومــاً سَــيُحْرَمِ

دەڵێ: زۆركەس هەیە بێدەنگە و قسە ناكات، خۆ ئەم بێدەنگیی و قسەنەكردنەم بەلاوە جوانە و سەرسامم، دەبێ لە ئەدەب و ئاكاری تەنها كەمیی و زۆریی ژیریی و عەقڵیی و زمانزانیی ئەوكاتە دەردەكەوێ كە گوتار دەدا، زمانی هەركەس و هەر لاوێك نیوەی ئەو كەسەیە و نیوەكەی تری دڵ و دەروون و نەفسەكەیەتی، ئەوەی ماوەتەوە لە بەژن و باڵای پاشماوەی گۆشت و خوێنە و بە تەمای ئەو دوو شتە نەبێ كە (زمان و دڵ)ە و ئەو نرخەی نییە، پەندی عەرەب دەڵێ: مرۆڤ دوو پلە گۆشتە: زمان و دڵ.

ئەوجا دەڵێ: ئەگەر پیر بێعەقڵ بوو، نەزان بوو، گەمژە بوو، هەرگیز لە پیریدا عەقڵ زیاد ناكات، مەگەر مەرگ بگاتە فریادڕەسی، بەلأم لاوی

خاو ئەگەر نەفام و جەحێڵەو سەرکێشە، بەڵام کەمکەم بەرەو ژیریی و عەقڵ دەڕوا.

ئێمە (شاعیرەکان) هەرچی داوامان کردووە لە خەڵات و بەرات ئێوە بەخشیوتانە پێمان، هەرچەند ئێمە گەڕابینەوە بۆ مەدح و سەنای ئێوە (سەرۆکخێڵەکان) ئێوەش گەڕاونەتەوە بۆ خەڵات و بەراتی ئێمە، بەڵام نابێ ئێمە هەمیشە هەر داوا بکەین، ئەبێ ئێمەش بەخشندەبین، بەشێوەی چڵەپۆپە،چونکە ئەوەی زۆر سوالْ بکات ڕۆژێك دێت بە نائومێدیی سەربنێتەوە، واتە نابێ شیو و کەرەسەی سوالْکردن و خۆژیاندن بێ و ئەبێ کارێکی تر فێربێ بۆ ژیانی ماڵ و منداڵ و نەوەی خۆی.

(ئەوە کۆتایی ئەم شاکارەی زوهەیرەو بڕوام وایە ئەگەر پێغەمبەری چاو پێکەوتبێ باوەڕی بە ئیسلام هێناوە، چونکە زۆر باوەڕی بەخودا و پەیام بەهێزە).

# لەبيد كوڕی ڕەبيعە

## ٥٦٠-٦٦١ زاينی

لەبيدی كوڕی ڕەبيعەی عامری، لە خێڵی هەوزان، ژيانێكی گەورە پياو، ميواندۆست، هاوكاری هەژار، كەڵە شاعيرە لە وەسف و شانازيی و حيكمەتی ژيريی و عەقڵ، لە ساڵی ٦٣٠دا موسوڵمان بووە و نازناوی دوو سەردەم (مخضرم)ی پێدراوە، لەساڵی هەشتی كۆچيدا بەنوێنەر هاتووە بۆ خزمەتی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێت) بەڵام براكەی سەركەوتنی بەدەست نەهێناو لە ساڵی نۆی كۆچيدا دووبارە لەگەڵ وەفدێك لە هۆزەكەی موسوڵمان بوون.

ڕەخنەگران و نوسەرانی ئيسلاميی، پێشبينی زۆر گرنگيان بە شيعری لەبيد داوە، هەروەها ڕۆژهەلاتناسەكان زۆر گرنگيان پێداوە، ئەم شاكارەی لەبيد چوارەمە لە ڕيزبەندی چامە هەڵواسراوەكاندا، ژمارەی بەيتەكانی هەشتاو نۆ بەيتە، باسی هەوار و شوێنەوار لە (١-٩) ئەوجا بۆ دڵداری لە (١٠-١٥)، ئەوجا باسی خاتوونە نەواری دۆستی دەكات لە (١٦-٣١)، ئەوجا باسی وشترەسورە لە (٣٢-٣٤)، ئەوجا باسی كەری كێوی لە (٣٦-٥٤)، ئەوجا باسی ئەسپەكەی، پاشان شانازی بە خێڵ و هۆزەكەی.

عَفَتِ الدِّيَارُ مَحَلُّهَا فَمُقَامُهَا     بِمِنًى تَأَبَّدَ غَوْلُهَا فَرِجَامُهَا

فَمَدَافِعُ الرَّيَّانِ عُرِّيَ رَسْمُهَا     خَلَقاً كَمَا ضَمِنَ الوُحِيَّ سِلاَمُهَا

دەڵێ: كەوێڵ و خانووەكان ڕوخاو و ڕزیون، چ ئـەو هەوارگـە كاتییـە، چ ئەو شوێنە نیشتەجێ هەمیشەییە، لە میناداا، لە حـەرەمی مەككە شـوێنی قەدەغـە چـیای غـول و ڕەبـام بـوون بەچـۆڵ و بیابـان لەبـەر نـەبوونی ڕەوەندی ئاژەڵدار لـە ناوچـەكەدا، جۆگەلـەی باراناوەكـان لـە شـیوی ڕەیـان وشكبووە و ڕووت و قووتە لە گیاو لە پوش و پـەڵاش، ئاسـەواری تێكچووە و كوژاوەتـەوە و كۆن و ڕزیـوە، تـەنها وەك شـێوەی نووسـین لەسـەر بـەرد ماوەتـەوە و بـاش ناخوێنرێتـەوە، مەگـەر لەنزیكـەوە، یـان مەبەسـتی لـە (غـول) ئـاوە و لـە (ڕجـام) دامێنـی چـیایە، جۆگـەی بـاران كـوێری كردووەتەوەو شێوەی بیابانی وەرگرتووە، وەك نووسینی سەر بەردی گۆڕ، كە باو بۆران دەیكوژێنێتەوە، ئەوە جۆرێكە لە نائومێـدیی لـە دۆزینـەوەی هەواری یاری كۆن.

دِمَــنٌ تَجَــرَّمَ بَعْــدَ عَهْــدِ أَنِيسِــهَا  حِجَــجٌ خَلَــوْنَ حَلاَلُهَــا وَحَرَامُهَــا

رُزِقَــتْ مَرَابِيــعَ النُّجُــومِ، وَصَــابَهَا  وَدْقُ الرَّوَاعِــدِ جَوْدُهَــا فَرِهَامُهَــا

دەڵێ: خۆڵەكەوەی ناو ئاگردانەكانیان پرش و بـڵاو بـووە، پـاش ئـەوەی هەوارنشینـەكانی لێ نـەماوەو سـاڵانی زۆری بـە سـەردا هـاتووە، لـە هەشـت مانگی حـەڵاڵ: سـەفەر، ڕەبیعـی یەكـەم، ڕەبیعـی دووەم، جـەمادی یەكـەم، جەمادی دووەم، شەعبان، ڕەمـەزان، شەوال و چوار مانگی حەرام: ڕەجـەب، زولقەعدە، زولحەجـە، موحـەڕڕەم، بەشـەبارانی بـەهاری بارانـاوی، ئـەوە بـارانی هەمـەجۆری داوە بـەم هەوارگـە و گـرد و دۆڵ و شـیوی مینـا و شوێنەواری ئەم خێڵەی كوژاندووەتەوە، بارانی نەرم، بـارانی هـەوری نـزم،

بارانی هەوری بزیسکەدار و بروسکەدار، بارانی توند و ڕێژمنە، نەرمە بارانی دوای وەشت، هەمووی لەم خاکە باریوە، بۆیە ئاگردان و جێگە دەوار و پارگینی پشتی دەواری کوژاندوومتەوە و زۆر لە نزیکەوە نەبێت نایناسیتەوە.

مِنْ كُلِّ سَارِيَةٍ وَغَادٍ مُدْجِنٍ     وَعَشِيَّةٍ مُتَجَاوِبٍ إِرْزَامُهَا
فَعَلاَ فُرُوعُ الأَيْهُقَانِ وَأَطْلَقَتْ     بِالْجَلْهَتَيْنِ ظِبَاؤُهَا وَنَعَامُهَا

دەڵێ: بارانی شەوبارین و بارانی بەیانیان دێت و دەڕوات و دەبارێ، لە هەوری عالەمگیر و ئاسمانپۆش و لەئێوارانــدا وەڵام دەداتەوە، وەك دەنگی وشتری شیردەر بە بێچووەکەی، دیمەنی بارانبارین لە هەورەکان وەك دیمەنی گوانی وشترەکە شیری لێ دەبارێ بۆ بەچکە تازەکەی، بەڵام ئەم بارانە لقی داری گۆزروانی بەرزکردوومتەوە، یان گیای کوزەڵەی دەشت و نزیك ئاو بەرز بوومتەوە و لەوەڕێکی باشی بۆ ئاسکەکان سەوز کردووە و نەعامەکانیش هێلکەیان کردووە و لە دوو لێواری شیوەکەدا بە ئارامیی دەژین، چونکە چۆڵە و لە کەس ناترسن و ڕاوچی لێ نییە.

وَالْعِينُ سَاكِنَةٌ عَلَى أَطْلاَئِهَا     عُوذاً تَأَجَّلُ بِالْفَضَاءِ بِهَامُهَا

دەڵێ: مەڕەكێویەكان، یان بزنەكێویەكان، بێترس خۆیانداوە بەسەر كار و بەرخە شیرەخۆرەكانیاندا كە تازە بەتازە زاون، كە مڕبوون و مۆڵیانداوە، گاكێوی و بێچووەكانی، مەڕەكێوی و بەرخەكانیان، بزنەكێوی و كارەكانیان، ئاسكەكان و كارمامزەكانیان، لە گۆڕەپانەكەدا بارانی بەهار

گیای زۆری سەوز کردووە بۆیان، ئەو وێنە دیمەنی واحەیەکی دەشتی حیجاز و چیاکانی یەسریب و نەجدە!.

وَجَلاَ السُّيُولُ عَنِ الطُّلُولِ كَأَنَّهَا　　زُبُــرٌ تُجِــدُّ مُتُونَهَــا أَقْلاَمُهَــا
أَوْرَجْــعُ وَاشِــمَةٍ أُسِــفَّ نَؤُورُهَــا　　كِفَفــاً تَعَــرَّضَ فَــوْقَهُنَّ وِشَــامُهَا

دەڵێ: دیمەنی ئەو دەشت و قەدپاڵ و دۆڵ و شیوەی هەواری دۆست، ئوم ئەوفا، دەردەکەوێ کە لافاو و خۆڵی لاداوە لەسەر بەردە سپییەکان و ڕازاندویێتییەوە، دیواری خانووە ڕوخاوەکان و بناغە بەردەکانی سپی کردوەتەوە، وەك پەڕەکاغەزی دووبارە، بەڵام قەڵەم خەتەکانی نووسراوی تازە کردووەتەوە و ڕەش و سپی ڕوون بووەتەوە، یان وەك دووبارە خاڵ کوتانی لێ هاتووە، بە دەرزی زامارکراوە و قسڵی کراوە بەسەریا، بۆ ئەوەی ڕەنگی وەك مەی لەسەر پووك و لێوی بووك دەردەکەوێ بەردە سپییەکان و بە دەوریدا خاکی ڕەش شێوەی بازنەی پێوەی دیارەو ناوە ناوە وەك ناو مشتی خەناویی و پشت دەستی بە خاڵ کوتراوی لێ هاتووە و هێڵ و خەت و بازنەکان تازە کراوەتەوە.

فَوَقَفْــتُ أَسْــأَلُهَا، وَكَيْــفَ سُــؤَالُنَا　　صُــمّاً خَوَالِــدَ مَــا يَــبِينُ كَلاَمُهَــا؟
عَرِيَتْ وَكَانَ بِهَا الْجَمِيــعُ، فَــأَبْكَرُوا　　مِنْهَــا، وَغُــودِرَ نُؤْيُهَــا وَثُمَامُهَــا
شَــاقَتْكَ ظُعْــنُ الحَــيِّ يَــوْمَ تَحَمَّلُــوا　　فَتَكَنَّسُــوا قُطْنــاً تَصِــرُّ خِيَامُهَــا

دەڵێ: چاوەڕوانم هەبێ پرس و هەواڵ داوا بکەم، وەستام لەسەر ئەو هەوارە کۆنە کە بووەتە مۆڵگەی مەڕ و بزن و ئاسکی تازە زاو و بێچوی

چاوگەش و ڕەش و سوئال و پرسیار ئەکەم، بەڵام چۆن پرسیار بکەم، لەکێ؟، چۆن؟، بۆچی؟، کوا یارەکەم؟، ئەو ئاسەوارە کەڕولاڵ و بێزمانە قسە ناکات و ئەگەر قسەش بکات تێ ناگەم، شوێنەکە زیندووە و نەمردووە و تەنها ئەوەیە دانیشتوانی تێدا نەماوە و بەرگی خەڵکی لەبەردا نییە و ڕووت و قووتە، دیارە زۆر زوو لێرە باریان کردووە و ئەم هەوارەیان بەجێ هێشتووە، پارگێنی پشتی دەوارەکەیان و هەژگ و هەڵای دەوری کۆزە و پەچەی کارەگەل و بەرغەلەکەیان نەماوەو تێکچووە، ئەو گیاو گەڵایەی لەژێر مەشکەو کونەی ئاوەکانیان داناوە با لای بردووە.

ئەوجا ڕوو لە خۆی دەکاو دەڵێ: ئەوە ئاگری عەشق و ئەڤین هەڵیگرتووی و بەشوێن ڕەوەندە کۆچەرییەکانەوە وێڵی و سەرگەردانی؟، بابە بڕۆ!، لێرە نەماون و لەسەر کەژاوەی کۆچبەران ئۆغریانکردووە و لەناو کەژاوەی نەرم و شل بەماڵ و عەیاڵ و منداڵەوە کۆچیانکردووە و خزمەتکار و کۆیلەکانیان بارەکانیان شەتەك داوە و جیڕەی تەنگە و چەڵمە و قەیاسەکانیان لە گوێ ونبووە.

(جاران لە کوردەواری باری داری زەنگەتڵیش و باری داری تەڕکی قایمان دەهێنا بۆ هەڵەبجە ئەو جیڕەی کە شاعیر باسی دەکات دەهاتە گوێمان).

مِــنْ كُــلِّ مَحْفُــوفٍ يُظِــلُّ عِصِــيَّهُ     زَوْجٌ عَلَيْــــهِ كِلَّـــــةٌ وَقِرَامُهَــــا

زُجَــلاً كَــأَنَّ نِعَــاجَ تُوضِــحَ فَوْقَهَــا     وَظِبَــاءَ وَجْــرَةَ عُطَّفَــا أَرْءَامُهَــا

حُفِــزَتْ وَزَايَلَهَــا السَّــرَابُ، كَأَنَّهَــا     أَجْــزَاعُ بِيشَــةَ أَثْلُهَــا وَرِضَــامُهَا

ئەوجا.. باس باسی كەژاوە داپۆشراوەكان دەكات بە تارای ڕەنگاو ڕەنگ و بۆ ئەوەی خۆر ئازاری لەشی ناسك و نازداری ژنەكان نەدات و مێشولە نەچێتە ناو كەژاوەكانیانەوە، نەوەك خوانەخواستە ڕومەتی ئالاو والایان لەكەداربێ.

دەڵێ: كەژاوە داپۆشرابوو بە قوماش لە هەمووولاوە و داروباری كەژاوەی شاردبووە و پەردەی ناسك وەك پەردەكوللە درابوو لە دەوری و سێبەری دەكرد و چەرچەف ڕاخرابوو لەناو هۆدەی كەژاوەكە و مەوجی ناسك درابوو بەسەر ئەوانەی لە كەژاوەكەدا بوون، ئەو كەژاوانە زۆربوون و تەنها ئوم ئەوفا نەبوو، بەڵكو كەنیشككەلێكی لەسەر سوار بووبوون، وەك مەڕەكان و بەرخەكانی نوزەح و ئاسكەكانی (وەجرە)، خۆیاندابوو بەسەر مندالەكانیاندا، ئەوجا، ئەو كاروانە ڕەوەندە لە وشترەكانیان دەخوڕی و پەلەیان لێ دەكردن و تراویلكە واتە سەراب لەسەریان لاچووبوو، شێوە درەختە بەرزەكانی پێچی شیوی پێشەوە، یان گردۆلكەكان بە دەردەكەوتن، وشتری بەرز و كەژاوەی سەوز لە داری مۆرد دەچێ و دەشنێتەوەو بەملاو ئەولادا دێت و دەڕوات.

بَلْ مَا تَذكَّرُ مِنْ نَوَارِ وَقَدْ نَأَتْ ... وَتَقَطَّعَتْ أَسْبَابُهَا وَرِمَامُهَا

مُرِّيَّةٌ حَلَّتْ بِفَيدَ، وَجَاوَرَتْ ... أَهْلَ الحِجَازِ، فَأَيْنَ مِنْكَ مَرَامُهَا؟

بِمَشَارِقِ الْجَبَلَيْنِ أَوْ بِمُحَجَّرٍ ... فَتَضَمَّنَتْهَا فَرْدَةٌ فَرُخَامُهَا

فَصُوَائِقٌ إِنْ أَيْمَنَتْ فَمَظِنَّةٌ ... مِنْهَا وِحَافُ الْقَهْرِ أَوْ طِلْخَامُهَا

دەڵێ: نەوەك تەنها ئەوەی بۆم باسكردی، بەڵكو تۆ نایەتەوە بیرت خاتوو نەواری شۆخە دڵدارەكەی شاعیر كە دووركەوتووەتەوە لێت، هەموو هۆكاری پەیوەستی و پەیوەندیی كۆن و نوێی لە نێواندا بڕاوە، بەهیچ جۆرە پەتێك بەیەكەوە گرێ نەدراون، نەوارخان لە هۆزی مورەی كوڕی عەوفە و لە هۆزی تۆ نییە و لەناوەندی (فەید)ی نزیك مەككە بارگەی خستووە و خۆیان نزیك كردووەتەوە لە ئەهلی حیجاز لە نەیاری ئێوەن چۆن دەتوانی بە ئارەزوو و مەرامی خۆت شادبیت؟، دیارە ناتوانی و هەر شین و زاریی بكە.

خێڵی نەوار لە ڕۆژهەڵاتی هەردوو شاخەكەدا دەواریان هەڵداوە، كە چیای هۆزی (تەیی) بەناو بانگە، یان لەناوچە (موجبەرە) و (فەردە) و (ڕوخام)دا باریان خستووە، كە تۆ ناتوانی گوزەری تێدا بكەی، هەروەها لە ناوچەی (سەرائیق) بەرەو یەمەن ڕوویان ناوە و گومان زۆرە لە گردەكانی (قەهروتیلخام) بڕۆن، ئەو ناوانە هەموو لە ڕێگەی مەككە بۆ مەدینە لە جوگرافیی كۆندا ناسراون.

فَـاقْطَعْ لُبَانَـةَ مَـنْ تَعَـرَّضَ وَصْـلُهُ وَلْخَيْـرُ وَاصِـلِ خُلَّـةٍ صَـرَّامُهَا
وَاجْـبُ الْمُجَامِـلَ بِالْجزِيـلِ وَّصَـرْمُهُ بَـاقٍ إِذَا ضَـلَعَتْ وَزَاغَ قِوَامُهَـا

دەڵێ: پاش ئەوەی بێئومێد بوو لە نەوارخان و بۆی دەركەوت كە پەتی خۆشەویستیی بڕیوە و هیچ هۆكاری پەیوەندیی نەماوە، ڕوو ئەكاتە خۆی و دەڵێ: كەواتە تۆش پێویستییەكانت مەخەرە بەردەم ئەم دۆستە كە پەیوەندیی خۆی ئەملاو ئەولا پێ كردووە، ئەو تۆی لەبیر كردووە، تۆش

ئەو لەبیری خۆت بەرەوە، خراپترین دۆست ئەوەیە کە دۆست دەگرێ تا ڕادەی ئەڤین و ئەوجا وازی لێ دەهێنێ، بەڵام ئەوەی ڕووپامایيت لەگەڵ دەكات و خۆشەویستیی دەردەبڕێ و لەژێرەوە بڕیاری داوە لەگەڵت نەبێ تۆ پەیوەندیی و چاکەی لێ مەبڕە هەتا ئەو بە تەواویی پەیوەندیی دەپچڕێنێ، ئەو کاتە تۆ دەست پێشخەر نابی.

(پێ دەچێ شاعیر ئەزموونی خۆی نیشانی خەڵك بدات کە دڵدار دەبێ تا سەر بەوەفابێ).

بِطَلِيحِ أَسْفَارٍ تَرَكْنَ بَقِيَّةً ... مِنْهَا فَأَحْنَقَ صُلْبُهَا وَسَنَامُهَا
فَإِذَا تَغَالَى لَحْمُهَا وَتَحَسَّرَتْ ... وَتَقَطَّعَتْ بَعْدَ الكَلَالِ خِدَامُهَا
فَلَهَا هِبَابٌ فِي الزِّمَامِ كَأَنَّهَا ... صَهْبَاءُ رَاحَ مَعَ الْجَنُوبِ جَهَامُهَا
أَوْ مُلْمِعٌ وَسَقَتْ لأَحْقَبَ لاَحَهُ ... طَرْدُ الفُحُلِ وَضَرْبُهَا وَكِدَامُهَا

دەڵێ: کاری خۆت و خەڵك کۆتا بێنە لەگەڵ ئەو دۆستەی تۆی فریوداوە و لەبیری کردووی، لە جیاتی ئەوە خو بدە بەوشترێکی عەیبداری کاروانی زۆر پێکراو کە سەفەر شتێکی ئەوی نەهێڵاوەتەوە لە توانا و لەش و پێست و سەنامی سەر پشتی و پووکاوەتەوە و لەڕولاواز بووە و گۆشتی نەماوە و پێستی لکاوە بە ئێسقانەوە و تووکی وەریوە و کلۆڵ و داماو بووە و چەرمی پارێزگاری قاچ و پاژنە و ئەژنۆی لێکراوەتەوە، لەبەر ئەوەی بە تەمای کارپێکردنی نەماون، لەگەڵ ئەو هەموو پشتگوێ خستنەش چالاکیی و گەرم و گوڕیی هەر ماوە و ڕەشۆی لەسەردایە و لە ڕۆیشتنی وەك هەوری سووك بەشنەبایەك دەڕوات و

سووك و گورجە، یان سیفەتی ئەو وشترە وەك ئەو ماكەرمیە كە ئاوسە و هەرەشە و جاشەكەی لە سكیدایە و زۆر نەوەی تری خستووەتەوە و ئارەزووی تری نەماوە و پاشلەقەی لێ ئەكات و جووتە ئەوەشێنێ و گاز دەگرێ، ئەم وشترە لەو دۆستە تۆراوە باشترە.

یَعْلُو بِهَا حَدَبَ الإِكَامِ مُسَحَّجاً    قَدْرَابَــهُ عِصْــیَانُهَا وَرِحَامُهَــا
بِــأَحِزَّةِ الثَّلَبُــوتِ یَرْبَأُفَوْقَهَــا    فَقْــرَ المَرَاقِــبِ خَوْفُهَــا آرامُهَــا

ئەوجا.. وەسفی ئەو كەرەكێویە ئەكات لە بەیتی پێشوودا چواندبووی بەو وشترەی كە بۆی پێشنیاركردبوو، لە بریتی دۆستی، بەدەم دۆست و بەدڵ نادۆست و دەڵێ: ئەو ماكەرە كێویە ئاوسە كە لەقە دەدات و جووتە ئەوەشێنێ و دژی نێرەكەرە و گاز دەگرێ، بەڵام نێرەكەرەكە دەستی لە كۆڵ ناكاتەوە، دوای دەكەوێ و بەرەو ژوور و بەرەو خوار ڕایدەفرێنێ و بەسەر گرد و شیوەكاندا دوای كەوتووە و زۆر شوێنی گازی كەری تری پێوەیە، و گومانی بۆ پەیدا بووە كە بۆیە لەقە ئەدات چونكە سكی هەیە و بێزوو ئەكات و حەزی لە نێر نەماوە، بەڵام نێرەكەی لە ترسی ڕاوچی ئەم شیو و ئەو دۆڵی پێ ئەكات، ڕاوی ناوە بەسەر زەوی بەرز و بەردەڵان و گردۆڵكەدا لەگۆڵاوی سەلبوت كە ئاوی خێڵی زوبیانە و ترسی هەیە ڕاوچی لە جاسووسگەدا خۆی حەشاردابێ، بۆیە ناوەناوە وازی لێ دێنێ و بەس چاودێریی ئەكات و دەیپارێزێ.

حَتَّــی إِذَا سَــلَخَا جُمَــادَی سِــتَّةً    جَــزَآ فَطَــالَ صِــیَامُهُ وَصِــیَامُهَا
رَجَعَــا بِأَمْرِهِمَــا إِلَــی ذِي مِــرَّةٍ    حَصِــدٍ، وَنُجْــحُ صَــرِیمَةٍ إِبْرَامُهَــا

دەڵێ: ئەم ماكەر و نێرەكەرە كێوییە دەرباز بوون لەبەردەڵانەكە، كە زستانی سارد و بەستن بوو و مانگی جەمادی دووەم بوو و شەش مانگ لە پایز و زستان تێپەڕی بوو، ئەم دووگیاندارە لەباتی ئاو تەنها گیای تەڕیان دەخوارد و ڕۆژوویان گرتبوو لە ئاو خواردنەوە، لەبەر سەرما پاش ئەوكاتەدرێژە گەڕانەوە بۆ ئاوخواردن و خۆیان مەحكەم كردەوە، سەركەوتن لەوەدایە ئەوەی بە ڕاستی بزانی ئەنجامی بدەی ئەم دووگیاندارە سەركەوتوو بوون، دەبوو تەوارخان بەم شێوەیە مامەڵەی لەگەڵ لەبیدا بكردایە!، نەوەك كۆچ و بار بكات و پەیامێكی نەبێ بۆ ئەڤیندارەكەی.

وَرَمَى دَوَابِرَهَا السَّفَا، وَتَهَيَّجَتْ رِيحُ الْمَصَايِفِ سَوْمُهَا وَسَهَامُهَا
فَتَنَازَعَا سَبِطاً يَطِيرُ ظِلاَلُهُ كَدُخَانِ مُشْعَلَةٍ يُشَبُّ ضِرَامُهَا
مَشْمُولَةٍ غُلِثَتْ بِنَابِتِ عَرْفَجٍ كَدُخَانِ نَارٍ سَاطِعٍ إِسْنَامُهَا

لەسەر وەسفی وشترەكە دەڕوات و دەڵێ: كە ڕێگە دەكات لەپاژنەی دوواوە دڕك و وشكیی زەویەكە لە پاشیەوە بای كوێستان دەیبات بۆ ئەملاو ئەولای ئەو با جیاوازانەی لەڕاست و چەپەوە دێن، غاردانی ئەو جووتە ماكەرو نێرەكەرە تۆز و خۆڵێك بە با دەدەن، وەك دۆڵی سوتانی پووش و پەڵاشی ئاگر تێپەڕ بوو درووست دەكەن و بە ئاسماندا باڵ دەگرێتەوە، ئەم وشترەی لەبید وەك ئەم نێرەكەرە چالاكە و تۆزی چوار پەلی سێبەری لە ئاسمان درووستكردووە، وەك دوكەڵی ئاگری پووش و

پەلاش و فرۆكەی داری وشك، كە بای باكور كلپەی پێ بدات بە هۆی هێنانی گەلای تەڕی عەرفەج، كە درەختێكی گەلاداری بیابانە، كە گڕی گرت وەك دوكەڵی ئاگرێك كە نێڵەو كلپەی بەرز دەبێتەوە وێنەكێشانی ئەم جۆرە دیمەن و نیگارە لەو ڕۆژەدا خۆشی تێدا بووە، چونكە زیندوو بووە و لەبەرچاو بووە و نامۆ نەبووە بە دید و هەستی شاعیر.

فَمَضَى وَقَدَّمَهَا، وَكَانَتْ عَادَةً مِنْهُ – إِذَا هِيَ عَرَّدَتْ– إِقْدَامُهَا
فَتَوَسَّطَا عُرْضَ السَّرِيِّ وَصَدَّعَا مَسْجُورَةً مُتَجَاوِراً قُلاَّمُهَا
وَمُحَفَّفاً وسْطَ اليَرَاعِ يُظِلُّهُ مِنْهَا مُصَرَّعُ غَابَةٍ وَقِيَامُهَا

دەڵێ: وەك ئەتەكێتی ئەمڕۆی ڕۆژئاوا كە ژن پێش دەكەوێ لە پیاوەكەی، ئەم نێرەكەرە كێوییە ماكەرەكەی پێش خۆی دابوو، نە وەك سەرپێچی لێ بكات و ئەوەش خۆی خۆی بوو، بەلام ماكەرەكە لە ڕێگە ئاساییەكە لایدەدا، بەلام پێشخستنی مێینە عادەتی ئەم جۆرە گیاندارە كێویە بووە.

هەر لەم بازبازێنەی دوو گیانداری كێوی كەوتنە ناو ڕووبارێكی ئاوەوە و لەگەڵ چەپۆكانی ئاوەكەدا دەمیان دەبرد بۆ خواردنی زەل و قامیشی ناسك و تەرچكی كەناری ئاوەكە، كە نزیك كانییەك هەڵئەقوڵێ و نەیجە و قامیشی زۆر تەڕی لێ ڕوابوو، ئەم دوو كەرە ئەڤیندارە لە كەنارەوە سەرگەرمی خواردن و خواردنەوە بوون، پاش ئەوەی شۆڕ بووبوونەوە لە جەنگەڵەكەوە بۆ ناو ئەم مێرگ و قامیشەلانە.

(تەنها كامێرای ئەمڕۆ دەتوانێ ئەو دیمەنە بە وێنەی سێ ڕەهەند بكێشێ).

أَفَتِلْكَ أَمْ وَحْشِيَّةٌ مَسْبُوعَةٌ    خَذَلَتْ وَهَادِيَةُ الصِّوَارِ قِوَامُهَا
خَنْسَاءُ ضَيَّعَتِ الْفَرِيرَ، فَلَمْ يَرِمْ    عُرْضَ الشَّقَائِقِ طَوْفُهَا وَبُغَامُهَا
لِمُعَفَّرٍ قَهْدٍ تَنَازَعَ شِلْوَهُ    غُبْسٌ كَوَاسِبُ مَا يُمَنُّ طَعَامُهَا

دەڵێ: نازانم ئەم وشترە نازارەم بچوێنم بەم ماكەرە، یان بە گاكێویی ناو جەنگەڵ، كە دڕندەكان بێچویان خواردووە و لە ترسی گیانی خۆی هەڵهاتووە و جیابووەتەوە لە لەڕەوەكەی خۆی و بەسەر گوێرەكەیەكی تریدا وەستاوە و وڕەی تەنها بە گا پێشەنگەكەیە كە بەرگری بكات لە خۆی و لە ڕەوە مانگا كێوییەكان، ئەو مانگا كێوییە كە دڕندە پەلاماری بەچكەكەی داوە و كەپوی چووە بە ئاوا و بێچووی بەجێ هێشتووە، لەناو گژو گیای چڕی نێوان دوو گردەڵاوییەكەوە دەقۆڕێنێ بۆ بەچكەكەی كە ئەوانە بە گوڵ و گیای هەرەش دایپۆشیبێ، ئەم گیاندارە نازدارە ترساوە چۆن ڕادەكات و با دەدا، وشترەكەی لەبید بەو جۆرەیە!.

ئەم حەیوانە بێ زیانە هەمیشە هاواری بۆ ئەو بەرخە لە شیر بڕاوە و هەم دووبارە شیر پێدراوە و ڕەنگی لە منداڵییەوە گۆڕاوە بۆ ڕەنگی خاكیی و لە خۆڵدا گەوزاوە كە ڕەنگی سپی بەرەو زەردپێست بوو، خواردنی لەسەر خۆی بوو، جا وەرە ئەم دایكە چۆن خۆشەویستی بۆ بەچكەكەی هەیە، ئەم وشترەش لە سەفەردا ئاوا چالاك بوو.

صَـــادَفْنَ مِنْهَـــا غِـــرَّةً فَأَصَـــبْنَهَا    إِنَّ الْمَنَايَـــا لاَ تَطِـــيشُ سِـــهَامُهَا
بَائَــتْ وَأَسْــبَلَ وَاكِــفٌ مِــنْ دِيمَــةٍ    يُــرْوِي الْخَمَائِــلَ دَائِمــاً تَسْــجَامُهَا

ئەوجا.. لە بەیتی پێشوودا باسی ئەو بەرخە لە شیربڕاوە و دووبارە شیرپێدراوە و ڕەنگ خۆڵاییەی کە بەکۆمەڵە دڕندەیەك، یان گەلەگورگێك، پارچە پارچەکراوە، باسی گورگەکان دەکات، کە چۆن لە ناخلافدا پەلاماری ئەو بێچووەیان داوە و داویانە بە ئەرزدا و هەریەکەیان پارچەیەك لە لاشەی بۆ خۆی ڕادەکێشێ و حیکمەتێکی عەرەبی بە نمونە دەهێنێتەوە کە دەڵێ: مەرگ تیرەکانی وێڵ نابێ و نیشانەی خۆی دەپێکێ.

ئەوجا، باسی حاڵەتێکی دیکەی مانگاکێوییەکە دەکات و دەڵێ: ئەو مانگا بەستەزمانە شەوی بەسەردا هات و نمەبارانی سووك ئەو ناو زیخ و بەردەلانەی تەڕ کردبوو، وەك باخچەی لێ کردبوو بەردەوام هەر لەسەری دەباری و ئەگەر گوێرەکە گورگخواردووەکە بمایە تێر گیای ئەخوارد و پێویستی بە شیری دایکی نەدەبوو.

تَجْتَــافُ أَصْــلاً قَالِصــاً مُتَنَبِّــذَا    بِعُجُــوبِ أَنقَــاءٍ يَمِــيُ هَيَامُهَــا
يَعْلُــو طَرِيقَــةَ مَتْنِهَــا مُتَــوَاتِراً    فِــي لَيْلَــةٍ كَفَــرَ النُّجُــومَ غَمامُهَــا

دەڵێ: ئەم مانگا کێوییە کە گوێرەکەکەی خواردراوە بەو جۆرە خۆی حەشارداوە لە پەنای بنەدارێکی لق و پۆپ بەرزدا و تاقەدارەیە و لەسەر تەپۆڵکەیەکی لمی خزی خشۆك بۆ خۆحەشاردان لە باران و تەپوتۆزی لمی دەمرەشەبای بەهێز و بارانی بەخوڕ ئەدا لەسەر پشتی ئەم گیاندارە

غەمبارە بەستەزمانە، لەشەوێکی تاریکی بێ مانگ و هەوریش ئەستێرەی شاردووەتەوە، جا وەرە بەچکەت گورگ پەل پەلی کردبێ و لە جەڵەبی هاوەڵەکان جیابوبێتەوە و بارانی بەخوڕ بدات لە پێستت و لە دوورەوە لم بێت بەسەروچاوتدا و سەرمات بێت و ترست هەبێ، چۆن بتوانرێ وەسییەت بەگوتار بکێشرێ!.

وَتُضِيءُ فِي وَجْهِ الظَّلامِ مُنِيرَةً    كَجُمَانَةِ الْبَحْرِيِّ سُلَّ نِظَامُهَا
حَتَّى إِذَا انْحَسَرَ الظَّلاَمُ وَأَسْفَرَتْ    بَكَرَتْ تَزِلُّ عَنِ الثَّرَى أَزْلاَمُهَا
عَلِهَتْ تَبَلَّدُ فِي نِهَاءِ صُعَائِدٍ    سَبْعاً تُؤَاماً كَامِلاً أَيَّامُهَا

دەڵێ: مانگای سپی شەوی تاریکی ڕۆشنکردووەتەوە، وەك مرواریيەکی گەورە کە دەریاوانی مەلەوانی شارەزا تازە بەتازە لە قەواخەکەی دەری هێناوە و بریسکەی دێت، ئەو مانگایە بەو شێوەیە بوو، بەڵام کە تاریکیی چارشێوی لەسەر لادرا و ئەویش کەوتە جوڵە و چوار پەلی لەسەر لمی تەڕ دەخزا و شۆڕ دەبووەوە بۆ ناو شیوەکە و سەری لێ شێوابوو، نەیدەزانی بۆ کام کانی سوعاد بڕوات، حەوت شەو بە ڕۆژەکەیەوە لەو شوێنە مایەوە و هەر لە شوێنی خۆی هاتووچۆی بوو.

حَتَّى إِذَا يَئِسَتْ وَأَسْحَقَ حَالِقٌ    لَمْ يُبْلِهِ إِرْضَاعُهَا وَفِطَامُهَا
وَتَسَمَّعَتْ رِزَّ الْأَنِيسِ، فَرَاعَهَا    عَنْ ظَهْرِ غَيْبٍ وَالْأَنِيسُ سَقَامُهَا

دەڵێ: ئەم حەیوانە داماوە بەم شێوە مایەوە هەتا بە تەواوی بێئومێد بوو لە بێچووەکەی و گوانەکان کە جاران پڕ بوون لە شیر پووکانەوە، کە

بەشیردان و بڕینەوەیان کەمیان نەدەکرد، بەڵام بە نەمانی شیرەخۆرەکەی و نەخواردنی ئالف پووکانەوە.

ئەوجا.. بە ئاستەم گوێبیستی هەموو خشەیەك دەبوو لەپێشەوە و لە پاشەوە و لە هەردوو قوڵی شیوەکە لە سەر و لە خوارەوە دەترسا ڕاوچی خۆیشی ڕاو بکات.

فَغَدَتْ كِلاَ الْفَرْجَيْنِ تَحْسِبُ أَنَّهُ مَوْلَى الْمَخَافَةِ خَلْفُهَا وَأَمَامُهَا
حَتَّى إِذَا يَئِسَ الرُّمَاةُ وَأَرْسَلُوا غُضْفاً دَوَاجِنَ قَافِلاً أَعْصَامُهَا

دەڵێ: زۆر دەترسا لە هەردوو سەری شیوەکە بۆشایی و سنووری ڕاوچی بوو، لە پێشەوە بن یان لە پاشەوە، هەتا ئەوکاتەی کە ڕاوچی بە تیروەشێنەکان بێئومێد بوون لە دۆزینەوەی ئەم مانگا داماوە، ئەوجا.. سەگی گوێ شۆڕی ماڵیی و فێرمڕاو و تانجی قامیش لە گەردن و مل ئاڵاویان بەردایە ناو جەنگەڵەکە بۆ ڕاوی ئەو گاکێوییانە کە خۆیان حەشارداوە و ڕاوچی ناتوانێ لەبەر چڕی دار و دەوەن، تەنها سەگی ڕاو و تانجی مۆچێنراو ئەو کارە دەکات.

فَلَحِقْنَ وَاعْتَكَرَتْ لَهَا مَدَرِيَّةٌ كَالسَّمْهَرِيَّةِ حَدُّهَا وَتَمَامُهَا
لِتَذُودَهُنَّ وَأَيْقَنَتْ إِنْ لَمْ تَذُدْ أَنْ قَدْ أَحَمَّ مَعَ الحُتُوفِ حِمَامُهَا

دەڵێ: ئەوجا، سەگ و تانجی ڕاو و قامیش لە مل و قایمدراو گەمارۆی ئەم مانگا کێوییە کە گورگ گوێرەکەکەیان خواردبوو، لە هەموولاوە ئەویش ئازایانە و بە دەست و برد کەوتە وێزەیان و بەشاخە درێژ و

تیژەكانییەوە كە وەك ڕمی دەستكردی وەستا سەمهەری بەحرەینییە لە تیژیی و قایمیی و درێژییدا، چونكە دەیزانی ئەگەر بەرگری لە خۆی نەكات، ئەوە مەرگ بە شێوەی جۆراوجۆر چاوەڕێیەتی.

فَتَقَصَّدَتْ مِنْهَا كَسَابِ فَضُرِّجَتْ    بِدَمٍ، وَغُودِرَ فِي المَكَرِّ سُخَامُهَا

دەڵێ: ئازایانە كەوتە گیانی سەگەلەكە و یەكەیەكە پەلاماری دەدان و هەر كام زۆر هار و هاج بوایە وەك سەگە بۆرەكە ناوی كەسابی بوو لە خوێنی خۆیدا گەوزانی و لەڕاونانا سەگەگەورەكە، كە ناوی بازە بوو بە عەرەبی ناوی سووخام بوو، لە كۆڵ خۆی كردەوە و هەموویانی پرش و بلاوە پێكرد بە قووزە و نووزەوە ڕاوینان.

فَبِتِلْكَ إِذْ رَقَصَ اللوَامِعُ بِالضُّحَى    وَاجْتَابَ أَرْدِيَةَ السَّرَابِ إِكَامُهَا

دەڵێ: بەم وشترە كە تراویلكە و سەرابی چێشتەنگان هەموو گرد و تەپۆڵكەكانی داپۆشی بوو، وەك پەردە و جبە خۆیدا بەسەریاندا، ئەو ڕێگەم بڕیوە!، تووخودا ئازا نەبووین من و وشترەكەم!.

أَقْضِي اللُّبَانَةَ لاَ أُفَرِّطُ رِيبَةً    أَوْ أَنْ يَلُومَ بِحَاجَةٍ لَوَّامُهَا
أَوَ لَمْ تَكُنْ تَدْرِي نَوَارُ بِأَنَّنِي    وَصَّالُ عَقْدِ حَبَائِلٍ جَذَّامُهَا
تَرَّاكُ أَمْكِنَةٍ إِذَا لَمْ أَرْضَهَا    أَوْ يَرْتَبِطْ بَعْضَ النُّفُوسِ حِمَامُهَا

دەڵێ: من بەم وشترە ئەرك و پێداویستی خۆم جێبەجێ دەكەم، هەرگیز سستیی و كەمتەرخەمیی ناكەم و نەمكردووە، مەگەر لە ترسی

تەشـەر و لۆمـەی لۆمەکـەران هەنـدێ کـاری پـێ ئەکـەم، ئـەم وشـترە هـەر کارێکی پێ بکەم ئامادەیە، دیدەنی پـێ بکـەم، زیـارەتی پـێ ئەکـەم لەگـەڵ خواستی مندایە، ئەوجا.. ڕوو دەکاتە تەوارخانی نیونەتۆراو و پەیوەندیی نەماوی و دەڵێ: باشە تەوار مـن ناناسـێ و نـازانێ مـن هەرکـەس حـەز لـە پەیوەنـدیم بکـات پەیوەنـدی گـەرمی لەگـەڵ دەکـەم و هەرکـەس نیـازی پچڕانی پەیوەندیی هـەبوو منـیش هـەموو پـەت و مـەوداکان دەبـڕم، هـەر جێگە و شوێنێك کە حـەزی لێ نەکەم هاتووچۆی ناکەم، مەگـەر ئەجـەلی هەندێ کەس (کە خۆیەتی) هاتبێ ئەوکاتە مەرگ دەمبات.

بَـلْ أَنْـتِ لا تَـدْرِينَ كَـمْ مِـنْ لَيْلَـةٍ     طَلْـــقٍ لَذِيـــذٍ لهْوُهَـــا وَنِـــدَامُهَا
قَــد بِــتُّ سَــامِرَهَا وَغَايَــةَ تَــاجِرٍ     وَافَيْــتُ إِذْ رُفِعَــتْ وَعَــزَّ مُــدَامُهَا
أُغْلِـي السِّـبَاءَ بِكُـلِّ أَدْكَـنَ عَـاتِقٍ     أَوْ جَوْنَــةٍ قُــدِحَتْ وَفُــضَّ خِتَامُهَــا
بِصَـبُوحِ صَــافِيَةٍ وَجَــذْبِ كَرِينَــةٍ     بِمُــــوَتَّرٍ تَأْتَالُــــهُ إِبْهَامُهَــــا

ئەوجا.. شاعیر هەندێ لـە شـەوانی ڕابـواردن و خۆشـگوزەرانـدن لەگـەڵ تەوارخانـدا بـاس دەکـات و بـیری دەخاتـەوە کـە بـیری چـووە زۆر شـەو بەیەکـەوە شەوچـەرەمان بـە مـەی خواردنـەوەوە بـووە و ڕامـانبواردووە، شەوی سایەقەو سامالّی و بەتام و خۆش، بە جۆرەها ڕابـواردن و هـاوڕێ و هاومەزەبووین، من لەو شەوانەدا هاتووچوونی دووکانی مـەیفرۆش بـووم، کە بـە ئاشـکرا پەرچـەمی خـۆی لەسـەر ماڵەکـەی هـەڵکردبوو بـۆ هێنـانی مەیی کۆن و گران و نایاب و کڕیاری هەمیشەیی من بووم، لـە کوپـە بـۆرە خۆڵاوییەکەی کە شەرابی پوختە و پاکی تێدا بوو، سەر مۆربوو، یـان ئـەو

گۆزە و دێزەی ناوچاڵ و ژورەکان کە تازەبەتازە قوڕی سەری لابرابوو و مۆرەکەی کە مێژوی زۆر کۆنی لەسەر تۆمار کرابوو لادەدرا بۆ من، کە لەگەڵ ئەو مەیە کۆنەدا کیژی کەمانچەژەن و زێڕوبەم کە بە پەنجە ناسك و نەرمەکەیان ژێی عود و کەمانی دەژەن بە شەرابی کوپەی سەربەقیر و زەفتگیراوەی کۆن و گۆرانیبێژی دەست و پەنجە نەرم دەگەڕامەوە بۆلای تۆ (تەوار خان) و هاودەمەکانم، ئەومت لەبیر چووە؟.

بَـاكَرْتُ حَاجَتَهَـا الـدَّجَاجَ بِسُـحْرَةٍ      لِأُعَـلَّ مِنْهَـا حِـينَ هَـبَّ نِيَامُهَـا
وَغُـدَاةِ رِيـحٍ قَـدْ وَزَعْـتُ وَقِـرَّةٍ      إِذْ أَصْـبَحَتْ بِيَـدِ الشـمَالِ زِمَامُهَـا
وَلَقَدْ حَمَيْتُ الْخَيْلَ تَحْمِـلُ شِـكَّتِي      فُـرُطٌ وِشَـاحِي إِذْ غَـدَوْتُ لِجَامُهَـا

دەڵێ: من ئەو کەسە بەرچاوتێرەم کە هاوڕێی خۆم تێر و سڕ کردووە لە مەی، لەگەڵ خوێندنی مریشکدا (مەبەستی کەڵەشێرە)، بۆ ئەوەی دووبارەی بکەمەوە کاتێ خەوتووەکانی مەی و مەستەکانی وەخەبەر دێن لە ئێوارەی باوبۆران هەندێ کات وازم دەهێنا و لە سەرمای زۆریش کە بای باکور جڵەوی ڕاکێشابووە سەر دانیشتنەکانمان، بەم حاڵەش هەر ئاگام لەخۆم بووە و ئەسپەکەم کە هەموو چەك و سیلاحی هەلگرتبووم پاراستووە، لەناوی ئەسپەکەم وەك ڕم و شمشێر بە دەست لە کەمەرم بۆ ئامادەبوونی هەمیشەیی، مەبەستی ئەوەیە لەکاتی جەنگ و هەرادا ئاوزەنگی ئەسپەکەم و ڕەشۆ و لەغاوەکەی لە پشتم دەبەست و هەموو چەکم ئامادەبوو بۆ ڕاونانی دوژمن، واتە تەنها پیاوی ڕابواردن نیم، بەڵکو جەنگاوەرم، سەربازم.

فَعَلَوْتُ مُرْتَقِباً عَلَى مَرْهُوبَةٍ    حَرَجٍ إِلَى أَعْلاَمِهِنَّ قَتَامُهَا
حَتَّى إِذَا أَلْقَتْ يَداً فِي كَافِرٍ    وَأَجَنَّ عَوْرَاتِ الثُّغُورِ ظَلاَمُهَا
أَسْهَلْتُ وَانْتَصَبَتْ كَجِذْعِ مُنِيفَةٍ    جَرْدَاءَ يَحْصَرُ دُونَهَا جُرَّامُهَا
رَفَّعْتُهَا طَرَدَ النَّعَامِ، وَفَوْقَهُ،    حَتَّى إِذَا سَخُنَتْ وَخَفَّ عِظَامُهَا

دەڵێ: من پاسەوانی سوارەکانی هاورێم دەکەم و چاودێریی پێداویستییان دەکەم لە شوێنی سەنگەری چاودێریی لە شاخە بەرزە سامناکەکە، کە لە لێرەوار و بێ رێگە و چڕ و دارستانەکە تۆزی سمی وڵاخەکان بەرز بووەتەوە بۆسەر پۆپەکەی چیاکە، هەتا ئەو کاتەی کە خۆر دەستی لە کۆڵ دەرودەشت هەلگرت و تاریکیی باڵی کێشا بەسەر چیاو دۆڵەکاندا، مەرز و سنووری پاسەوانی مەترسیدار تەواوی شارایەوە، ئەوکات من هاتمە خوارەوە بۆ پاینی دەشتەکە، ئەسپەکەم وەك پەیکەری دارخورما ڕوتکرایەوە لە خوس و سەعفی سەروبنی، کە داربڕەکەی زۆر ماندوو بووە، هەتا ڕوونی کردوەتەوە، ئا لەوکاتەدا ئاوزەنگیم لە ئەسپەکەمدا بۆ پێشەوە، وەك ڕاوی نەعامە بکەم هەتا تەباتر ئارەقەی بکردایە لەش و ئێسك و بەدەنی زیاتر سووك دەبوو.

قَلِقَتْ رِحَالَتُهَا، وَأَسْبَلَ نَحْرُهَا،    وَابْتَلَّ مِنْ زَبَدِ الْحَمِيمِ حِزَامُهَا
تَرْقَى وَتَطْعَنُ فِي الْعِنَانِ، وَتَنْتَحِي    وِرْدَ الحَمَامَةِ إِذْ أَجَدَّ حَمَامُهَا
وَكَثِيرَةٍ غُرَبَاؤُهَا مَجْهُولَةٍ    تُرْجَى نَوَافِلُهَا وَيُخْشَى ذَامُهَا

دەڵێ: کە ئەسپەکەم تاودەدا بەرەو دوژمن، یان بەرەو ڕێگەی دوور، زێنم لابردبوو تەنها سەر زێنەکەی لەسەر پشت بوو، کە پێسەی خۆشەکراوی بەرخ بوو بە بەرگنەوە لەسەر پشتی هەر جیرەی ئەهات و ئەجولاو سنگ و بەرەکی ئاوی گەرمی لێ ئەچۆڕا و لەغاو و ڕەشمەکەی تەڕ دەبوو لەبەر ئارەقەی زۆر، لەگەڵ ئەم حاڵەش زیاتر چالاك دەبوو، سەری بەرز دەکردەوە و لەغاوی توند ڕادەکێشا بۆ زیاتر غاردان و هەنگاوی دەهاویشت، وەك کۆتری تینوو کە بۆ سەر ئاوخواردنەوە فونەی دەکرد، یان سوێسکەی تینوو بۆسەر کانی و ئاو.

ئەوجا دێتە سەر باسی ئازایەتی خۆی کە بە ڕستەیەك باسی کردووە، زۆر مانا هەڵدەگرێ: زۆر کۆڕ و کۆمەڵ، زۆر کەپر و سابات و کۆشك، زۆر جەنگ و مەرهەڵە، زۆر تاقم و دەستە، کە نامۆ و نەناسراوی زۆری تێدابوو، کەس کەسی نەدەناسی و ئەنجامەکەی نەزانراو بوو، زاناو نەزان، ئازاو ترسنۆك، وەك یەك ئەنجامەکەیان دەزانی، ئومێدی خەڵات و بەرات و دەسکەوت و سوودی زیادە هەبوو، ترسی شکست و نوچدان و زیانی زۆریشی هەبوو، ئەم شاعیرە پیاوی ئەو مەیدانەیە.

غُلْبٌ تَشَذَّرُ بِالذُّحُولِ كَأَنَّهَا ... جِنُّ الْبَدِيِّ رَوَاسِياً أَقْدَامُهَا
أَنْكَرْتُ بَاطِلَهَا، وَبُؤْتُ بِحَقِّهَا ... يَوْماً، وَلَمْ يَفْخَرْ عَلَيَّ كِرَامُهَا

دەڵێ: لەو جێگەیانەی کە لە پێشەوە باسمکردن سادەو ساکار نەبوون، بەڵکو پیاوی ڕەق و ناحاڵیی و زبر و شان و باهو قایم و جلف و دەشتەکیی و لادێیی شاری جنۆکەکانی شیوی ڕەواسی بوون کە هێز و

توانایان وەك چیای بەرز لە زەوی گیر بووبوو، من لەو جێگەیانەدا ڕاست و درووست دژی ناحەقیی بووم و هەر بابەتێ کە باس کرابێ مافی خۆیم داوەتێ و کەس نەیتوانیوە شانازییم بەسەردا بکات، مەردی مەیدان و پیاوی ئەنجومەن بووم!.

وَجَـزُورِ أَيْسَـارٍ دَعَـوْتُ لِحَتْفِهَـا        بِمَغَـالِقٍ مُتَشَـابِهٍ أَعْلاَمُهَـا
أَدْعُـو بِهِـنَّ لِعَـاقِرٍ أَوْ مُطْفِـلٍ        بُـذِلَتْ لِجِـيرَانِ الْجَمِيـعِ لِحَامُهَـا
فَالضَّـيْفُ وَالْجَـارُ الْغَرِيـبُ كَأَنَّمَـا        هَبَطَـا تَبَالَـةَ مُخْصِـباً أَهْضَـامُهَا

دەڵێ: تەنها سیفەتی ئازایەتیی و نەبەردیی و سوارچاکیی کۆتا نییە لە مندا، بەڵکو لە خان و دیوەخان و سفرەدا زۆر وشترێ کە یاریکەران گرەویان لەسەر دەکرد لەبەر قەڵەویی و جوانیی من ئەو وشترەم سەربڕیوە بۆ هاوەڵەکانم، کە تیری حەوتەمی قوماری باوی عەرەب لەسەری دادەنرا، لەبەر ڕەسەنیی و لەناو کۆمەڵە ڕەوێکی وشتردا کە نیشانە و داخەکانیان وەك یەك بوون و خۆم نیشانەم کردبوون، بەم ڕەوە وشترە گرەوم دەکرد لەسەر وشتری قسر کە زۆر قەڵەوە، یان بێچوودار، کە زۆر بەنرخە و گۆشتەکەم دابەشدەکرد بەسەر هەموو هاوسێ و دراوسێدا، ئەو کاتە میوان و ڕێبوار و غەریب ئەوەندە تێر دەبوون وەك تێربوونی ڕانەمەڕێك لە دۆڵی نەیالە، کە گیاو گزرەی زۆری تێدایە و ئاژەڵ باش تێر دەبێ.

تَـأوي إِلَـى الأطْنَـابِ كُـلُّ رَذِيَّـةٍ    مِثْـلِ الْبَلِيَّـةِ قَـالِصٍ أَهْـدَامُهَا
وَيُكَلِّلُـونَ إِذَا الرِّيَـاحُ تَنَاوَحَـتْ    خُلُجـاً تُمَـدُّ شَـوَارِعاً أَيْتَامُهَـا
إِنَّـا إِذَا الْتَقَـتِ الْمَجَـامِعُ لَـمْ يَـزَلْ    مِنَّـا لِـزَازُ عَظِيمَـةٍ جَشَّـامُهَا

**دەڵێ: ماڵی ئێمە هەمیشە شوێن حەوانەوە و پشووی بێوەژن و هەتیوو و ئافرەتی بێکەس و بێ پەنایە، کە لەژێر سێبەری ڕەشماڵەکەماندا دەحەسێنەوە، وەك ئەو وشترەی پاش مەرگی خاوەنی کەس جێگەی ناکاتەوە، بەڵام لەبەر ماڵی ئێمە دەژی و هەمیشە خوانی بەردەمی ئەو بێوەژن و هەتیوانە پڕە لە گۆشتی برژاو لە سفرەکەیاندا لە کاتی گرانیی و قاتووقڕیی و هەڵکردنی بای سەختی زستان و بێ نان و بێ شوێنی گەرمیش، ماڵی ئێمە دەیان ژنە هەژاری بێ پەڕوباڵ لەگەڵ هەتیووی ڕووت و قووت لەبەردەمیاندا جام و کاسەی پڕ لە گۆشتاویان لە بەردەم دانراوە، منداڵەکان ئەمیان بۆ ئەویان بەناو (لەنگان)دا بۆ یەکدییان بەشەقامدا ڕەوانە دەکردنە کاسەکە گەورەیە، وەك کەناری ڕووبار دەنوێنێ، لە عەشیرەتی ئێمە لە هەر کۆڕ و کۆبوونەوەیەکدا ئامادەبن ئەرکی خزمەتی ئەو کۆڕە لە ئەستۆی ئەوانە، ئێمە پشکۆڵی دەرگای هەموو کارەساتێکی قورسین، خۆمان شانمان داوەتە بەری لەسەر داوای کەس نییە.**

وَمُقَسِّـمٌ يُعْطِـي الْعَشِـيرَةَ حَقَّهَـا    وَمُغَـذْمِرٌ لِحُقُوقِهَـا هَضَّـامُهَا

دەڵێ: گەورە پیاوی ئێمە لەکاتی دابەشکردنی دەسکەوتدا مافی هەموو کەس لە تاکەکانی عەشیرەت دەدات و دەست دەکات بە قورگی ئەوەی ئەو کەسەی کە دەیەوێ مافی هۆزی ئێمە بخوات، کەس ناتوانێ بێ فەرمانی دابەشکاری خێڵی ئێمە بکات، ئێمە بە ڕاستیی سەرەککۆماری خێڵێن!.

فَضْلاً، وَذُو كَرَمٍ يُعِينُ عَلَى النَّدَى   سَمْحٌ كَسُوبُ رَغَائِبٍ غَنَّامُهَا
مِنْ مَعْشَرٍ سَنَّتْ لَهُمْ آبَاؤُهُمْ   وَلِكُلِّ قَوْمٍ سُنَّةٌ وَإِمَامُهَا

دەڵێ: ئەو کار و ئەرکەی ئەنجامی دەدەین تەنها پیاوەتیی و گەورەیی و کەرەم و دەستگوشادییە کە مافی خەڵك دەدەین بۆ بەخشندەیی و دڵفراوانیی، لە دەسکەوتی بەدەست هاتوو لە دوژمنەکانمان بێ ئەندازە بەخشندەین، ئێمە ئەم ڕەوشتەمان لە باوکەوە بۆ دانراوە، هەر خێڵ و نەتەوەیەك ڕەفتار و ئاکاری خۆی هەیە.

إِنْ يَفْزَعُوا تُلْقَ الْمَغَافِرُ عِنْدَهُمْ   وَالسِّنُّ يَلْمَعُ كَالْكَوَاكِبِ لاَمُهَا
لاَ يَطْبَعُونَ وَلاَ يَبُورُ فَعَالُهُمْ   إِذْ لاَ تَمِيلُ مَعَ الْهَوَى أَحْلاَمُهَا

دەڵێ: ئەم خێڵی ئێمە ئەگەر مەترسی ڕووی تێ کرد و هێرش کرایە سەریان لە نەترسان و بێ منەتیی لە دوژمن خودەکانیان فڕێ دەدەن و بریسکەی شمشێر و ڕمەکانیان وەك جریوەی ئەستێرە شەوق ئەداتەوە بە شێوەی درعەکانیان، چونکە هەمیشە ئامادەن و دوژمن ناتوانێ غافلگیریان بکات، لەگەڵ ئەوەش هەرگیز ناموس و شەرەفی خۆیان لەکەدار ناکەن و کاری ناشیرین و دوور لە ئەدەب ناکەن، عەقڵ و هۆشیان زاڵە بەسەر

هەست و ئارەزووەکانیاندا، زۆر پابەندن بە ڕەوشت و نەریتی بەرزی خێڵەکەمانەوە.

فَبَنَوْا لَنَا بَيْتاً رَفِيعاً سَمْكُهُ فَسَمَا إِلَيْهِ كَهْلُهَا وَغُلاَمُهَا
فَاقْنَعْ بِمَا قَسَمَ الْمَلِيكُ فَإِنَّمَا قَسَمَ الْخَلاَئِقَ بَيْنَنَا عَلاَّمُهَا
وَإِذَا الأَمَانَةُ قُسِّمَتْ فِي مَعْشَرٍ أَوْفَى بِأَعْظَمِ حَظِّنَا قَسَّامُهَا

دەڵێ: پێشەوای هۆزی ئێمە لە خودا بەزیادبێ ماڵێکی بۆ ئێمە دروستکردووە، کە کۆڵەکە و پایەکەی بەرز بووەتەوە بۆ سەرەوە و لەپەنای ئەو کۆشکەدا پیر و جوان باڵای بەرز و بەڕێزە، کەواتە برای گوێگر قانعبە بە بەشی خودا کە خاوەن فەرمان و بە دەسەڵاتە، چونکە زانا و بە توانا ئەم داب و ڕەوشت و خووە پەسەندەی دابەشکردووە، خۆی ئەزانێ چۆنی بەش دەکات و بە کێی ئەدا و لەکوێ ئەیدا، چونکە پاکیی و چاکیی کە دابەشکرا حەق تەعالا بەشی زۆری بە ئێمە بەخشی، چونکە شایستەی ئەو بەشەین.

فَهُمُ السُّعَاةُ إِذَا الْعَشِيرَةُ أُفْظِعَتْ وَهُمُ فَوَارِسُهَا وَهُمْ حُكَّامُهَا
وَهُمُ رَبِيعٌ لِلْمُجَاوِرِ فِيهِمُ وَلْمُرْمِلاَتِ إِذَا تَطَاوَلَ عَامُهَا
وَهُمُ الْعَشِيرَةُ أَنْ يُبَطِّىءَ حَاسِدٌ أَوْ أَنْ يَلُومَ مَعَ الْعِدَى لَوَّامُهَا

ئەگەر قەومەکەمان تووشی کارەساتی گرانیی، وشکە ساڵیی، درم و هێرشی بیانیی و شکستیی (خوانەخواستە) هێنا، ئەو هۆزە بەڕێزە ئامادەیە بە یەکەوە ئەرکی هەمووان جێبەجێ بکەن، بە یەکەوە شان

ئەدەنە بەر هەر كارێك كە بەسەرماندا هاتبێت، ئەوانە سواری ڕۆژی تەنگانە و فەرمانڕەوای دەسەڵاتداری ئێمەن و ئێمەش گوێڕایەڵی گەورەی خۆمانین.

ئەم خێڵەی ئێمە تەنها بۆ خۆمان خاوەن چاكە و مەردایەتیی و پیاوەتیی نین و بەس، بەڵكو بۆ هاوسێ و هاوپەیمان داواخوازی یارمەتیدەرە، وەك بەهار بەخشندەیە، پەنای لێقەوماو و بێ ماڵ و حاڵە، هەر ئافرەتێك كە مێردی مردبایە و بە بێوەژنیی مابایە، ئێمە داڵدەمان دەدا و بەخێومان دەكرد، ئەوە نەتەوەیە، ئەوە عەشیرەتە، ئەوە هۆزی جێگەی متمانەیە، كە داخ لە دڵ و ئیرەییبەر ناتوانێ بە بچووكترین وشە و ڕستە سووكایەتیی پێ بكات، یان لۆمە و سەرزەنشتی بكات، یان ڕەخنەی بێ جێگەی لێ بگرێ و لەگەڵ دوژمن پەلاماری بدات، هەموو یەك دەست و یەك بازوو هێزین بۆ یەكتری، هەموو بۆ هەموو لادان نەبوو، هەموو بۆ هەموو بۆ چاكە بۆ هەموو، بۆ هەموو پشت و پەنابوو.

(ئەوە پوختەی مەبەستی ئەم شاعیرەیە، كە بە حەقی خۆی ناو و چامەكەی بە دەرگای كەعبەی شەریفدا هەڵواسراوە، چونكە هەر مانای پیاوەتیی و ڕەوشتیی بەرز و بەخشندەیی و بە دەم هەژار و هەتیوو و بێوەژن و لێقەوماوەوە چوون، ئەوە دەرسە بۆ هەموو نەتەوەیەك، بەتایبەتی نەتەوەی كورد).

# عەنتەرە كوڕی شەداد

## ٥٢٥- ٦١٥زاینی

عەنتەرەی كوڕی شەدادی عەبسی، لە ژنێكی قولەڕەش لە دایكبووە، لەبەر ئەوە ڕەشپێست بوو، لێوی خواری دوولەت بوو، لەبەر ئەوە ناوی (عەنتەرە كەل) بوو، یەكێكە لە (نامۆ عەرەبەكان)، هەرچەندە ئەم شاعیرە بەندە و كوڕی بەندە بوو لە دایكییەوە، بەلاَم ئازا، نەبەردە، بەڕەوشت و نەفس بەرزە، پاكداوێنە، شەڕكەری دەسكەوتنەویستە، تەنها بە ئازایەتیی خۆی شوێنی بلَندی لەناو هۆزەكەی بردووەتەوە، وەك دەلَێن حەزی لە كچە ئامۆزای خۆی (عەبلە) كردووە و لەسەر ئەم دلَدارەییە چیرۆكی عەنتەرە دروستبووە، زۆر چامەو شیعر بە ناوی ئەم شاعیرەوە هەلَبەستراوە، بەلاَم ئەوەی جێگەی گومان نییە ئەم هەلَواسراوە زێڕینەیە كە ورەبەرزیی، دەرونبالاَو پەسەندە، وێنەكێشانی ورد، پتەویی داڕشتن لە دەستەواژە، شانازی زۆری بەخۆیە، ناوی ئوسلوبی عەنتەرەیە، نەوەد سالَ ژیاوە، چامەكەی لە هەشتا بەیتەوە هەتا زیاتر باسكراوە، بەلاَم ئێمە بە هەشتا كوردادندومانە، تەرجەمەكراوە بە هەموو زمانە زیندووەكان و زۆر گرنگی پێدراوە.

ئەم قەسیدەیە بەم شێوەیە دابەش دەبێت: یاری هەوار و دووری یار (١-١٣)، باسی عەبلەخانی دۆستی (١٤-٢١)، باسی وشترەكەی لە (٢٢-٣٤)، دووبارە باسی عەبلە لە (٣٥-٣٧)، ئەوجا باسی ڕابواردن و جەنگاوەریی و ژن و شانازیی بەخۆیەوە.

# هەڵواسراوی عەنتەرەی كوڕی شەداد

هَلْ غَادَرَ الشُّعَرَاءُ مِنْ مُتَرَدَّمِ أَمْ هَلْ عَرَفْتَ الدَّارَ بَعْدَ تَوَهُّمِ؟
يَا دَارَ عَبْلَةَ بِالْجِوَاءِ تَكَلَّمِي وَعِمِي صَبَاحاً دَارَ عَبْلَةَ وَاسْلَمِي

دەڵێ: شاعیرە كۆنەكان، خانوویەكی ئەدەب ماوە سەریان پێدا نەكردبێ، مەبەستێكی شیعر ماوە كە دەستیان بۆ نەبردبێ، شوێن ماوە ڕوخابێ و ئەوان چاكیان نەكردبێتەوە؟، نەخێر!، هیچ بۆ ئێمە نەماوەتەوە جگە لەوە شوێن پێی ئەوان بكەوین، ئەوجا، دەزانی سەر بە كام ماڵدا دەكەی و دەیناسییەوە؟، مەگەر بە گومان!.

دە ئەی هەواری عەبلەكە لە دەشتی نەجدی قسە بكە، وەڵامم بدەرەوە، ڕۆژ باش، یاخوا بێوەی بی و بێ دەرد و بەڵابی!.

فَوَقَفْتُ فِيهَا نَاقَتِي وَكَأَنَّهَا فَدَنٌ" لأَقْضِيَ حَاجَةَ الْمُتَلَوِّمِ
وَتَحُلُّ عَبْلَةُ بِالْجِوَاءِ وَأَهْلُنَا بِالحَزْن فَالصَّمَّان فَالْمُتَثَلَّمِ
حُيِّيتَ مِنْ طَلَلٍ تَقَادَمَ عَهْدُهُ أَقْوَى وَأَقْفَرَ بَعْدَ أُمِّ الْهَيْثَمِ

پاش ئەوەی سەری لە هەوارگەی ماڵی عەبلەدا و ڕۆژباشی لێكرد و ئازار و ژانی دووری یار سەری لێدەدا و دەڵێ: ڕاوەستام لەو هەوارەی یار بە سواری وشترە مێینەكەم، كە بەرز و گەورەیی وەك تەلارێكی بەرز دەبینرا، بۆ ئەوەی دەردەدڵی خۆمی لا باس بكەم و گلەو گازندەی خۆم بكەم، بۆچی هەتا ئێستا دیدەنی ئەم هەوارەم نەكردووە، هەرچەند

گوناهم نییه، چونکه ماڵی عەبلە لە جەوای نەجدەوە دوورە و دوژمنی لێیە و هۆزی ئێمەش لە حەزمنە، ئەوجا، لە سەممانە، ئەوجا، لە مووتەسەلیم زۆر دوورین لەیەکتر، دەك سلاوت لێ بێ دیوارە ڕوخاوەکان، ئاسەوارە کۆنەکان، چەندە کۆنن و چەندە چۆڵ و چەندە نائاوەدانن!، دورای دایکی هەیسەم.

حَلَّتْ بِأَرْضِ الزَّائِرِينَ فَأَصْبَحَتْ     عِسِراً عَلَيَّ طِلاَبُكِ ابْنَةَ مَخْرَمِ
عُلِّقْتُهَا عَرَضاً وَأَقْتُلُ قَوْمَهَا     زَعْماً لَعَمْرُ أَبِيكَ لَيْسَ بِمَزْعَمِ

دەڵێ: جا وەرە بە تەمای دیدەنی عەبلەبم و ئەویش باروبارگەی لەناو هۆزێکی تر خستووە، وەك شێری بێشە نرکەو ناڵەیان دێ، چۆن ئەتوانم داوات بکەم، کچی مەخرەم!، بە ڕاستی قورسە، ئەم دڵداری و ئەڤینەی من!، بە سودفە حەزم لێ کردووە و هۆزەکەی دوژمنمە و ئەیانکوژم.

(ئەوە چۆن دڵدارییەکە حەزت لە کچیان بێت و بە دوای کوڕیانەوە بیت بۆ کوشتنیان، ئەوە تەنها لە عەرەبدا ڕوویداوە، کوڕی کورت ئەکوژن و حەزیان لە کیژی پاك و پاکیزەی کوردە!، سەیرە!، یان ئەم دڵدارییە ناڕاستە، یان ئەم دوژمنکارییە لەگەڵ خێڵی دولبەر).

قَدْ نَزَلْتِ فَلا تَظُنِّي غَيْرَهُ     مِنِّي بِمَنْزِلَةِ الْمُحَبِّ الْمُكْرَمِ
كَيْفَ الْمَزَارُ وَقَدْ تَرَبَّعَ أَهْلُهَا     بِعُنَيْزَتَيْنِ وَأَهْلُنَا بِالْغَيْلَمِ؟

دەڵێ: تۆ لەناو مەنزلگەی دڵما جێگات بوومتەوە و تەنها جێگەی تۆی تێدابوومتەوە و کەسی تری تێدا نییە، جێگەت شوێنی دڵداری ئەڤینداری

ڕێـزدار و هێژایـە، ئـەوجا.. پرسـیارێکی بـێ وەڵام دەکـات و دەڵـێ: چـۆن دەتوانم بێم بۆلات و چۆن دەتوانم بە دیداری عەبلە بگەم؟، ئەوان لەگـەڵ هۆزەکـەیان بـەهارە هـەواریان لـە عونەیزەتەینـە و هـۆزی ئێمـەش لـە غەیلەمە و دووری ئەم دوو هەوارەش زۆرە و ئەستەمە دیدەنی.

إِنْ كُنْـتِ أَزْمَعْـتِ الْفِـرَاقَ فَإِنَّمَـا    زُمَّـتْ رِكَـابُكُمْ بِلَيْـلٍ مُظْلِـمِ
مَـارَاعَنِي إِلاَّ حَمُولَـةُ أَهْلِهَـا    وَسْطَ الدِّيَارِ تَسَفُّ حَبَّ الْخِمْخِمِ

دەڵێ: خانمەکەم تۆ خۆت پێشوەخت بڕیاری جیابوونەوەت داوە و کۆچ و بار و کاروانی وشترەکانتان باشە و ئامـادەکردووە بـۆ سـەفەر، بـۆ ئـەوەی کـەس نـەزانێ بـۆ کـوێ دەچـن، ئـەوەی منـی تووشـی سەرسـوڕمان کـرد ئەوەبوو کە بارگەوبنەی ئەم خێڵە گوزەریان کردبـوو بـە ناوچـەیەکدا کـە پـووش و گیـای نـەمابوو، ئاژەڵـەکانیان تـەنها تـۆوی گیـای چـاوبازەڵەی وشکیان خواردبوو، کە هەر حەیوانێ خواردی شیری نابێ.

فِيهَـا اثْنَتَـانِ وَأَرْبَعُـونَ حَلُوبَـةً    سُـوداً كَخَافِيَـةِ الْغُـرَابِ الْأَسْـحَمِ
إِذْ تَسْتَبِيكَ بِـذِي غُـرُوبٍ وَاضِـحٍ    عَـذْبٍ مُقَبَّلُـهُ لَذِيـذِ المَطْعَـمِ
وَكَـأَنَّ فَـارَةَ تَـاجِرٍ بِقَسِـيمَةٍ    سَـبَقَتْ عَوَارِضَـهَا إِلَيْـكَ مِـنَ الفَـمِ

دەڵێ: ئەم خێڵەی عەبلەخان زەنگین و دەوڵەتدارن، لەم کۆچ و بارەیـان بەس وشتری بارکراو چل و دوو وشترە و هەموویان شیرەدەرن، واتە چـل و دوو بەچکە وشتریان لە دواوەیـە، ئـەوە جگـە لـە وشـتری کـەژاوەی ژنـان و سواری خۆیان و شوانەکانیان، تەواوی وشترەکان ڕەشی یەك نیشانەن، وەك

پەڕی ژێرەوەی قەلەڕەشکە کە زۆر بەنرخترن لە ڕەنگی تر، ئەڵێ: ئا لەوکاتەدا دڵ و گیان و هەستت بە تالان دەبات، کە دەمی دەکاتەوە و زەردەخەنەی ناسکی ددانە سپی و جوانەکانی دەردەکەوێ، خوا داینـاوە لێوت لەبان دەمی دابنێی و ماچی زۆر بەلەزەتە و وادەزانی پریاسکەی میسکە، کە لە عەتار تازە کڕاوە لە دەمی دەبارێ و بۆنی بۆلای تۆ دێت.

أَوْ رَوْضَـــةً أُنُفـــاً تَضَـــمَّنَ نَبْتَهَـــا    غَيْـثٌ قَلِيـلُ الـدِّمْنِ لَـيْسَ بِمَعْلَـمِ
جَـادَتْ عَلَيْـهِ كُـلُّ بِكْـرٍ حُـرَّةٍ    فَتَـرَكْنَ كُـلَّ قَـرَارَةٍ كَالـدِّرْهَمِ

جا وەرە بۆنی ئەو دەم و ددان و لێوە بکە و دەمی پێوە بنێ، کە وەك حەتحەتۆکەی میسکی پێدا کراوە، یان باخەگوڵباخێکە کە تازە بە تازە خونچەکانیان پشکووتوون و کەمێ بارانی لەسەر باریوە، دڵۆپە باران لەسەر گوڵەکان بۆنی عەتر و عەبیریان باخچەکەی گرتووەتەوە، ئەو نمە بارانە لە هەوری بەهار باریووە سارد و پاك و خاوێن و شیرینە و دانەدانەی ددانەکانی وەك دراوی درهەم کە لەزیوی پوختە داڕێژرابێ دەردەکەوێ، بارانی بەهار لەسەر گوڵی دەم و لێوی تازە گەشاوەی باریبێ، ئاخۆ چەند جوان و بەتام و بۆن و بەڕەنگن.

سَـحّاً وَتَسْـكَاباً فَكُـلَّ عَشِـيَّةٍ    يَجْـرِي عَلَيْهَـا الْمَـاءُ لَـمْ يَتَصَـرَّمِ
وَخَـلاَ الـذُّبَابُ بِهَـا فَلَـيْسَ بِبَـارِحٍ    غَـرِداً كَفِعْـلِ الشَّـارِب الْمُتَـرَنِّمِ
هَزِجـاً يَحُـكُّ ذِرَاعَـهُ بِذِرَاعِـهِ    قَدْحَ الْمُكِـبِّ عَلَـى الزِّنَـادِ الْأَجْـذَمِ

دەڵێ: بارانی بەهاری دەبارێ بەسەر ئەو گوڵە تازە پشکووتووانەدا، بەهێمن و ئارام، هەموو ئێوارەوەختەیەك تەڕیان دەکات و ئاو پرژێنیان دەکات و گۆنای پەڕەگوڵەکان تەڕ ئەکات و ئاوی لێ نابڕێ و سیس نابێ، مێش و مەگەز و مێشوولەی نییە، هەتا گیزەگیز بکات وەك ئەو دەنگەی ئاوخۆر بۆ خۆی دەڵێتەوە، وەك شێوە فیکەی تووتی ئاوخۆر، کە بەشێوەی لەرزانە و سەوزەڵەخانم گۆرانی دەڵێ و دەستی ناوەتە بناگوێی خۆی، دەستی دەلەرێنێتەوە وەك ئەو دەستگۆجەی بە ئانیشکی دەیەوێ ئاگر بکاتەوە، بەداری (مەرخ و عەفار) کە دوو دارە بە لەیەکخشان ئاگر دەکەنەوە، با هەردوو تەڕیش بن، ئەم وەسفە وردە بە زیندوویی بینراوە، بۆیە شاعیر توانیویەتی باسی بکات.

تُمْسِي وَتُصْبِحُ فَوْقَ ظَهْرِ حَشِيَّةٍ    وَأَبِيتُ فَوْقَ سَرَاةِ أَدْهَمَ مُلْجَمِ
وَحِشِيَّتِي سَرْجٌ عَلَى عَبْلِ الشَّوَى    نَهْدٍ مَرَاكِلُهُ نَبِيلِ الْمَحْزَمِ

جا وەرە ئەم کچە شۆخ و شەنگ و سەروەنازە کە لەم نازو نیعمەتەدا بژی و ناسك و ترچك و بۆنخۆش و غونچەدەم، ئێوارەو بەیانی لەسەر دۆشەکی نەرم و پەڕی باڵدار و منیش لەسەر زێنی ئەسپە بۆر و ڕەق و تەق و لەغاوکراوەکە، جل و سەرجل و ژێرجلەکەی لەسەر پشتی ئەسپەشێی ساق و لاق قایم و پێ لە ئاوزەنگی ڕەق و گەورە، ئەوە ژیانی ئەو و ئەمەش ژیانی من، بەخوا زۆریان فەرقە.

هَلْ تُبْلِغَنِّي دَارَهَا شَدَنِيَّةٌ    لُعِنَتْ بِمَحْرُومِ الشَّرَابِ مُصَرَّمِ
خَطَّارَةٌ غِبَّ السُّرَى، زَيَّافَةٌ    تَطِسُ الإِكَامَ بِذَاتِ خُفٍّ مِيثَمِ

دەڵێ: چی من دەگەیەنێ بە یار؟، ئایا وشترێکی یەمەنی شەدەنی، یاخوا شیرەکەی وشك بکات و ئاوی لێ قەدەغە بکرێ و سمی زامار بێت، کە لەبەر نەزۆکیی کراوە بە کەشتی بیابان و بۆ سواری دانراوە و یاری بە کلکی دەکات بۆ ناوگەلی، کاتی شەوڕەویی چوار پەلی بە توندیی لە ئەرز دەنێ و سمەکانی گەورە و پان و تۆکمەیە و ترسی کەوتنی نییە، مەگەر بەم حەیوانە بتوانم شوێنی بکەوم، یاخوا کاورا هێلگت وڕێ بۆ دلداریی و مێبازییەك کە نایکەی!، بەخوا عەبلە ناحەقی نییە لوتەلایە لەم جۆرە ئاشقەوماشقە.

وَكَأَنَّمَا أَقِصُ الإِكَامَ عَشِيَّةً ... بِقَرِيبِ بَيْنَ الْمَنْسِمَيْنِ مُصَلَّمِ
تَأْوِي لَهُ قُلُصُ النَّعَامِ كَمَا أَوَتْ ... حِزَقٌ يَمَانِيَةٌ لأَعْجَمَ طِمْطَمِ
يَتْبَعْنَ قُلَّةَ رَأْسِهِ، وَكَأَنَّهُ ... حَرَجٌ عَلَى نَعْشٍ لَهُنَّ مُخَيَّمِ
صَعْلٍ يَعُودُ بِذِي الْعُشَيْرَةِ بَيْضَهُ ... كَالْعَبْدِ ذِي الفَرْوِ الطَّوِيلِ الأَصْلَمِ

دەڵێ: لەکاتی ڕێڕوڕۆیشتن و سەفەردا ئەو گرد و تەپۆلگانە دەشێلم بە ولاخی هەنگاو نزیك، بەیەك سم لەیەك نزیك کە ئەم جۆرە ولاخانە سواریان خۆش و ئاسانە، ئەو وشترە نەعامەئاسا وەك کەو و سوێسکە دەیخوێنند بۆ بێچوەکانی، بۆ ئەوەی بڕۆن بۆلای، وەك ئەو شوانە عەجەمەی کە زمان نازانێ و گرنکەگرنگ ئەکات بۆ مەڕەکانی و ئەوانیش واتە بێچووە نەعامەکان سواری ملی نەعامەنێرەکە دەبن، بە شێوەی هۆڕ و خورجی ژنانە، لەسەر وشتر دێتە بەرچاو، ئەوە وەسفی وشترەکەی عەنتەرە، ئەو بێچووە وردانە زەرنەقووتە بوون و سەرباریك و ملباریك،

لەگەڵ دایکەو باوکەکەیاندا دەچوون بۆ ناوچەی عەشیرە، وەك کۆیلەی فەرەنجی لەبەری گوێچکەبڕاو، چونکە نەعامە گوێی بچووکە، وەك بڕاو وایە.

شَرِبَتْ بِمَاءِ الدُّحْرُضَيْنِ فَأَصْبَحَتْ     زَوْرَاءَ تَنْفِرُ عَنْ حِيَاضِ الدَّيْلَمِ
وَكَأَنَّمَا يَنْأَى بِجَانِبِ دَفِّهَا الْـ     ـوَحْشِيِّ مِنْ هَزِجِ الْعَشِيِّ مُؤَوَّمِ
هِرٌّ جَنِيبٌ كُلَّمَا عَطَفَتْ لَهُ     غَضْبَى اتَّقَاهَا بِالْيَدَيْنِ وَبِالْفَمِ

پاش ئەوەی وەسفی وشترمڕەکە و بێچووەکانی کرد کە نێرمنەعامەکە لە پێشیانەوە دەیانبات بۆ سەرئاو، ئەوجا دەگەڕێتەوە بۆ باسی وشترەکەی و دەڵێ: ئاوی خواردەوە لە چاڵاوەکانی دوحرەزمین و لەبەر زۆر ئاوخواردنەوە لارەسەنگ دەبینرا و مەیلی نەبوو لە ئاوی دوژمنەکان ئاو بخواتەوە، یان لەکانی زۆردارەکان کە مانای وشەی (دەیلەم)(چاڵی باراناو) بەو جۆرەکراوە، ئەم وشترە لارەلارە ڕۆیشت و تەنیشتی لای چەپی دوور ئەخستەوە لە شان و ملی، وەك ئەوەی پشیلەیەکی کێوی ختوکەی بدات و کاتی ئێوارە و شیوخواردن دەست بکاتە میاوە میاو بە سەر و کەللەیەکی گەورەو ناقولاوە، جا وەرە، ئێوارە بێ و زۆر ماندووبێ، ئەوەندە چالاك بێ داخۆ بەیانی چۆن بێت!؟، یان لەترسی قەمچی لای ڕاستی، هەمیشە لای چەپی وەك لاروخوار دەزانرا، وەك پشیلە لە بن باڵی بێت، ناوەناوە لای کردبێت بەلای ئەو پشیلەدا و پشیلەکەش بە نینۆك و بەدەم و گازگرتن خۆی بپارێزێ، برا!.

(بەخوا مەگەر خەیاڵی ئەم بەدەوییە بتوانێ ئەم وێنە بکێشێ، دەنا لە باسی ماچ و مووچی عەبلەوە بۆ وەسفی وشتر و لە وەسفی وشترەوە بۆ مروشتری جوجەڵە لە سەر پشت و دووبارە بۆ وشتری شانخوار و دانانی پشیلەیەك لەلای چەپی بۆ ئەوەی ختووکەی بدات و لەوێشەوە بۆ تورەبوونی وشترەکە و لاکردنەوە بۆ لای پشیلە و بەرگری پشیلە کە بە نینۆکی تیژو ددانی تیژ، کۆکردنەوەی ئەم هەموو دیمەنە بۆ ئەمڕۆ ئاسانە، بەڵام بۆ شازدەقەرن لەمەوپێش زۆر ئەستەمە!).

أَبْقَـى لَهَـا طُـولُ السِّـفَارِ مُقَرْمَـداً سَـنَداً، وَمِثْـلَ دَعَـائِمِ الْمُتَخَيِّمِ

دەڵێ: ئەم وشترە لەو سەفەرە سەخت و دوور و دژوارەدا ماندووبوونی پێوەدیار نەبوو، دووگی سەرپشتی وەك خشتی سوورکراوە بە پتەوی درزی تێ نەکەوتبوو، چوار پەلیشی وەك ستوونی قایمی دەوار بەرز و مەحکەم ڕاوەستابوو.

بَرِكَـتْ عَلَـى مَـاءِ الـرِّدَاعِ، كَأَنَّمَـا بَرَكَـتْ عَلَـى قَصَـبٍ أَجَـشَّ مُهَضَّـمِ

دەڵێ: ئەم وشترە بۆ پشوودان و خوسدان پاڵکەوت لەسەر ئاوی ڕەداع و ئەملاوئەولای ئاوەکە وشکبووبوو، بەڵام ژێرەکەی هەر تەڕایی تێدابوو، لەکاتی پاڵکەوتنی وشترەکەدا لەسەر زەویەکە دەنگی شکاندنی گلەڕەقەکە ئاوازێکی هەبوو، وەك پاڵکەوتنی لەسەر بارەقامیشی لەسەر یەك لێژ نەکراو، کە دەنگی وردبوون و شکاندنی قەفی قامیشەکان ئاوازی ناسراوی هەیە، وەك لەکاتی بە شمشاڵکردنیدا ئاوازی تایبەتی هەیە، بەڵام ئەو دەنگە دەنگی شکاندنی کلۆسنی دەوری ئاوەکە بوو!.

وَكَـــأَنَّ رُبّـــا أَوْ كُحَـــيْلاً مُعْقَـــداً    حَـــشَّ الوَقُـــودُ بِـــهِ جَوَانِـــبَ قُمْقُـــمِ

رُبّ: دۆشاو، کحیل: تەنزانی ڕەش، نەوت، معقد: لەسەر ئاگردانراو بۆ کولاندن، حشّ: ئاگردرابێ، الوقود: داری سوتاندن، قمقم: کوپەی گڵین و سورکراوە کە ئاوی تێدا دەکولێنن.

دەڵێ: ئەم وشترە لەکاتی پاڵکەوتنی و پشوودانی ئارەقێکی ڕەشی دەردەدا، چونکە ئارەقی وشترەڕەشە وەك دۆشاوی گیراوەی ڕۆنگەرچەکە، یان قەترانی خەستکراوە و لەسەر ئاگرێکی بڵێسەدار دانرابێ و فرۆکە و داری زەنگەتڵیش لە ژێری و لەملاوئەولای کوپە پڕ لە قەترانەکە نێڵەی بێت، ئەم وشترە بەو شێوەیە ئارەقی ڕەش و مۆری دەردەدا، واتەدەزانی دەرمانی (عەنزە ڕووت) لە لەشی وشترێکی گەڕۆڵ درابوو.

(جا توخودا خەیاڵی ئەم کۆیلە تازە ئازادە نەبێ کێ ئەم دیمەنەی لە خەیاڵدایە).

يَنْبَـــاعُ مِـــنْ ذِفْـــرَى غَضُـــوبٍ جَسْـــرَةٍ    زَيَّافَـــةٍ مِثْـــلِ الْفَنِيـــقِ الْمُكْـــدَمِ

ینباع: دووپێ، ئارەقە بە هێواشی دەچۆڕا، ذفری: دوو ڕەگی بناگوێ، غضوب: چەتوون، تورە، ڕقئەستوور، جسرة: درێژ وەك پرد، الزیافة: بە فیز و دەعیە و دەمارزل، الفنیق: نێرە وشتری ڕەسەن، المکدم: دەم و قەپۆز کوتاوە لە شوێن وشتری مێینە.

دەڵێ: ئەم وشترەی من (برا یاخوا بە خێرهاتی) ئارەقەی لێ دەچۆڕا لە هەردوو ڕەگی بناگوێی (کە یەکەم دڵۆپی ئارەقە لەوێوە دێ)، وشترەکەللە ڕەق و لوتبەرز و ڕقئەستوورەکە لەش و باری وەك پرد درێژ و بەرزبوو

لە ڕۆیشتن و فوونەكردن، وەك نێرەوشتر بە دوای مێینەدا غاربدات و دەم و فلّقی كوترابێ، بە پاشی لەقەی وشترە مێیەكان و گاز گرتنیان!.

إنْ تُغْـدِفِي دُونِـي الْقِنَـاعَ فَـإنَّنِي    طَـبٌّ بِأَخْـذِ الْفَـارِسِ الْمُسْـتَلْئِمِ
أَثْنِـي عَلَـيَّ بِمَـا عَلِمْـتِ فَـإنَّنِي    سَـهْلٌ مُخَـالَفَتِي إذَا لَـمْ أُظْلَـمِ
فَـإذَا ظُلِمْـتُ فَـإنَّ ظُلمِـي بَاسِـلٌ    مُـرٌّ مَذَاقَتُـهُ كَطَعْـمِ الْعَلْقَـمِ

دەڵێ: ڕوو لە عەبدە دەكات كە ڕووپۆشی لەسەر دەم و چاوی داناوە و بە حیساب شەرم ئەكات و نایەوێ كوڕی هەرزەكاری بیانی ببینێ، دەڵێ: ئەگەر چارشێو بدەی بەدەم و چاوت زوو خۆت لە من دەشێریتەوە، تۆش باشم دەناسی كە چەند بەدەست و بردم بۆ تێكشكانی پاڵەوانی زرێ و تاسكاڵاولەبەر، ئیتر چۆن بەتۆ ناوێرم چارشێوەكەت لابدەم!؟، لادە سەرپۆشەكەت باڕووت ببینم، كچی شۆخ!، حەق وایە مەدح و سەنام بكەی بەو سیفەتانەی كە ئەزانی لە مندا هەیە، بۆ كچی وەك ئێوە نەرم و نیان و بە ڕەوشت و ئاسان و خۆشڕەفتارم، چونكە كە چارشێوی لە ئاستی من داپۆشی مانای سوكایەتیی و ستەمم لێ ئەكەیت، ئەوە منت زۆر باش ناسیوە، من ئەگەر زۆر و ستەمم لێ بكرێ سەختگیر و تاڵاو دەكەم بە دەمی ستەمكاردا، تاڵتر لە تامی گوژاڵكەی تەڕ، كەس نەزانێ عەبلەخان تۆ باشم دەناسی، بۆ شەرمم لێ دەكەی؟.

وَلَقَـدْ شَـرِبْتُ مِـنَ الْمُدَامَـةِ بَعْـدَمَا    رَكَـدَ الْهَـوَاجِرُ بِالْمَشُـوفِ الْمُعْلَـمِ
بِزُجَاجَـةٍ صَـفْرَاءَ ذَاتِ أَسِـرَّةٍ    قُرِنَـتْ بِـأَزْهَرَ فِـي الشِّـمَالِ مُفَـدَّمِ

دەڵێ: من كەسێكی ئاسایی و یاسایی و ناسراوم، مەی ئەخۆمەوە كە نیشانەی دەوڵەمەندیی و ساماندارییمە، ئەوكاتەی گەرمای نیوەڕۆ تینی نەما بە چۆڵیی تەخت و دراوی ڕاوچی ڕۆژ كە دیناری لەسەر نوسراوە و درهەمی سپی نیشانە لێدراو كە ئەوەش لای هەموو كەس نییە كە ئەم مەی خواردنەوە لە پەرداخ و گۆزە نەخش و نیگار لەسەر نوسراو و هێڵ و نوختەی جوانی لەسەر نەخشكراوەو هاودەمە لەگەڵ (شەربەی دەسكدار) و پاڵێوەری سەری دەم و لولەكەی كە سەرگیراوە بەشێوەیەكی زۆر جوان لە باكورەوە هاتووە، كە زۆر بە نرخ و بەتام و لەزەتە.

فَـإِذَا شَـرِبْتُ فَـإِنَّنِي مُسْـتَهْلِكٌ    مَـالِي، وَعِرْضِـي وَافِـرٌ لَـمْ يُكْلَـمِ
وَإِذَا صَحَوْتُ فَمَا أُقَصِّرُ عَـنْ نَـدًى    وَكَمَـا عَلِمْـتِ شَـمَائِلِي وَتَكَرُّمِـي

دەڵێ: ئەگەر بخۆمەوە ستەم لەكەس ناكەم، ماڵی حەلاڵی خۆمە و لەڕێگەی ڕابواردن خەرجی ئەكەم، شەرەف و ناموسم پارێزراوە، تەنها تۆزێ زامدار نەبووە، هەركات نەخۆمەوە و بێداربم و سەرخۆش نەبم تۆ ئەزانی كار و ئاكار و خووڕەوشتم چەندە بەرزە.

وَخَلِيـلِ غَانِيَـةٍ تَرَكْـتُ مُجَـدَّلاً    تَمْكُـو فَرِيصَـتُهُ كَشِـدْقِ الْـأَعْلَمِ
سَـبَقَتْ يَـدَايَ لَـهُ بِعَاجِـلِ ضَـرْبَةٍ    وَرَشَـاشِ نَافِـذَةٍ كَلَـوْنِ الْعَنْـدَمِ

دەڵێ: زۆر دۆستی ژنی جوان و گەنج و شۆخم داوەتە بەر زەب و ڕم و شیر و تیری خۆم، لێوەلەرەی پێ كەوتووە، وەك لچ و لێوی وشتری لچی سەرەوە دوڵەت و زامی كاریگەرم لێ كردووە، بە دەست و بازووی بەهێزم و

فیچقەی خوێنی بلوسکی بەستووە، وەك ڕەنگی بەری عەناب سووری تۆخ، ئێستە تۆ (عەبلەخان) دەتەوێ دڵداریی بگۆڕێ، کاری وانەکەی کەنیشکە ساکار و سادە و بێ ئەزموونەکە.

هَلاَّ سَأَلْتِ الْخَيْلَ يَا ابْنَةَ مَالِكٍ    إنْ كُنْتِ جاهِلَةً بِمَا لَمْ تَعْلَمِي
إذْ لاَ أَزَالُ عَلَى رِحَالَةِ سَابِحٍ    نَهْدٍ، تَعَاوَرُهُ الْكُمَاةُ مُكَلَّمِ

دەڵێ: کچی مالیك: ئامۆزا گیان، ئەوە بۆچی پرسیار ناکەی لەو سوارانەی کە من دەناسن، ئەگەر نازانی و نەتزانیوە پرسیار بکە عەیب نییە، ئەگەر پرسیارتکرد پێت دەڵێن کە من کاتی جەنگ و هەرا تەنها ژێرزێن لەسەر ئەسپەکەم دادەنێم و هەردوو دەستم بەردەدەم و ئەسپەکەم گەورە و بەرز و قەڵەوە، زۆر سواری گلاندووە کە پاڵەوان و سواری شارەزابوون و یەك لەدوای یەك خۆیان نەگرتووە لەسەر پشتی، بەڵام من بەسەر جل و ژێرزێن غارم پێ کردووە.

طَوْراً يُجَرَّدُ لِلطِّعَانِ، وَتَارَةً    يَأْوِي إِلَى حَصَدِ الْقِسِيِّ عَرَمْرَمِ
يُخْبِرْكِ مَنْ شَهِدَ الْوَقِيعَةَ أَنَّنِي    أَغْشَى الْوَغَى وَأَعِفُّ عِنْدَ الْمَغْنَمِ
وَمُدَجَّجٍ كَرِهَ الْكُمَاةُ نِزَالَهُ    لاَ مُمْعِنٍ هَرَباً وَلاَ مُسْتَسْلِمِ

دەڵێ: خانمەکەم! من ئەو قارەمانەم جارێك لە سواران نەك پیادەو بێ ئەسپ سەرگەرمی شەڕە شیر و ڕم و تیرمَ و جارێك بە تاکەسوارە دوژمنەکان ڕووت ئەکەمەوە و ئەسپەکەم دروێنەی تیروکەوانی تیر ئەندازەکان دەکات کە ژمارەی زۆر زۆرە، ئەگەر پرسیارتکرد وەڵامت دەدەنەوە کێ بوو خۆی هاویشتە ناو سەیرانی شەڕەوە، کە شەڕەم تەواو

كــرد، خــۆم خــەریك ناكــەم بــە دەســتكەوت و ماشــینەوەی پاشمــاوەی كوژراوەكان، خۆ ئەگەر ئـەوەش بكەم عـەیب نییـە، (مَن قتَلَ قتيلاً فلهُ سَلَبُهُ)، هەركەس هەركەسی كوشت كەل و پـەل و چـەك و سیلاحی مـافی خۆیەتی، هـەموو گیـانم داپۆشـراوە بـە جۆرەكـانی چـەك و بـە هـەموویان شەڕ ئەكەم، بە هێـرش و بـەرگریی و كـوڕە ئازاكـان خۆیـان تـاو دەدەن لـە ڕووبەڕوبوونەوە، چونكە ئەزانن من كێم؟، نە ئەو كەسەم پاشەكشە بكـەم لەشەڕ و نە ئەو كەسەم خۆم ئامادەكردبێ بۆ دیلیی و خۆبەدەستەوەدان.

جَــادَتْ يَــدَايَ لَــهُ بِعَاجِــلِ طَعْنَــةٍ     بِمُثَقَّــفٍ صَــدْقِ الْكُعُــوبِ مُقَــوَّمِ
بِرَحِيبَــةِ الْفَــرْغَيْنِ يَهْــدِي جَرْسُــها     بِاللَّيْــلِ مُعْــتَسَّ الــذِّئابِ الضُّــرَّمِ

دەڵێ: من ئەو پاڵەوانم كە ڕووبەڕووی پاڵـەوانی ئـازا دەبمـەوە، زوو بـە هەردوو دەستم زامێكی لێ ئەكەم بە شمشێری خۆشدەست و مشتوقایم و مەحكەم كە وەك حەبلی شان لاربوون و چەمانەوەی نییە، ئـەوجا كـە بـە شمشێر زامم لێ كرد، خوێن فیچقە و قەڵبەزە دەكات وەك فوارە و تاڤگـەی بەرز، دەنگی ئەو نـاوە دەگـرێ و گورگی برسی بـە ئاگـا دێـت و پـەلاماری خـواردنی كوژراوەكـەم دەدەن لـە شـەوی تاریـك و خوێناویـدا، دەی توخـوا ئیتر ماوتە!.

فَشَــكَكْتُ بِــالرُّمْحِ الأصَــمِّ ثِيَابَــهُ     لَــيْسَ الْكَــرِيمُ عَلَــى الْقَنَــا بِمُحَــرَّمِ
فَتَرَكْتُــهُ جَــزَرَ السِّــبَاعِ يَنُشْــنَهُ     مَــا بَــيْنَ قُلَّــةِ رَأْسِــهِ وَالمِعْصَــمِ
وَمِسَــكِّ سَــابِغَةٍ هَتكْــتُ فُرُوجَهَــا     بالسَّــيْفِ عَنْ حَامِي الْحَقِيقَـةِ مُعْلَـمِ

دەڵێ: لە كاتی جەنگ و شەڕی نێوان هۆزەكەم و دوژمنی هۆزەكەمدا، هەمیشە هەوڵمداوە هاوشانەكەم، بەرامبەرەكەم كەسێك بێ كە حیسابی بۆ بكرێ لە چەك، ئازایەتیی، لە ڕەسەنیی و پاڵەوانیی، ئەوجا بەو شێوەیە كە باسمكرد ڕووبەڕووی بوومەتەوە، ئەوجا شەق و پەقم كردووە بەڕم كە وەسفی دەكەم بە ڕەق، كەڕ، كە جگە لە بەرگ و زرێی بەری زامی گەورە لە لەشیدا دەكات، وەك چۆن ئاو لە دوو دەمی دۆڵچەی ئاوی ناوبیر دەچۆڕێ، ئاوا خوێن فوارە دەكات، چونكە كەس ئەفسوونی شمشێر نەبڕی لەبەردا نییە و گۆشتی حەرام نەكراوە لە شیر و تیر و ڕم، ئەوە بەندەی عەرەبییە وەك كە لەناو كورددا (پشتێنی گوللەنەبڕ) هەیە كە ئەو پاڵەوانەم لە مەیداندا خستە خوارەوە بەجێم هێشت بۆ دڕندەكان كە دەعوەتی یەكتر بكەن بۆ ژەمێكی چەور و نەرم و گەرم لە تەوقی سەرەوە هەتا مەچەكی گۆشتن و قەڵەو، زۆر جاریش پەلاماری جەنگاوەرمداوە كە بەسەر كراسی دژەڕم و تیروشیر پشتێنی قایشی چەرم لەسەر قەدی دەبەست بۆ خۆپاراستن لە زامی دوژمن، بەڵام بە هێزی بازووی من و شمشێری بڕندەی من ئەو هەموو سەنگەرەم بڕی و قۆپچەكانی و بزمارە هەڵبەسراوەكانم وردو خاش كردووە، لەكێ؟، لەو كەسەی كە خۆی بە سوارچاكی مەیدان و ئاڵای سەروەریی لەخۆی داوە، بۆ ناسین و ترساندنی بەرامبەر.

رَبِـــذٍ يَـــدَاهُ بالْقِـــدَاحِ إِذَا شَـــتَا ... هَتَّـــاكِ غَايَـــاتِ التِّجَـــارِ مُلَـــوَّمِ

لَمَّـــا رَآنِـــي قَـــدْ نَزَلْـــتُ أُرِيـــدُهُ ... أَبْـــدَى نَوَاجِـــذَهُ لِغَيْـــرِ تَبَسُّـــمِ

ئەوە باسی ئەو سوارە ئەكات لە بەیتی پێشەوە كە عەنتەر داوێتی بە ئەرزدا و وتی: ئەو سوارە پاڵەوانێكی ناوداربوو، سوارچاكبوو، هەموو لەشی داپۆشرابوو بەشمشێری نەبڕ و ناودار و ناوبانگدار و پارێزەری شەرەفی هۆزەكەی، لە یاریكردن و كلاوێنی ئەفسانەدا شارەزاو دەستكراوەبوو، زۆر سەرزەنشت دەكرا كە شەرابی مەیفرۆشانی هەموو كڕیوە و بە مەجبووریی ئاڵایان لەسەر دوكانەكان لابردووە، چونكە مەی نەماوە هەموو ئەم سوارە كڕیویەتی، كاتێ كەوتە خوارەوە بە لێدانی من و دابەزیم بۆ نێو شەڕگە بۆ ئەوەی دواهەناسەی ببڕم كە منی بینی ددانی چیڕكردەوە و دەمی تەواو كردەوە بە ڕقەوە سەیری كردم، نەك بۆ پێكەنین، بە چاوی خۆی مەرگی خۆی بینی.

فَطَعَنْتُهُ بِالرُّمْحِ ثُمَّ عَلَوْتُهُ     بِمُهَنَّدٍ صَافِي الْحَدِيدَةِ مِخْذَمِ
عَهْدِي بِهِ مَدَّ النَّهَارِ كَأَنَّمَا     خُضِبَ الْبَنَانُ وَرَأْسُهُ بِالْعِظْلِمِ
بَطَلٌ كَأَنَّ ثِيَابَهُ فِي سَرْحَةٍ     يُحْذَى نِعَالَ السِّبْتِ لَيْسَ بِتَوْأَمِ

ئەوە هەر باسی ئەو كەسە دەكات كە لەشەڕگەدا كوشتوویەتی و ئەوەندە وەسفی ئەكات كە لە ڕاستیدا وەسفی خۆی دەگرێتەوە، دەڵێ: لەسەر ئەسپەكەی بە ڕم لێمدا و زامدارم كرد و خستمە خوارەوە و چوومە سەری و بە شمشێری بە هێزی تیژ و ئاودراو و پۆڵای یەكدەست و پوخت وەك كافرمان (چەقۆی تیژی كوردەواری خۆمان) هەتا شەڕ لە بەیانی هەتا ئێوارە دەوامی كرد، ئەم لاشەم دەبینی كەوتووە، دەست و پەنجەكانی و سەرو گوێلاكی، وەك لە گەڵای دارخەنە سوور كرابێ وابوو،

لەشێك كە شێوەی زۆر گەورە دیار بوو، وەك بنەداری گەورە كۆن بوو، درێژ ڕاكشابوو، دیار بوو دەوڵەمەند و خاوەن سامانیش بوو، چونكە پێڵاوی چەرمی دەواغیكراوی لەپێ دابوو، بە تەنهاش لەدایكبووبوو، دوانە و لاواز نەبوو، بەناز بەخێو كرابوو.

یَـا شَـاةَ مَـا قَـنَص لِمَـنْ حَلَّـتْ لَـهُ    حَرُمَـتْ عَلَـيَّ، وَلَيْتَهَـا لَـمْ تَحْـرُمِ
فَبَعَثْتُ جَارِيَتِي، فَقُلْتُ لَهَـا: اذْهَبِـي    فَتَجَسَّسِـي أَخْبَارَهَـا لِـيَ وَاعْلَمِـي

دەڵێ: بەرخە نێچیرەكە! بۆ ئەوەی بۆی دەشێت، یان بە نسیبی دەبی، زۆر بەداخەوە لەمن حەرامی!، خۆزگە بۆ منیش حەلاڵ بوایە، بە خودا بستیم بە قەرز نەدەدا، بەلام بۆ من حەرامە، یان لەبەر ئەوەی هۆزەكەی نەیاری هۆزی منە، یان باوەژنی بووە و خۆزگە باوكی مارەی نەكردایە، ئەوجا لەگەڵ ئەوەش كارەكەرە كەنیزەكەم نارد بۆ هەواڵپرسین و پێم گوت: بڕۆ هەواڵی تەواوی بزانە و بۆم بگێڕەوە.

قَالَـتْ: رَأَيْـتُ مِـنَ الْأَعَـادِي غِـرَّةً    وَالشَّـاةُ مُمْكِنَـةٌ لِمَـنْ هَـوَ مُـرْتَمِ
وَكَأَنَّمَـا التَفَتَـتْ بِجِيـدِ جِدَايَـةٍ    رَشَـاٍ مِـنَ الْغِـزْلاَنِ حُـرّ أَرْثَـمِ

دەڵێ: ئەو كەنیزەكە وەلامی هێنایەوە و وتی: بەڕاستی دوژمنەكان بێئاگان لەكاروباری و چاودێری ناكەن، ئەو بەرخە عەرەبییە ئامادەیە بۆ هەركەس كە داوای بكات و خۆی بكات بە خاوەنی، هەروەها گوتی: بەلام ئەو بەرخە كارمامزی تازەباڵغە، سنگ و مەمك و گەردنی ئەڵێی ئاسكی گەرمیانە، دەم و لێوی سپی و ناسك و تەڕە، وەك شاعیری فارس دەڵێ:

ئاسك لە تۆوە فێری وەستان و لاکردنەوە و ڕاکردن و سووك و سۆڵیی بووە.

نُبِّئْتُ عَمْراً غَيْرَ شَاكِرِ نِعْمَتِي    وَالْكُفْرُ مَخْبَثَةٌ لِنَفْسِ الْمُنْعِمِ

دەڵێ: هەواڵم پێگەیشتووە کە عەمرناوێك سوپاسی من ناکات و هەرچی چاکەم کردووە لەگەڵی بێنرخی داناوە، ئەوە بە جێگەی خۆی، بەڵام داننەنان بە چاکە و پیاوەتیدا دڵی مرۆڤی چاکەکار لیخن دەکات و بێز لە چاکەکردن دەکاتەوە.

وَلَقَدْ حَفِظْتُ وَصَاةَ عَمِّي بالضُّحَى    إِذْ تَقْلِصُ الشَّفَتَان عَنْ وَضَحِ الْفَمِ
فِي حَومَةِ الْمَوْتِ الَّتِي لاَ تَشْتَكِي    غَمَرَاتِهَا الْأَبْطَالُ غَيْرَ تَغَمْغُمِ

دەڵێ: ڕاسپاردەی مامم لەبەرە، چاك لە یادمە لەکاتی چێشتەنگاودا ئەوکاتەی پاڵەوانەکان دەمدەکەنەوە و ددانی تەختیان دەردەکەوێ و لێوەلەرەیانە لە ترساندا و لە گەرمە و بڵێسەی مەرگ و بارانی مردن کە کوڕی ئازا تەنها سکاڵای بۆڵەبۆڵ و دەنگ و هەراو قیڕەقیڕە، بەڵام من وابووم، کە لە بەیتی داهاتوودا باسی دەکەم.

إِذْ يَتَّقُونَ بِيَ الأَسِنَّةَ لَمْ أَخِمْ    عَنْهَا، وَلَكِنِّي تَضَايَقَ مُقْدَمِي

دەڵێ: لەوکاتە پڕ مەترسی و دڵەڕاوکێ و لێوەلەرەدا، زۆربەی جەنگاوەران منیان لەنێوان خۆیان و سەرەڕمە درێژەکانی نەیاری بەرامبەردا دەبینی، بەڵام ئەوە منی نەدەترسان و تووشی دڵەلەرزەی

نەدەکردم لەو هەڵوێستەیان، بەڵام ڕێگرم نەبوو هەنگاو بنێم، چونکە ئەوەندەم کوشتبوو ڕێگەم لێ گیرابوو، نە بۆ پێشەوە لەبەر کوژراو و نە بۆ دواوە، چونکە جەنگاوەران لە دواوە بوون!.

| | |
|---|---|
| لَمَّـا سَـمِعْتُ نِـدَاءَ مُـرَّةَ قَـدْ عَـلاَ | وَابْنَـيْ رَبِيعَـةَ فِـي الْغُبَـارِ الأقْـتَمِ |
| وَمُحَلِّـمٍ، يَسْـعُنَ تَحْـتَ لِـوَائِهِمْ | وَالْمَـوْتُ تَحْـتَ لِـوَاءِ آلِ مُحَلِّـمِ |
| أَيْقَنْـتُ أَنْ سَـيَكُونَ عِنْـدَ لِقَـائِهِمْ | ضَـرْبٌ يُطِـيرُ عَـنِ الفِـرَاخِ الْجُـثَّمِ |

هەر باس باسی ئازایەتیی و نەبەردیی عەنتەر ئاغایە، دەڵێ: لەکاتی نەبەردیی و تێکەڵبوون لە شەڕگەدا گوێم لێبوو (مورە) کە ناوی سەرۆککۆمارێکی خزمی عەنتەرە، بە دەنگی بەرز هاوار دەکات و هەردوو کوڕانی ڕەبیعەش لەناو تۆزی شەڕگەدا هەراو هوریا دەکەن و (موحەللەم) کە ئەویش ناودارێکە ڕانەکەن و پەرچەم و ئاڵاکەیان لەسەریانە، بەڵام لەژێر ئاڵاکەیان وا مەرگبارانە و لاشە کلاشەی دێ، بۆم ڕونبووەوە کە دەبێ کارێك بکەم هێرشیان لەکۆڵ بکەمەوە.

| | |
|---|---|
| لَمَّـا رَأَيْـتُ الْقَـوْمَ أَقْبَـلَ جَمْعُهُـمْ | يَتَذَامَرُونَ كَـرَرْتُ غَيْـرَ مُـذَمَّمِ |
| يَـدْعُونَ عَنْتَـرَ وَالرِّمَـاحُ كَأَنَّهَـا | أَشْـطَانُ بِئْـرٍ فِي لَبَـانِ الأدْهَـمِ |

ئەوە وەڵامی بەیتی پێشووە کە وتی: گوێم لە دەنگی....

دەڵێ: بەتەواوی بڕوام کرد کە دەبێ بڕۆم بۆ ڕزگارکردنیان و ڕۆیشتنم دەبێتە هۆی پەڕاندنی هەندێ سەری بچووك، وەك سەری جوجکەی تازە لە هێلکە دەرهاتوو، ئەو خەڵکە زۆر بەرەو ڕووی من دێن و هانی یەکتر

دەدەن: کوڕینە ڕامەکەن ئەوە عەنتەر هات!، منیش گەڕامەوە بۆیان بە ئازایانە نەوەك بە وێنەی خراپ و ترسنۆك و بێ ورە، بانگیان کرد: عەنتەر!، فریاکەوە، چونکە ڕمی دوژمن وەك پەتی درێژی ناو بیری قووڵ شۆڕ بووەتەوە بۆ سەر دڵ و جەرگیان و ئەوەندە خەڵکی پێ کوژراوە دێز بووە، سەری ڕمەکانیان لە بەرەکی ئەسپەکانیشیانەوە دیارە.

مَـا زِلْـتُ أَرْمِـيهِمْ بِغُـرَّةِ وَجْهِـهِ     وَلَبَانِـهِ حَتَّـى تَسَـرْبَلَ بالـدَّمِ
فَـازْوَرَّ مِـنْ وَقْـعِ القَنَـا بِلَبَانِـهِ     وَشَـكَا إِلَـيَّ بِعَبْـرَةٍ وَتَحَمْحُـمِ

دەڵێ: ئەوکاتە کەوتمە ناویان هەندێ بە ڕم و هەندێ بە شیر و هەندێ بە سەری ئەسپەکەم و هەندێ بە سنگ و بەرەکی ئەسپەکەم کە وەك کراسی سووری لەبەرکردبێ ڕەنگی خوێنی کوژراوەکانی پێوە بوو، ئەوجا ئەسپەکوێت لای کردەوە بەلاماو سکاڵای کرد بە زمانی حاڵ بە پرسە و حیلەی پچڕ پچڕ، ئەم خۆهەڵکێشانەی عەنتەر کە لەدوای شەڕەکەوە ئەم قەسیدەی وتووە بووەتە هۆی هەڵبەستنی دەیان چیرۆکی ئەفسانە و ئەفسووناویی وەك شانامەی فیردەوسی.

لَوْ كَانَ يَدْرِي مَا الْمُحَاوَرَةُ اشْـتَكى     وَلَكَـانَ لَـوْ عَلِـمَ الْكَـلاَمَ مُكَلِّمِـي
وَالْخَيْـلُ تَقْـتَحِمُ الْخَبَـارَ عَوَابِسـاً     مِـنْ بَـيْنِ شَـيْظَمَةٍ وَأَجْـرَدَ شَـيْظَمِ
وَلَقَـدْ شَـفَي نَفْسِـي وَأَبْـرَأَ سُـقْمَهَا     قِيـلُ الْفَـوَارِسِ وَيْـكَ عَنْتَـرَ أَقْـدِمِ

دەڵێ: ئەو ئەسپە ئەگەر توانای دانوستانی هەبوایە سکاڵای دەکرد، خۆ ئەگەر گۆیا بوویایە و زمانزان بوایە گفتوگۆی لەگەڵ دەکردم، ئەوجا

باسی شەڕگەکە دەکات و ئەو زەوی و خاکەی کە ئەم ڕووبەڕوی دوژمن وەستاوەتەوەو دەڵێ: ئەسپەکان بە غار بەناو خاکێکی نەرم و کەمێ بەردەڵان و کونەمشك و جرج و هەندێ کەروێشك و ڕێوی کونیان کردبوو بۆ مانەوە و هێلانە و کولانەی تێدابوو، غاری ئاسایی نەبوو، زۆر تووڕە و سەرکەش، شێوە جۆراوجۆر بوو، هەندێك درێژ و یاڵ و مل موودار و هەندێ بێ موو و کورتە موو، ئەوجا لەم کات و ساتە و شوێنە پڕ مەترسیەدا ئەوەی تیماری دەروونی منی دەکرد و ژان و ئازاری لەبیر دەبردمەوە ئەوەبوو، سوارەکان هاواریان دەکرد و نزا و دوعایان دەکرد و دەیانووت: ئافەرین عەنتەر، ماڵت بڕمێ عەنتەر بۆخۆت و پەلامار و دەست و بازووت، ڕۆڵەی ڕۆڵەم، مام عەنتەر!، دەست بووەشێنە، پەلامار بدە دوژمن تارومار بکە.

ذُلُلٌ رِكَابِي حَيْثُ شِئْتُ، مُشَايِعِي     قَلْبِي، وَأَحْفِزُهُ بِأَمْرٍ مُبْرَمِ
وَلَقَدْ خَشِيتُ بِأَنْ أَمُوتَ وَلَمْ تَكُنْ     لِلْحَرْبِ دَائِرَةٌ عَلَى ابْنَيْ ضَمْضَمُ

دەڵێ: وڵاخی سواریی من ڕامە، فێرە، تالیم دراوە، خۆم چۆن حەز بکەم لەگەڵ خواستی منە، هەمیشە دڵم لای خۆمە، و هۆشیارم بۆ خۆپاراستن لە تیر و شیر و ڕمی دوژمن، بۆ هەر کارێ ئاوزەنگی لێدەم بە گوێم دەکات و لە زمانم دەرناچێ، ئەوجا دەڵێ: ئەترسم بمرم و جارێکی تر شەڕ دووبارە نەبێتەوە، بۆ تۆڵەی هەرمشە و گورمشەی کوڕی (ضَمضَمْ) کە (وەردی کوڕی حابیسە)یان کوشت و ناویان (هەرەم و

حوصەین) بوو، وە عەنتر (زەمزەم)ی کوشتبوو، ئەوانیش بۆ تۆڵە دەگەڕان.

الشَّاتِمَيْ عِرْضِي وَلَمْ أَشْتِمْهُمَا     وَالنَّاذِرَيْنِ إِذَا لَمَ الْقَهُمَا دَمِي
إِنْ يَفْعَلاَ فَلَقَدْ تَرَكْتُ أَبَاهُمَا     جَزَرَ السِّبَاعِ وَكُلِّ نَسْرٍ قَشْعَمِ

دەڵێ: ئەم دوانە (هرم و حصین) سوکایەتیی ئەکەن بە نامووسم و جنێو ئەدەن پێم، بێ ئەوەی من بە جنێو وەڵامیان بدەمەوە و نەزریان کردووە ئەگەر تووشم ببن دەمکوژن، خۆ لەڕاستیدا حەقیانە بمکوژن، ئەوە من بووم پاکتاوی باوکیانم کرد و کردم بە خۆراکی گورگ و چەقەڵ و ڕێوی و هەڵۆی سەرگەڕی گەورە.

ئەوە چامەی هەڵواسراوی عەنتەرەیە کە لەبازاڕی (عُکاظ) خوێنراوەتەوە و لە دیوەخانی هۆزەکانی بە ئاوی زێڕ نووسراوەتەوە و بە دەرگای کەعبەدا هەڵواسراوە و تەنها باسی ئازایەتیی خۆی ئەکات و لەوانەشە داستانەکانی شەوچەرەی ئەو ڕۆژەی خێڵە عارەبەکان بوبێت و کوڕوکاڵیان لەبەریان کردبێ، بۆ وانەی ئازایەتیی و چاونەترسیی و بێمنەتیی لە دوژمن.

# عەمری كوڕی كولسوم

## ٥٠٠-٦١٠ زاینی

ئەم شاعیرە، عەمری كوڕی كولسوم لە هۆزی تەغلیبی عەرەبە، خەڵكی دوورگەی عەرەبە، باوكی سەرۆككۆماری خێڵەكەی بووە، دایكی لەیلای كچی موهەلهەلە، زۆر بە خۆی و هۆز و باوك و دایكیدا دەنازێ، كاتی خۆی ناكۆكیی كەوتە نێوان دوو هۆزی بەكر و تەغلیب، مونزیری سێیەم ئاشتیكردنەوە، دوای جەنگی بەسووس (٥٣٤) زاینی، پاش ئەم ڕێكەوتنە بۆ تەبایی لەبەردەم عەمری كۆرشی هیند كۆبوونەوە، وەك ڕێكەوتنی خێڵایەتیی، تەغلیبییەكان عەمری كوڕی كولسومیان كردە پارێزەری خۆیان، لەبەردەم پادشای ئەوكاتەی عەرەبدا، عەمری كۆڕی هیند لەشاری حیرە، بەڵام مەلیكی حیرە مەیلی بەلای بەكرییەكانەوە بوو، كە حەرسی كوڕی حیللەزە بوو، شاعیر و دەمڕاستیان بوو، ئەم دادگایی نادادپەروەرە عەمر و هۆزەكەی تووڕەكرد و بە نارەزایی گەڕانەوە، بەڵام مەلیك بۆ تۆڵەی ئەم تووڕەبوونە ناردی بۆ لای تەغلیبییەكان و دڵیان بداتەوە و شاعیرەكەشیان جێگەی شایستەی بۆ دانراوە و پێشنیاری كردبوو كە دایكی عەمر بێت بۆ لای دایكی مەلیك.

دایكی شاعیر لەیلای كچی موهەلهەل لە بنەماڵەیەكی ناوداربوو، پیلانەكە وا دانرابوو كە دایكی مەلیك هیندی كچی حەرسە لەكاتی دانانی

سفرەی نانخواردن سوکایەتیی بکات بە دایکی شاعیر، ئەوەبوو دایکی مەلیك پاش نانخواردن لەژێر دەواری مەلیکدا لە جیاتی ئەوە کارەکەر و کەنزیکەك بانگ بکات بۆ لابردنی سفرە بە دایکی شاعیری وت: ئەو سفرە کۆکەرەوە، ئەویش گوتی خاوەن دیوەخان حەقی خزمەتی هەیە بۆ میوان، نەوەك میوان، قیژانی بەسەریدا و داوایکرد لە کورەکەی کە سوکایەتیم پێکراوە، ئەوکات عەمر بە شمشێر مەلیکی کوشت و هەموو ماڵەکەی تالانکرد و گەڕاومیەوە بۆ ناوچەی خۆیان و ئەم شەڕە هۆکاری ئەم قەسیدەیەیە.

# نرخی مێژوویی و كۆمەڵایەتیی

عەمر كابرایەكی مەسیحیی بوو، لەناو شاعیرەكانی چاخی نەفامیی ناوبانگی زۆری هەبوو، لە كۆشكی مەلیكدا مەلیكی بە شمشێر كوشت، دارشتنی قەسیدەكە زۆر ورد و ناسك و ئاوازی حەماسە و ئازایەتیی تێدایە و زۆر شانازیی بە هۆز و خێڵەكەی دەكات و لەناو هۆزەكانی عەرەبدا دیار و ناودارە.

ئەم چامەیە نەوەدوشەش بەیتەو لە بەحری وافیری كێش و سەروای عەرەبییە و كۆتایی بە دوو پیتی (نا) دێت بەم شێوەیە: باسی مەی و ڕابواردن و سەرگەرمكردن (١-٥)، باری دۆستەكی (٦-١٩)، ڕووبەڕوو لەگەڵ عەمری كوڕی هیند لە (٢٠-٤٨)، باسی سوكایەتیی بە دایكی دەكات لە (٤٩-٦٢)، دیارە ئەمە پاش ئەوەی مەلیكی كوشت، باسی ئازایەتیی شێرە ژنەكانی هۆزەكەی دەكات لە(٦٣-٧٦)، باسی دەوری ئافرەت لە (٧٧-٩٦) نرخی ئەم چامەیە.

(ئەم چامەیە بۆ كاتی سروودی حەماسە و شانازیی هۆزێكی گەورە و بە دەسەڵات و خاوەن جەنگاوەر و شاعیر و سواری مەیدان دەكات و كەس توانای نەبووە ستەمیان لێ بكات، بۆ ئەمڕۆی كورد زۆر پێویستە لاوەكانی ئەوە بزانن ئەگەر كوڕە ئازاكانی هۆزەكانی كورد نەبوایە كە وەك شێر بەرگرییان كرد لەخۆیان و خەڵك و خاك، كورد ئەمڕۆ وەك نەتەوە حیسابی بۆ نەدەكرا و كوردستان نەدەبوو).

أَلاَ هَبِّـــي بِصَـــحْنِكِ فَاصْـــبَحِينَا     وَلاَ تُبْقِـــي خُمُـــورَ الأَنْـــدَرِينَا

الا: ئـامێری وشـیارکردنەوە، هبـی: لەخـەو ڕابـە و خەبـەرت بێتـەوە، صـحن: جـام، پیالـە، پـەرداخ، اصـبحینا: خواردنـەوەی بـەیانی، أنـدرین: گوندێکی فەلەنشین لە شام.

دەڵێ: لە خەو هەستە جامێ شەرابی بەیانیانمان پێ بـدە و لەشـەراب و مەیی گوندی (ئەندەرون) هیچ پاشەکەوت مەکە.

(دە وەرە کوردە، فەلەبە، بـاخی سـێوی کوردسـتان لەبـەر دەسـتت بـێ و هـەموو بکـەی بـە شـەراب و بەلاتـەوە حـەڵاڵ بـێ و دەسـەڵاتت هـەبێ بـۆ ناردنی بۆ تایف و نیوەدورگەی عەرەب، ئاخۆ چۆن بوو بێ!).

مُشَعْشَـــعَةً كَـــأَنَّ الْحُـــصَّ فِيهَـــا     إِذَا مَـــا المَـــاءُ خَالَطَهَـــا سَـــخِيناً

مشعشـعة: پـاڵێوراو، بێخـەوش، حـص: ڕووەکێکـی وەك کونجییـە لـە گوڵەکەی ڕەنگی سـوور درووسـت دەکـرێ، یـان خـودی زەعفەرانـە، سـخین: ئاوی گەرم بۆ شکاندنی تیژیی و کاریگەریی.

دەڵـێ: ئـەم مەیـە پـاڵ نـەخراوە دەڵێـی پـەلك و گـوڵی زەعفـەرانی تێکراوەو لەگەڵ ئاوی گەرم لـە زسـتاندا تێکـەڵ بـووە، مـەیی کـۆنی ئاڵ و زەردی جوان.

تَجُـــورُ بِـــذِي اللَّبَانَـــةِ عَـــنْ هَـــوَاهُ     إِذَا مَـــا ذَاقَهَـــا حَتَّـــى يَلِينَـــا

تجـوز: ڕاسـت دەکاتـەوە، اللبانـة: پێداویسـتیی، هـواە: ئـارەزوو، ذاق: بیچەژێ، یلین: خاوی بکاتەوە.

دەڵێ: بۆیە بە ئاوی گەرم تەڕ بکرێتەوە هەتا مەیخۆر ڕاست کاتەوە و بەدمەست نەبێ و ئارەزووی ئەوەی تامی ئەکات و دەیچێژێ خاو بکاتەوە، یان مەی خاوەنەکەی بێ ئاگا ئەکات لە هەموو خەم و خەیاڵ و خەفەتێك.

تَـرَى اللَّحِـزَ الشَّـحِيحَ إِذَا أُمِـرَّتْ    عَلَيْـــهِ لِمَالِـــهِ فِيهَـــا مُهِينَـــا

اللحز: ڕژد، ڕەزیل، الشحیح: نەفسنزم، کەمڕەوشت، أمرت: بەسەریاندا گەڕاو بەریکەوت، مهین: بێنرخ و کەمبەها دادەنێ.

دەڵێ: چاکەی مەی ئەوەیە: پیاوی ڕەزیل کە پەرداخێکی پڕکرد و خواردی سامان و ماڵی لەلا سووك ئەبێ و ئەویش سەخی دەبێ!.

صَـــدَدْتِ الْكَـــأْسَ عَنَّـــا أُمَّ عَمْـــرٍو    وَكَـــانَ الْكَـــأْسُ مَجْرَاهَـــا الْيَمِينَـــا

دەڵێ: دایکی عەمر پەرداخەکەی لە ئێمە دواخست بەلای چەپدا دابەشیکرد و ڕاست وابوو بەلای ڕاستدا جامی شەرابی دابەشبکردایە کە ئێمەی لێ بووین، دایکی عەمر بۆچی وا ئەکەیت؟.

وَمَـــا شَـــرُّ الثَّلاَثَـــةِ أُمَّ عَمْـــرٍو    بِصَـــاحِبِكِ الَّـــذِي لاَ تَصْـــبَحِينَا

دەڵێ: دایکی عەمر کە مەیگێڕی کۆڕەکەیە من کە هاوڕێی تۆم لەم سێ پیاوە خراپتر نیم کە لە منەوە مەی دابەش ناکەی!.

وَأَنَّـــا سَـــوْفَ تُـــدْرِكُهَا الْمَنَايَـــا    مُقَـــدَّرَةً لَنَـــا وَمُقَـــدَّرِينَا

منایا: مەرگ، مردن، مقدرة: بڕیاردراوە.

دەڵێ: مەیگێڕ مەی دابەش بکە بەسەر ئەربابی خۆشیی و زەوقدا، چونکە مەرگ نزیکە و پێمان دەگات و با کەمێ ڕابوێرین، ئەوە پاشەڕۆژە کە مردن دێتە پیرمانەوە و ئێمەش بۆ لای ئەو دەڕۆین.

قِفِــي قَبْــلَ التَّفَــرُّقِ يَــا ظَعِينَــا ‌ ‌ ‌ نُخَبِّــرْكَ الــيَقِينَ وَتُخْبِرِينَــا

قف: ڕاوەستە، ظعينا: كیژی ڕەوەندی ناو كەژاوە.

دەڵێ: ڕاوەستە خانمە شۆخەكەی ناو كەژاوە، با هەواڵی ڕاست و دروستت بدەینێ و تۆش هەواڵی ڕاست بە ئێمە بڵێ پێش جیابوونەوەمان لە یەكدی.

بِيَــوْمِ كَرِيهَــةٍ ضَــرْباً وَطَعْنــاً ‌ ‌ ‌ أَقَرَّبِــهِ مَوَالِيــكِ الْعُيُونَــا

كريهة: ڕۆژی ناخۆش، ضرب: لێدان، طعن: زامداركردن، موالی: خزمی نزیك.

دەڵێ: خزمە نزیكەكانت دانیانناوە بە وەشاندنی دەستی ئێمە لەسەریان بە شیر و بە ڕم و بە چاوی خۆیان چەشتیان، داخۆ ئەو ئاژاوەی نێوان ئێمە و كەسەكانت كاڵی نەكردویتەتەوە!.

قِفِـي نَسْـأَلْكِ هَـلْ أَحْـدَثْتِ صُـرْماً ‌ ‌ ‌ لِوَشْـكِ الْبَـيْنِ أَمْ خُنْـتِ الأَمِينَـا

ڕاوەستە خانەكەم پرسیار دەكەین ئەم دابڕانەی ئێمە و ئێوە، پەیوەندی پەلەی نێوانی تێكداوە، یان ئێوە ناپاكبوون بۆ بەڵێن و پەیمان.

تُرِيــكَ إِذَا دَخَلْــتَ عَلَــى خَــلاَءٍ ‌ ‌ ‌ وَقَــدْ أَمِنَــتْ عُيُــونَ الكاشِــحِينَا

خـلاء: بـە تـەنیایی و چـۆڵیی دەوروبـەر، أمنـت: بێخـەم و بـێترس، کاشحین: نەیارەکان کە پشتیان تێکردووین.

دەڵێ: بۆ ئەوەی نیشانت بدرێ کاتێ تەنیا هـەر خـۆتبی و دەورت چـۆڵ بێ و چاوی دوژمنەکانت لەسەر نەبێ، ڕاستی ئێمەت بۆ دەردەکەوێ.

ذِرَاعَـــيْ عَيْطَـــلٍ أَدْمَـــاءَ بِكْـــرٍ    تَرَبَّعَـــتِ الأَجَـــارِعَ وَالْمُتُونَـــا

تریكَ: دەبینی لە بەیتی پێشوو، ذراعي: دوو باڵی درێژی سپی، عطیـل: درێژ، أدماء: سپی، بکر: نۆسکە، تربعت: لە بەهار لەوەڕابێ، الارجاع: گیـای ناو لمی وردی شێدار، المتون: زەوی ڕەقی بۆرەی نەکێڵراو.

دەڵێ: چاو بـەدووباڵی درێـژی سفت و ساف و سـپی بێچووی نۆسـکەی بـەهارەی لەوەڕگـەی گردۆڵکـەی لـی شـێدار و زەوی بـورەی نـەکێڵاوە، لەهەندێ گێڕانەوە.

ذِرَاعَـــيْ حُـــرَّةٍ أَدْمَـــاءَ بِكْـــرٍ    هِجَـــانِ اللَّـــوْنِ لَـــمْ تَقْرَأْجنينـــا

ذراعـی: دوو قـۆڵ، دوو باسـك، حـرة: نێـر، چـەور، أدمـاء: سـپی بـەلای گەنمڕەنگ، بکر: نۆسکە، هیجان: سـپی شـەکەریی، تقـرأ: ئـاوس نـەبووە و کەڵی نەگرتووە لە نێرە.

دەڵێ: ئـەو دۆسـتەی مـن کـە دڵـم لایـەتی و مـن وەفادارم بـۆی لەگـەڵ دوژمنایەتیی خزمەکانی ئەگەر لە جێگەیەکی چۆڵ کـە هـەر خـۆی لێ بـێ کچێکی ناسکی قەرچکی نەرم و قۆڵ و دوو باسکی سپی بەرەو گـەنمڕەنگی و نۆسکەو بەهارە لەوەڕینی کەمی نەکردووە و لە نێرە دوورە.

وَثَـدْياً مِثْـلَ حُـقِّ الْعَـاجِ رَخْصـاً    حَصَـاناً مِـنْ أكُـفِّ اللاَّمِسِـينَا

ثديا: جوتێ مەمۆڵە و مەمكی ناسك، حق: گۆوی تاشراو، عاج: ددانی فیل، رخص: نەرم، حصان: پارێزراو، أكف: دەست و پەنجە، اللامسین: دەستلێدەر.

دەڵێ: جوتێ مەمكە دەبینی وەك دوو گۆوی سپی و سفت وەك لە ددانی فیل داتاشرابێ، بەڵام نەرم و تەڕ و ناسك و هەتا ئێستە دەستی هەرزەكارێ نەیگوشیوە و بە ڕەقیی ماوەتەوە قوت و جوانە!.

وَمَتْنَـيْ لَدْنَـةٍ طَالَـتْ وَلاَنَـتْ    رَوَادِفُهَـا تَنُـوءُ بِمَـا يَلِينَـا

متنی: دوو سمت، دوو كەفەڵ، لدنة: پارێنەوشتری باڵابەرز، طالت: بەرز، لانت: نەرم و نۆڵ، روداف: سمت و كەفەڵ لە دواوە، تنوء: قورسیكردووە بۆ دواوە.

دەڵێ: دوو كەفەڵ، دوو سمت دەبینی بەرز و نەرم، پاشەوەی كەمێ قورسكردووە وەك دووگی بەرخی لێهاتووە، بەرەو دواوە دەڕوانێ، (وەك وێنەی سمت و سێ بەندەی كیژی سترێژ لەپێی ئەمڕۆ!).

تَـذَكَّرْتُ الصِّـبَا وَاشْـتَقْتُ لَمَّـا    رَأَيْـتُ حُمُولَهَـا أُصُـلاً حُـدِينَا

اشتقت: ئارەزووم كرد، الصبا: منداڵیی، حمول: وشترە بارهەڵگرەكان، اصل: زەردەپەڕی ئێواران، حدینا: گۆرانی و عەتابەمان بۆ دەگوترا.

دەڵێ: ئا لەو كاتەی ئەو دیمەنە جوانەی كۆنەیارەكەم كەوتەوە یاد، ئارەزووم دەكرد كە دووبارە ئەو وێنە كۆنە بێتەوە بەرچاوم، كە ئەو

نازدارانە لەناو کەژاوەدا بوون و ئێمە گەمە و یاریمان لەگەڵ دەکردن و گۆرانیمان بۆ دەگوترا.

وأعْرَضـــتِ اليَمامـــةُ وَاشْـــمخَرّتْ    كَأســـــبافٍ بِأيـــــدي مُصْـــــلينا

یمامە: شوێنی هەواری یارە، اعرضت: بە پان و بەرینی دەرکەوت، اشمخرّ: بە شێوە لاکێشە و بە پانی دەرکەوت، مصلین: پانیی و درێژیی شمشێر بە ڕووتیی.

دەڵێ: لەم کاتەدا ناوچەی شاخ و داخی یەمامەی یەمەن دەرکەوت بە درێژیی و پان و بەرینی، وەك پەیکەری شمشێری لەکێلان دەرهاتوو.

فَمَـا وَجَـدَتْ كَوَجْـدِي أُمُّ سَـقْبٍ    أضَـــلَّتْهُ فَرَجَّعَـــتِ الحَنِينَـــا

وجدت: حاڵی لێهات، وجد: حاڵ و یادی کۆن، أم سقب: وشتر، أضلت: لێی ونکرابوو، الحنین: یادکردنەوە.

دەڵێ: ئەوەندە یادم کردووە وەك ئەو دایکە وشترە کە بێچووەکەی لێ ونکرابوو و هەمیشە بۆ دواوە لای ئەکردەوە، بەڵکو بە دیداری شادبێ.

وَلاَ شَـــمْطَاءُ لَـــمْ يَتْـــرُكْ شَـــقَاهَا    لَهَـــا مِـــنْ تِسْـــعَةٍ إلاَّ جَنِينَـــا

شمطاء: پیرەوشتر و بە تەمەن، شقا: بەدبەخت، جنین: بەچکەی ناو سك.

دەڵێ: ئەوەندە خەفەتەم کرد بە ئەندازەی ئەو پیرەژنە، یان پیرەوشترە کە ڕۆڵەی لێ بزرکرابوو، کە ئەو پیرە لە نۆ منداڵ، یان لە نۆ بەچکە تەنها

ئەوەی ماوە، كە لە مندالّدانی دایە، ئەویش مەعلوم نییە بۆی بمێنیّ، ئەم شاعیرە گریانی هاتووە وەك ئەم دیمەنە دڵتەزێنەی باسی كردووە.

وَإِنْ غَـــداً، وَإِنَّ الْيَـــوْمَ رَهْـــنٌ    وَبَعْـــدَ غَـــدٍ بِمَـــا لاَ تَعْلَمِينَـــا

دەڵێ: ژیان چییە؟، ژیان یادە، ژیان بیرەوەرییە، سبەی ئەمڕۆ بارمتەیە و دوو سبەی لەژێر قەدەردایە، كە نازانریّ.

أَبَـــا هِنْـــدٍ فَـــلا تَعْجَـــلْ عَلَيْنَـــا    وَأَنْظِرْنَـــا نُخَبِّـــرْكَ الْيَقِينَـــا

دەڵێ: ئەبو هیند كە عەمری كوڕی مونزرە و لە پادشاكانی مەنازیرەیە لە ناوچەی حیرەی شام، پەلەمان لێمەكە بەڵگەمان هەیە و مۆڵەتمان پیّ بدە، هەموو ڕاستییەك بە جەنابت دەڵێین، بەڵام عەجەلەی كرد و ئەم شاعیرە بە شمشێر لەتوپەتی كرد، لە ماڵ و كۆشك و سەرای خۆیدا.

بِأَنَّـــا نُـــورِدُ الرَّايَـــاتِ بِيضـــاً    وَنُصْـــدِرُهُنَّ حُمْـــراً قَـــدْ رَوِينَـــا

الرايات: ئالاّ، پەرچەم، بيض: سپی، حُمر: سوور.

دەڵێ: ئەوە ئێمەین جەنابی مەلیكی عەرەب ئالاّكان بە سپی دەبەنە ناو ساحەی شەڕەوە و بەڵام بە سوور دەیانهێننەوە بەخوێنی نەیارەكان ئاوماندادوە، ئێمە كوڕی ڕۆژی تەنگانەین.

وَأَيَّـــامٍ لَنَـــا غُـــرٍّ طِـــوَالٍ    عَصَـــيْنَا الْمَلْـــكَ فِيهَـــا أَنْ نَـــدِينَا

غرّ: پرشنگدار، طوال: مێوی درێژ، عصينا: بیّ فەرمانیی، ملك: پادشای فەرمانڕەوا، ندين: گوێڕایەڵ و خزمەتكار.

دەڵێ: لە ئەنجومەنی ساباتی مەلیكدا و بە حزوری هەردوو هۆزی نەیار: ئەوە ئێمەین پێشینەی پرشنگدارمان هەیە، مێژووی درێژی پڕ لە شانازیمان هەیە، ئەوە ئێمەین هەرگیز بە فەرمانی مەلیكی عەرەبمان نەكردووە.

وَسَـــيِّدِ مَعْشَـــرٍ قَـــدْ تَوَّجُـــوهُ     بِتَـاجِ الْمُلْــكِ يَحْمِــي الْمُحْجَرِينَــا

سید: گەورە، معشر: جەماوەر، توجوه: تاجیان لەسەرناوە، یحمی: پارێزەر بوو، المحجرین: ئەوانەی ئەوكاتە لە بەردەستمان گەمارۆ درابوون.

دەڵێ: پاشای زۆر گەورەمان ڕاوناوە كە تاجی شایەتیی لەسەر نراوە لەلایەن جەماوەرەوە و نیازی بووە ئەوانەی ئێمە گەمارۆماندابوون لە تەنگەبەردینەكاندا.

تَرَكْنَــا الخَيْــلَ عَاكِفَــةً عَلَيْــهِ     مُقَلَّـــدَةً أَعِنَّتُهَـــا صُـــفُونَا

عاكفة: سەری شۆڕ كردبوو، مقلدة: ڕەشۆیان لەسەربوو، صفون: سیفەتی ئەسپە لەسەر سێ قاچ ڕاوەستاوە و چوارەمی بەرزكردووەتەوە.

دەڵێ: پادشامان كوشت و ئەسپەكان كە زین و لەغاویان لەسەر بوو لەسەر سێ پێ وەستابوون، كەس نەما دژی ئێمە.

وَقَـدْ هَـرَّتْ كِـلاَبُ الْحَـيِّ مِنَّـا     وَشَـــذَّبْنَا قَتَـــادَةَ مَـــنْ يَلِينَـــا

هرّت: وەڕی، شذبنا: دامانپاچی، قتادة: درەختی دڕكاویی عەرەب.

دەڵێ: ئەوە ئێمەبووین سەگەلی گوندەکە لێمان نەوەڕین و ئێمەبووین درەختی دڕکاویانمان هەڵپاچی و داپاچی، وەك خۆیانمان هەڵپاچ و داپاچ کرد.

مَتَــى نَنْقُــلْ إِلَــى قَــوْمٍ رَحَانَــا    يَكُونُــوا فِــي اللِّقَــاءِ لَهَــا طَحِينَــا

رحی: ئاش، طحین: ئارد.

دەڵێ: ئێمە ئاشی خۆمان بووە لە هەر شوێن و هۆزێکدا ئێمە ئەبینە ئاش و ئەوان ئەبنە ئاردا.

يَكُــونُ ثِفَالُهَــا شَــرْقِيَّ نَجْــدٍ    وَلُهْوَتُهَــا قُضَــاعَةُ أَجْمَعِينَــا

ثفال: سەردۆڵەی نانکردن لەچەرمی بزن و مەڕ درووست دەکرێ، لهوة: لاگوێل، مشت.

دەڵێ: ئەوکاتە سەردۆڵە و بندۆڵەیان ڕەوانە دەکەین بۆ ڕۆژهەڵاتی نەجد و لاگوێلی کۆتەڵەکەش ڕەوانەی لای هۆزی قوزاعە دەکەین، هەموویانا.

وَإِنَّ الضِّــغْنَ بَعْــدَ الضِّــغْنِ يَفْشُــو    عَلَيْــكَ وَيُخْــرِجُ الــدَّاءَ الــدَّفِينَا

ضِّغْنَ: ڕق و کینە، الدَّفِينَ: شاراو، يَفْشُو: بڵاودەبێتەوە.

دەڵێ: ڕق و کینەتان بڵاوە پێ دەکەین و دەرد و غەزاری ناو دڵتان بە جارێ ڕادەماڵین و دەرگای ڕق و کینە شاراوەکەتان بڵاودەبێتەوە.

وَرِثْنَــا الْمَجْــدَ قَــدْ عَلِمَــتْ مَعَــدٌّ    نُطَــاعِنُ دُونَــهُ حَتَّــى يَبِينَــا

دەڵێ: ئێمە شەرەف و گەورەیی بە میرات بۆمان ماوەتەوە، لە مەعد و عەدنان و قەحتانەوە بۆمان هاتووە، شەڕی لەسەر ئەکەین هەتا بۆ هەموو عەرەب دەرکەوین ئێمە ڕەسەنین!.

وَنَحْــنُ إِذَا عِمَــادُ الْحَــيِّ خَــرَّتْ    عَلَــى الأَحْفَــاضِ نَمْنَــعُ مَــنْ يَلِينَــا

عماد: ستوونی دەوار، الاحفاض: وشتری باری خورج و کەل و پەلی ناومالّ.

دەڵێ: ئەوە ئێمەین ئەگەر مالّ بارکرا و دەوار پێچرایەوە وشتر باری لەسەر دانرا ئێمە جێگە و هەوارگەیان بۆ دەپارێزین لە بارکردن و نیشتەجێ بوون.

نُــدَافِعُ عَــنْهُمُ الأَعْــدَاءَ قِــدْماً    وَنَحْمِــــلُ عَــــنْهُمُ مَاحَمَّلُونَــــا
نُطَــاعِنُ مَــا تَرَاخَــى النَّــاسُ عَنَّــا    وَنَضْــرِبُ بالسُّــيُفِ إِذَا غُشِــينَا
بِسُــمْرٍ مِــنْ قَنَــا الْخَطِّــيِّ لُــدْنٍ    ذَوَابِــــلَ أَوْ بِبِــــيضٍ يَعْتَلِينَــــا

تدافع: بەرخودان دەکەین، قدما: پێش پەلاماردان، نحمل: هەڵدەگرین، حملونا: هەر ئەرکێ لە سەرمان دانرا، نطاعن: دەجەنگین، تراخی: دوورکەوێتەوە، غشینا: بدەن بەسەرماندا، سمر: ڕمی چاکی ئەسمەر، لدن: خۆشدەست و نەرم، ذوابل: ڕەق و وشك.

دەڵێ: ئێمە بەرگریی دەکەین دژی دوژمن لەو هۆز و خێڵانەی پەنامان بۆ دێنن و هەرچی لەسەرمان دانرێ لە ڕێکەوتنی خێڵەکان شانی دەدەینە بەر، ئێمە دوورەشەڕین ئەگەر خەڵك وازمان لێ بێنن، بەلاّم ئەگەر بدەن بەسەرماندا ئێمە دەستیان لێ دەوەشێنین، بەجۆرە ڕمێك زۆر جوان

دەچەمێتەوە بێ شکاندن و تیژ و باریك و بڕندەیە، یان بە شیری سپی دەبان و زاخاودراو، ئەوەی سەربەرزکاتەوە.

نَشُقُّ بِهَا رُؤُوسَ الْقَوْمِ شَقّاً    وَنُخْلِيهَا الرِّقَابَ فَيَخْتَلِينَا
تَخَالُ جَمَاجِمَ الأَبْطَالِ فِيهَا    وُسُوقاً بِالأَمَاعِزِ يَرْتَمِينَا

نشق: لەتوپەت دەکەین، نخليها: وەك پووش و پەلاّشی لێ دەکەین، يختلی: ئەوانیش بەرگری ناکەن لە پووشبوونی خۆیان، جماجم: کەللەسەر، وسوق: لێژنە باری ولاّخ، الاماعز: زەوی و ئەو شوێنەی لمی زۆرە.

دەڵێ: کەللەسەرەکان وردوخاش دەکەین و سەریان لە لاشە دەکەینەوە و لە گۆڕەپانی شەڕگەدا وەك پووش و قنگلاشکی وشکی لێ دێت و ئەوانیش بەرگریی ناکەن لە ملپەڕاندن، ئەوجا وادەزانی و گومان دەبەی کەللەسەری پاڵەوانە کوژراوەکان لەساحەکەدا لێژنەیە و لەسەر زەوی دانراوە و زەویەکە ڕەقە و لماوییە و بەردە.

نَحُزُّ رُؤُوسَهُمْ فِي غَيْرِ بِرٍّ    فَمَا يَدْرُونَ مَاذَا يَتَّقُونَا
كَأَنَّ سُيُوفَنَا فِينَا وَفِيهِمْ    مَخَارِيقٌ بِأَيْدِي لاَعِبِينَا

نحز: ئەپەڕێنین، بر: بەزەیی و ڕەحم، يتقونا: خۆیان بپارێزن، المخاريق: تۆپی منالانە کە گەمەی پێ ئەکەن لە خوری دروست دەکرێ و ڕاستی نییە وەك گۆوی ئاسن.

دەڵێ: سەریان لە بەدەنیان دەکەینەوە، هیچ بەزەییمان نایەتەوە و ئەوانیش توانایان نییە خۆپارێزیی بکەن، چونکە بێ قەڵغانن، ئەوجا

ئەوە كاری شمشێری ئێمە و كاری شمشێری ئەوان، وەك گۆچانی لاروویێری دەستی مندالّ كە یاری تۆپی پێ ئەكەن، یان مەبەستی ئەوەیە شمشێری ئێمە و سەری ئەوان وەك (یاری سەولەجان) بە ئاسنی دەستی ئێمە و تۆپی خوری دەستی مندالآن نەرم و شلە.

كَـــأَنَّ ثِيَابَنَـــا مِنَّـــا وَمِـــنْهُمْ      خُضِـــبْنَ بِـــأَرْجُوَانٍ أَوْطُلِينَـــا

دەڵێ: بەرگی ئێمە و بەرگی ئەوان ئەڵێی ڕەنگی ئەرخەوانی لێدراوە وا سوور بووە یان بۆیە كراوە بە ڕەنگی زۆر سوور.

إِذَا مَـــا عَـــيَّ بِالإِسْـــنَافِ حَـــيٌّ      مِـــنَ الْهَـــوْلِ الْمُشَـــبَّهِ أَنْ يَكُونَـــا

عیَ: داماوبوو، بێ توانا بوو، الاسناف: هێرشبردن لە شەڕگەدا، حیَ: خێڵێك، هۆزێك، الهول: ترس، المشبه: سەرلێشێواو.
دەڵێ: ئەگەر لایەك، هۆزێك، سەریان لێشێوا و گیریان خوارد لە گۆڕەپانی شەڕگەدا و نەیاندەزانی چی بكەن، لە ترس و سامناكیی جەنگاوەرانی ئێمەیە، ئەوە ئێمە بووین ئالآمان لە زەویدا ڕواند.

نَصَـــبْنَا مِثْـــلَ رَهْـــوَةَ ذَاتَ حَـــدّ      مُحَافَظَـــةً وَكُنَّـــا السَّـــابِقِينَا

نصبنا: چادرمان هەڵدا، رهوة: ناوی چیایەكی دیارە، ذات حد: سوپایەكی خاوەن شەوكەت، محافظة: بۆ پاراستنی شەرەف.
دەڵێ: كە نەیارەكان بە سەرلێشێواویی هاتنە بەرچاومان ئێمە ئالآ و دەواری خۆمان هەڵدا وەك شاخی رەهوە بەرز و دیار بۆ ئەوەی پاراستنی شەرەفی خۆمانی لێ بكەین.

بِفِتْيَـــانٍ يَـــرَوْنَ القَتْـــلَ مَجْـــداً وَشِـــيبٍ فِي الْحُـــرُوبِ مُجَرَّبِينَـــا
حُـــدَيَّا النَّـــاسِ كُلِّهِـــمُ جَمِيعـــاً مُقَارَعَـــةً بَنِـــيهِمْ عَـــنْ بَنِينَـــا

فتیـان: لاوان، مجـد: بـەرزی و گـەورەیی، شـیب: بەساڵاچـوو، مجـرّبین: بەئـەزموون، حـدیا: تاقانـەی نـاو خـەڵك، بـێ منـەتی نـوانن، مقارعـة: شەڕمنێزە.

دەڵـێ: ئـەو شـەڕە بـە كۆمەڵـە گـەنجێك دەكـەین كـە مـردن لـە پێنـاوی نەتەوە و قەوم بە بەرزیی دەزانن و شانازی پێ دەكەن و كۆمەڵە پیـاوێكی بە تەمەن كە ئەزموونێكیان هەیە لـە جەنگدا، تەحـەدای خـەڵك ئەكـەن هەموویان بە كۆمەڵ داوای ڕووبەڕوو بوونەوە دەكەن و شەڕمنێزە دەكەن، كوڕانی ئێمە لەگەڵ كوڕانی ئەوان.

فَأَمَّـــا يَـــوْمَ خَشْـــيَتِنَا عَلَـــيْهِمْ فَتُصْـــبِحُ غَـــارَةً مُتَلَبِّبِينَـــا
وَأَمَّـــا يَـــوْمَ لاَ نَخْشَـــى عَلَـــيْهِمْ فَتُصْـــبِحُ فِـــي مَجَالِسِـــنَا ثُبِينَـــا

خشیته: ترس، متلبب: ئامادە بەچەك و سیلاحەوە، ثبین: بڵاوەكردن.

دەڵـێ: ئێمـە ئەگـەر ترسمـان هـەبوو لـە پـەلاماریان ئـەوە شـەووڕۆژ ئامادەین دەست بەچەك و ئامادە و ئەو ڕۆژە كە ترسمان نەبوو بە كۆمەڵ لە كۆڕی ڕابواردنداین.

بِـرَأْسٍ مِـنْ بَنِـي جَشَـمَ بْـنِ بَكْـرٍ نَـــدُقُّ بِـــهِ السُّـــهُولَةَ وَالْحُزُونَـــا

رأس: سەرۆك، ڕابەر، جشم: كوڕی كەلعوزی شاعیرە، السهولة: نـەرمان، الحزون: ڕەتان.

دەڵێ: ئێمە بە سەرۆکی گەورەی هۆزی جوشمی کوڕی بەکر هەموو هۆز و خێڵێکی نەرم و ڕەق تالان ئەکەین و سەری هەموویان ئەکوتین؟.
(ئاخر بەم شێوەبوون بۆ یەکتر بۆیە فارس و ڕۆم سەریان دەکوتانەوە و ئێستەش کە (٢٤) دەوڵەتیان هەیە بۆ یەکتر و بەس بۆ کورد ئازان!).

بِــأَيِّ مَشِــيئَةَ عمــروَ بْــنَ هِنــدٍ    تُطيــع بِنــا الوشــاة وتَزدرينــا
بِــأَيِّ مَشِــيئَةٍ عَمْــروَ بْــنَ هِنْــدٍ    نَكُــونُ لِقَــيْلِكُمْ فِيهَــا قَطِينَــا؟

مشيئة: ویست و ئارەزوو، تطيع: گوێڕایەڵ، الوشاة: دووزمان و شۆفار، تزدري: بە سووك بۆی دەڕوانی، قيل: سەرکار، قطين: بەندەی دەربار.
دەڵێ: کابرا عەمری کوڕی هیند بە کام ویست و ئارەزووت بە گوێی شۆفار و دووزمان و شات و شوتەران ئەکەیت و ئێمەت ڕق لێیە، بۆ؟، دووبارە بەکام خواست و ئارەزووت دەکەوی، ئێمە بکەیتە کۆیلەی کونجاو و سەرکار و پیاوەکانت و ئێمە خزمەتکار و ڕەنجبەری دەرباری خۆت!؟.

تَهَــدَّدْنَا وَأَوْعِــدْنَا رُوَيْــداً    مَتَــى كُنَّــا لِأُمِّــكَ مَقْتَوِينَــا؟

تهددنا: هەڕەشەمان لێ دەکەیت، توعد: گوڕەشەی تۆڵە، رويدا: هێواش، پەلە مەکە!، مقتوين: خزمەتکاری بەردەست.
دەڵێ: کابرا کە خۆت کردووە بە مەلیك و هەڕەشە و گوڕەشە لە ئێمە دەکەیت، هێواش، پەلەمەکە، هەڕەشە لە کێ ئەکەی؟، لە ئێمە!؟ ئێمە کەی خزمەتکاری دایکت بووین؟، بەسەری دایکیت ئەوە ئێمە نین کە ڕۆژێ لە ڕۆژان لە هەڕەشەی کوڕی هیند ترسابین.

فَـــإِنَّ قَنَاتَنَــا يَــا عَمْــرُو أَعْيَــتْ عَلَــى الأعْــدَاءِ قَبْلَــكَ أَنْ تَلِينَــا
إِذَا عَــضَّ الثِّقَــافُ بِهَــا اشْــمَأَزَّتْ وَوَلَّـــتْهُمْ عَشَـــوْزَنَةً زَبُونَـــا

قناة: ئەسڵ و فەسڵ، اعيت: دەستەپاچەی كردووە، تلين: نـەرم بكـات، عضَ: گاز بگرێ، الثقاف: جەڕ و مەگەنە، إشمأزت: هەڵئەقۆڕێنێ، عشوزنة: وشتری چەمووش و جووتەهاوێژ، زبون: لەقە.

دەڵێ: ئێمە لەو جۆرە كەسانە نـين كـە بـە ئاسانيی لار ببينـەوە و بچەمێینەوە و زۆر كەس پێش تۆش هەوڵی داوە، بـەڵام توانـای نـەبووە و بەزيوە و توانای نەبووە، ئێمە نەرم بكات ئەگەر جەڕ و مەگەنە گاز بگرێ لە ڕەگی ئێمە خۆی دەچـەمێتەوە و لار ئـەبێ و جووتـە ئـەدات لـەدەم و قـەپۆزی و دەم و ددانـی ئـەهاڕێ، واتـە چـۆن وشـتری چـەمووش و سـرك ئەوەی نيازی دۆشينی هەبێ بەرجووتەی دەكەوێ، تۆش بەو شێوە قـەپۆز و كەپووت ئەشكێ.

عَشَـــوْزَنَةً أَذَا انقَلَبَـــتْ أَرَنَّـــتْ تَـــدُقُّ قَفَـــا المُثَقِّـــفِ وَالْجَبِينَـــا

إنقلبـت: لابكاتـەوە، أرنـت: دەنگـی بـەرز دەبێتـەوە، تـدق: تـەكانی ورد دەكات، قفا: پشتمل، الجبين، ناوچاو.

دەڵێ: ئەو خەڵكەی ئێمـە سروشـتی ئـەو وشـترە سـركەی هەيـە، ئەگـەر ناڵبەنـد، يـان لەغاوكـەر، هەوڵبـدات پاشـووی بـەرز بكاتـەوە، ئەنـەڕێنێ بەسەريدا و بە دەست و بە قاچ پشتمل و ناوچاوی وردوخاش ئەكات.

فَهَـلْ حُـدِّثْتَ فِـي جُشَـمَ بْـنِ بَكْـرِ بِـــنَقْصٍ فِـــي خُطُـــوبِ الأَوَّلِينَـــا؟

ڕوو لە عەمری کوڕی هیند دەکات و دەڵێ: ئەری هەتا ئەمڕۆ بۆیان نەگێڕاویتەوە لە هۆزی جەشەمی کوڕی بەکر کە کەمووکوڕی لە کاروبارییاندا هەبووبێت لە کۆنەوە هەتا ئەمڕۆ؟.

وَرِثْنَا مَجْدَ عَلْقَمَةَ بْنِ سَيْفٍ    أَبَاحَ لَنَا حُصُونَ الْمَجْدِ دِينَا
وَرِثْتُ مُهَلْهِلاً وَالْخَيْرَ مِنْهُ    زُهَيْراً، نِعْمَ ذُخْرُ الذَّاخِرِينَا

دەڵێ: پادشام، ئێمە میراتی عەلقەمەی کوڕی سەیفین کە قەڵای سەخت و دژواری زۆر بەرزی بۆ ئێمە داگیرکرد و لەبەر دەستی ئێمەی دانا و من بەتایبەتی میراتی موهەلهەل و لەویش چاکتر زوهەیر کە باشترین گەنجینەیە بۆ ئێمە.

وَعَتَّاباً وَكُلْثُوماً جَمِيعاً    بِهِمْ نِلْنَا تُرَاثَ الأَكْرَمِينَا
وَذَا الْبُرَةِ الَّذِي حُدِّثْتَ عَنْهُ    بِهِ نُحْمَى وَنَحْمِي الْمُلْجَئِينَا

دەڵێ: ئێمە نەوەی موهەلهەلین کە چل ساڵە سەرکردەی هۆزی وائیل بوون، کە دەبێتە باپیری عەمری کوڕی کولسوم لەدایکییەوە و نەوەی زوهەیرین کە باپیرە لە دایکییەوە و نەوەی عەتاب و کولسومین، ئەوانە هەموویان میراتی پایەبەرز و بە نرخی ئێمەن و ئێمە خاوەنی لوتەوانە لە لوتین کە تۆ چاك دەیناسی و ئێمە کە پەنای ئەوین و بە هۆی ئەویشەوە ئەوەی پەنامان بۆ بێنێ دەیپارێزین.

وَمِنَّا قَبْلَهُ السَّاعِي كُلَيْبٌ    فَأَيُّ الْمَجْدِ إِلاَّ قَدْ وَلِينَا؟

دەڵێ: لەپێش ئەم کەڵە پیاوانی عەشیرەتی ئێمە خێرخوازی وەك کولەیبمان هەبووە، کام بەرزیی و شکۆ هەیە لە دەستی ئێمەدا نەبێ؟، کولەیب برای موهەلهەلە و مامی شاعیرە و جەساس ناوێك کوشتی، شەڕی بەسووسیش لەسەر ئەو قەوما.

مَتَــى نَعْقِــدْ قَرِينَتَنَــا بِحَبْــلٍ    نَجُــذ الْوَصْــلَ أَوْ نَقِــصِ الْقَرِينَــا

قرينة: هاوتا، هاوشان، نجذ: دەپەڕێنین، نقص: دەکوتینەوە.

دەڵێ: ئەگەر وشترمان هاومل بکرێ بە پەتی قایم بە وشتری خەڵکەوە پەتەکە دەبڕین و پارەپارەی دەکەین و ملی وشترە هاوملەکە ورد ئەکەین، مەبەستی ئەوەیە هاوتای کەس نین.

وَنُوجَــدُ نَحْــنُ أَمْــنَعَهُمْ ذِمَــاراً    وَأَوْفَــاهُمْ إِذَا عَقَــدُوا يَمِينَــا

ذِمار: شەرەف، ناموس، عقدوا: پەیمان ببەستن، یمین: سوێندخواردن.

دەڵێ: بۆ پاراستنی شەرەف و ناموس و خێزانمان ئێمە لە هەموو کەس زیاتر پارێزەربن و لە کاتی پەیمان و بەڵێندا ئێمە لە هەموو کەس زیاتر بەوەفاین بۆ شوێنی خۆمان.

وَنَحْــنُ غَــدَاةَ أُوقِــدَ فِــي خَــزَازٍ    رَفَــدْنَا فَــوْقَ رِفْــدِ الرَّافِــدِينَا

وَنَحْــنُ الْحَابِسُــونَ بِــذِي أُرَاطَــى    تَسَــفُّ الْجِلَّــةُ الْخُــورُ الــدَّرِينَا

أوقــد: هەڵگیرســا، خــزاز: نــاوی چــیا و ئاوێکــە، رفــدنا: بەخشــیمان، الحابسون: مانەوە لە شوێنێك، أراطي: ئاوێکی دیار، تسف: دەلەوەڕێ، الجلە: وشتری گەورە، الخور: شیردەر، الدرين: پووشی کۆن.

دەڵێ: ئەوە ئێمە بووین کە ئاگری شەڕ بڵێسەی سەندە چیای خەزاز بەشی ئێمە و بەخشینی ئێمە لەسەری هەموو بەشەکانەوە بوو، ئەوە ئێمە بووین کە وشترەکانمان لە نزیك ئاوی ئەراتی هێشتەوە کە وشترە گەورە و شیردەرەکانمان ئالفیان تەنها پووشی وشك بوو.

وَنَحْــنُ الْحَــاكِمُونَ إِذَا أُطِعْنَــا     وَنَحْــنُ العَــازِمُونَ إِذَا عُصِيــنَا
وَنَحْــنُ التَّــارِكُونَ لِمَــا سَــخِطْنَا     وَنَحْــنُ الآخِــذُونَ لِمَــا رَضِيــنَا
وَكُنَّــا الأَيْمَضِـــنِينَ إِذَا الْتَقَيْنَــا     وَكَــانَ الأَيْسَــرِينَ بَنُــو أَبِينَــا

لەبەردەم مەلیکی عەرەبدا خۆی و هۆزەکەی وەسفدەکات و دەڵێ: ئێمەین فەرمانڕەوا، کاتێ خەڵك گوێڕایەڵ بوون، ئێمەین خۆڕاگر، ئەگەر تووشی جەنگ بووین، ئێمەین ئەگەر شتێك بەدڵمان نەبوو نایکەین، ئێمەین ئەگەر ویستمان ئەوە بکەین، ئێمەین هەمیشە باڵی ڕاستی شەڕگەین، ئامۆزاکان لای چەپ بوون.

فَصَــالُوا صَــوْلَةً فِــيمَنْ يَلِــيهِمْ     وَصُــلْنَا صَــوْلَةً فِــيمَنْ يَلِينَــا
فَــآبُوا بِالنِّهَــابِ وَبِالسَّــبَايَا     وَأُبْنَــا بِــالْمُلُوكِ مُصَــفَّدِينَا

دەڵێ: ئێمە لە ڕاست و ئامۆزاکان لە چەپدا پەلاماری دوژمنمانداوە، ئێمە لە بەرەی خۆمان و ئەوانیش لە بەری خۆیان، ئامۆزاکان تاڵانیی ماڵ و منداڵیان هێنا و چەپاوی زۆریان دەسکەوت و ئێمەش لای ڕاستەوە گەورە و میرەکانمان لە کۆت و پەیوەند و زنجیردا دەستکەوت.

إِلَـيْكُمْ يَـا بَنِـي بَكْـرٍ، إِلَـيْكُمْ ... أَلَمَّـا تَعْرِفُـوا مِنَّـا اليَقِينَـا
أَلَمَّـا تَعْلَمُـوا مِنَّـا وَمِـنْكُمْ ... كَتَائِـبَ يَطَّعِـنَّ وَيَرْتَمِينَـا
عَلَيْنَـا الْبَـيْضُ وَالْيَلَـبُ الْيَمَـانِي ... وَأَسْـيَافٌ يَقُمْـنَ وَيَنْحَنِينَـا

اليكم: دوركەونەوە، كتائب: دەستە، تيپ، البيض: ئاسن، اليلب: كراسى شمشێرنەبڕ، ينحنى: دەچەمێتەوە.

دەڵێ: دووركەونەوە كوڕانى بەكر دووركەونەوە!، ئەرێ ئێوە نازانن ئێمە كێين؟، چ كەسين؟، هەر بەڕاست نازانن؟، ئەوەش نازانن دەستە و تيپ لە ئێمە بوو كە بە ڕم و شیر و تیر دەستيان دەوەشاند و لاشەيان دەخستە زەوى؟، ئێمە بووين ئاسنمان پۆشيوە، ئێمەبوين پێستى وشترى ژێرنەبڕمان لەبەر دەكرد لەگەڵ شمشێرى دەمەزەرد بەرز دەبوەوە و لار دەبووەوە بۆ سەر و گوێلاكى دوژمن.

عَلَيْنَـا كُـلُّ سَـابِغَةٍ دِلَاصٍ ... تَـرَى فَـوْقَ النِّجَـادِ لَهَـا غُضُـونَا
إِذَا وُضِـعَتْ عَـنِ الأَبْطَـالِ يَوْمـاً ... رَأَيْـتَ لَهَـا جُلُـودَ الْقَـومِ جُونَـا
كَـأَنَّ مُتُـونَهُنَّ مُتُـونُ غُـدرٍ ... تُصَـفِّقُهَا الرِّيَـاحُ إِذَا جَرَيْنَـا
وَتَحْمِلُنَـا غَـدَاةَ الـرَّوْعِ جُـرْدٌ ... عُـرِفْنَ لَنَـا نَقَائِـذَ وَافْتُلِينَـا

السابغة: بەرگى ڕمنەبڕ و قايم، الدلاص: خز كە شيرى لێى دەخزێ، التجاد: قايشى شمشێر كە لەمل دەكرێ، الغصون: پەتگرێدار و شەپۆلدار، جون: ڕەش، يان سپى، غدر: شەپۆلى ئاو، جرد: ئەسپى تووكومريو و ساف، نقائد: هەڵبژاردە.

دەڵێ: لە شەڕدا بەرگی شمشێرنەبڕمان لەبەردابوو کە بەرگی ساف و خزە کە تیر و شیری لەسەری دەخزێ، لەسەر ئەو بەرگەوە قایشی شمشێرەکان لاربووبووەوە بەسەرشانماندا، هەرکات قارەمانانمان بەرگ و پەلاشی شەڕیان لەخۆبدایە پێستی بەدەنیان دەبوو بە ڕەش، یان بە ئارەق سپی دەبوو وەك دەمی شمشێرەکان، چونکە تیغی دەبان و ئەسڵ بوون وەك ئاو با لێیبدات، گۆلی هەبوو، لەکاتی پەلامارمان سواری جوانۆماین بوون، ساف و لای خۆمان هەڵمانبژاردبوو، چنك لە دوژمن گیرابوو، خۆمان لە شیرمان بڕیبوونەوە.

وَرِثْنَاهُنَّ عَنْ آبَاءِ صِدْقٍ     وَنُورِثُهَا إِذَا مُتْنَا بَنِينَا
وَقَدْ عَلِمَ الْقَبَائِلُ مِنْ مَعَدٍّ     إِذَا قُبَبٌ بِأَبْطَحِهَا بُنِينَا

دەڵێ: ئەم هەموو شانازیی و شکۆیە بۆمان ماوەتەوە لە باوکی ڕاستیی و بێگومانەوە پاش خۆمان کە مردین کوڕانی ڕاستی خۆمان هەیە بە میراتیی دەبەن، هەموو هۆزەکان لە مەعدەوە ڕەچەڵەك دەگرن، دەزانن کە لەسەری شیو و دەوار هەڵدەدا.

بِأَنَّا الْعَاصِمُونَ بكل كَحْلٍ     وَأَنَّا الْبَاذِلُونَ لِمُجْتَدِينَا
وَأَنَّا الْمَانِعُونَ لِمَا يَلِينَا     إِذَا مَا الْبِيضُ زَايَلَتِ الْجُفُونَا
وَأَنَّا الْمُنْعِمُونَ إِذَا قَدَرْنَا     وَأَنَّا الْمُهْلِكُونَ إِذَا أُتِينَا
وَأَنَّا الشَّارِبُونَ الْمَاءَ صَفْوا     وَيَشْرَبُ غَيْرُنَا كَدَراً وَطِينَا

دەڵێ: ئێمەین پارێزەری ئەوەی لە پەناماندا بێ لە ساڵی قات و گرانیی و وشکەساڵیی، ئێمەین بەخشندە و دەستگوشاد بۆ ئەوانەی ڕوومان لێ

دەنێن و داوا دەکەن، ئێمەین کە سێبەرین بۆ ئەوانەی لە نزیک ئێمەوە کۆچ و باردەخەن، ئەوە ئێمەین لە دیل خۆش دەبین و ڕێزی دەگرین و ئەوەی هێرش بکاتە سەری لەناوی دەبەین، چونکە ستەم قەبوڵ ناکەین و خۆمانیش ستەم ناکەین، ئەوە ئێمەین هەمیشە یەکەمجار لەسەر ئاو دادەبەزین و ئاوی ڕوون دەخۆینەوە و دوای ئێمە خەڵك بە لیلیی و قوڕاویی ئەیخواتەوە.

أَلاَ أَبْلِـغْ بَنِـي الطِّمَّـاحِ عَنَّـا     وَدُعْمِيّـاً فَكَيْـفَ وَجَـدْتُمُونَا
نَـزَلْتُمْ مَنْـزِلَ الأَضْـيَافِ مِنَّـا     فَعَجَّلْنَـا الْقِـرَى أَنْ تَشْـتِمُونَا
قَرَيْنَـاكُمْ فَعَجَّلْنَـا قِـرَاكُمْ     قُبَيْـلَ الصُّـبْحِ مِـرْدَاةً طَحُونَـا

دەڵێ: ئاگاداری خێڵی تەماح و دوعمیی بکەین لەبارەی ئێمەوە باستان بۆ بکەن، ئێمەبووین لەگەڵیاندا، ئێوە هاتن بە میوانی ئێمە و ئێمە زۆر زوو شیومان بۆ ئامادە کردن، مەبەستی ئەوەیە هاتن بۆ شەڕ، ئێمەش خوا هەڵناگرێ شیومان دەرخوارددان، نەوەك لای پاشا خراپەمان بڵێن و جنێومان بدەنێ، زۆریش بەپەلە نانی بەیانیتان بۆ ئامادەکرا لەلایەن ئەو تیپەوە کە ئێوەی کردە ئاردی ناو دڕك و پرش و بڵاوی کردنەوە، تێگەیشتن!.

عَلَـى آثَارِنَـا بِـيضٌ كِـرَامٌ     نُحَـاذِرُ أَنْ تُفَـارِقَ أَوْ تَهُونَـا
ظَعَـائِنُ مِـنْ بَنِـي جُشَـمَ بْـنِ بَكْـرٍ     خَلَطْـنَ بِمِيْسَـمٍ حَسَـباً وَدِينَـا

آرنا: لە دوامانەوە، بیض: ژنانی پاك و خاوێن و بێگەرد، تهونا: سوکایەتیان پێ دەکرێ، خلطن: ئامێتەبووە، میسم: جەماڵ و جوانیی.

دەڵێ: ئێمە تەنها پیاوانمان ڕەشید و جەنگاوەر نین و بەس، بەڵکو ژنانمان لە دواوەن نەوەك ئێمە بترسین و پاشەكشە بكەین و بڕوخێین، ئەوانە ئافرەتی ناو حەرەم و ئازاد و كەژاوەنشینی جوانیی و ڕەسەنیی و ئاینیان بەیەكەوە ئامێتەكردووە، ئەوە نیشانەی زیندویەتیی خێزانی ئەو سەردەمەیە.

أَخَــذْنَ عَلَــى بُعُــولَتِهِنَّ عَهْــداً    إِذَا لاَقَــوْا فَــوَارِسَ مُعْلَمِينَــا
لَيَسْــتَلِبُنَّ أَبْــدَاناً وَبَيْضــاً    وَأَسْــرَى فِــي الْحَدِيــدِ مُقَرَّنِينَــا

دەڵێ: بۆ پاراستنی شەرەف و نامووس و ژنانی هۆز پەیمانمان دابوو بە ژنەكان و ئەوانیش مەرجیان دانابوو لەسەر پیاوەكان و مێردەكان كە بەشەڕ هاتن لە گەڵ سوارانی دیار و بەناوبانگ دەبێ زرێ و شمشێر و چەكەكانیان بەتالان بێنن و خۆشیان بە دیلیی و دەست و پێ لە كۆت و كەلەبچە و زنجیردابن، ئەوە عادەتی عەرەب بووە، هەمیشە منداڵ و ژن و دایك و خوشكیان لەگەڵ بووە بۆ ورە و وزە.

إِذَا مَــا رُحْــنَ يَمْشِــينَ الْهُوَيْنَــا    كمــا اضْــطَرَبَتْ مُتُــونُ الشَّــارِبِينَا
يَقُــتْنَ جِيَادَنَــا وَيَقُلْــنَ: لَسْــتُمْ    بُعُولَتَنَــا إِذَا لَــمْ تَمْنَعُونَــا
إِذَا لَــمْ نَحْمِهِــنَّ فَــلاَ بَقِينَــا    لِشَــيْءٍ بَعْــدَهُنَّ وَلاَ حَيِينَــا

دەڵێ: ئەو ژن و ئافرەتانەی هۆزی ئێمە كە لەگەڵ جەنگاوەراندان لەبەر قەڵەویی و ناز و نیعمەت و نەترسان كە دەچن بە ڕێگەدا بەنەرمیی و لەسەر خۆ ڕێ دەكەن و بەم لاوئەولادا لار دەبنەوە، ئەڵێی پشتی سەرخۆشە كە خۆیان دەلەرێنەوە، ئەوەش دەڵێ: ئەوە لە تەمەڵیی

و بێكاریی نییە، چونكە ئەوانە جگە لە كاری ناومالْ و بەخێوكردنی منداڵ، ئالفی ئەسپەكان دەدەن و خزمەتی ولاخەكان دەكەن و مەڕومالات بەخێو دەكەن و هەمیشە هانی ئێمە دەدەن، ئەگەر پارێزگاری لە ئێمە نەكەن ئێوە پیاو نین و مێرد نین، ڕاست دەڵێن ئەگەر ئێمە توانای پاراستنی ئەوانمان نەبوو با ژیانمان نەبێ و زیندوو نەبین.

وَمَــامَنَعَ الظَّعَــائِنَ مِثْــلُ ضَــرْبٍ     تَــرَى مِنْــهُ السَّــوَاعِدَ كَالْقُلِينَــا
لَنَــا الــدُّنْيَا وَمَــنْ أَمْسَــى عَلَيْهَــا     وَنَــبْطِشُ حِــينَ نَــبْطِشُ قَادِرِينَــا
إِذَا مَــا الْمَلْــكُ سَــامَ النَّــاسَ خَسْــفاً     أَبَيْنَــا أَنْ نُقِــرّ الْخَسْــفَ فِينَــا

دەڵێ: ئەزانی چۆن ژنان و نازپەروەران دەپارێزین؟، تەنها دەست و برد و باڵ و مەچەكی بەهێزدار و هەلوكی قایمی دەستی منداڵ كە چۆن بەكارە بۆ لێدانی هەلوك، دەستی ئێمە و سەری دوژمن دەبێ وابێ، ئەو زەمینە ماڵی ئێمەیە، خاكی ئێمەیە، هەركەس لەسەری بوو لەپەنای ئێمەدایە، ئازاد و سەربەستە، بەلام لە وەشاندن بەتوانا دەبین بۆ نەیار و دوژمن، ئەگەر شا بتوانێ سەرانە لەخەڵك وەربگرێ ئەوە ئێمە نین كە سەرانە و باج بدەین.

نُسَــمَّى ظَــالِمِينَ وَمَــا ظَلَمْنَــا     وَلَكِنَّــا سَــنَبْدَأُ ظَالِمِينَــا
إِذَا بَلَــغَ الْفِطَــامَ لَنَــا صَــبِيٌّ     تَخِرُّ لَــهُ الْجَبَــابِرُ سَــاجِدِينَا

دەڵێ: بە ئێمە دەڵێن: ستەمكار و تالانكار، نەخێر ئێمە ستەمكار نەبووین، بەلام ئەگەر ویسترا ستەممان لێ بكرێ، ئەرێ وەڵلا ستەم

دەكەین بەرامبەر ستەم، منداڵی ئێمە كە لەشیر بڕایەوە شا كڕنووشی بۆ دەبات، چونكە دەزانێ ستەم قەبوڵ ناكات.

مَلأْنَــا الْبَــرَّ حَتَــى ضَــاقَ عَنَّــا     وَظَهْــرَ الْبَحْــرِ نَمْلَــؤُهُ سَــفِينَا
أَلاَ لاَ يَجْهَلَــــنْ أَحَــــدٌ عَلَيْنَــــا     فَنَجْهَــلَ فَــوْقَ جَهْــلِ الْجَاهِلِينَــا

ئێمە پڕ بە زەوی و خاكین و لەو وشكانیی جێگەمان نابێتەوە و لەسەر پشتی دەریاش گەمی و كەشتی و بەلەممان هەیە، سەرداری بەڕوبەحرین، كەواتە با كەس نەفامیی لەگەڵمان نەكات، چونكە بە زیادەوە نەفام دەبین لەگەڵیان.

(ئــەوە خۆهەڵكێشــانی ئــەم شــاعیرە نەفامەیــە بــۆ هاوزمــان و هاونیشتمانی، بەڵام بۆ ڕۆم و عەجەم و جەندرمەو كۆیلەیەك، ئەمڕۆش وەك دوێنێیە!).

# حاریس کوڕی حیللەزە

**٤٣٠- ٥٨٠ زاینی**

چیرۆکی ئەم شاعیرە هاوتەریبە لەگەڵ شاعیری پێشوو عەمری کوڕی کولسوم و لەتەمەنیشدا لەو گەورەترە و کاتێ ئەم چامەی خوێندەوە لە دادگای عەمری کوڕی هنید، تەمەنی لە دەوروبەری سەدو بیست ساڵ بووە و دەنگی بەرز و بە تواناش بووە، لەگەڵ ئەوەی بیماری پێستی هەبووە، حەزی نەکردووە بەرگریی بکات لە هۆزی بەکر دژ بە هۆزی تەغلیب، کە عەمری کوڕی کولسوم نوێنەریان بووە، ئەرکی داردەستی سەرۆکی بەکرییەکان کە نوعمانی کوڕی هەرەم بوو، بەڵام ئەم کابرایە جلْف بووە، شێوەی وتاری ناو کۆڕی شاهانی نەبووە، عەمری کوڕی هیند دەریکرد و ئەوجا ئەم هاتە مەیدانەوە.

شای عەرەب لە دەواری هەشت ستوون حەوت پەردەی لە نێوان خۆی و کۆڕی ئەم دوو هۆزە دانابوو، ئەوجا کە حاریس لەبەرە و بە سەرپێی چامەکەی دەست پێ کرد، یەکەیەکە پەردە لادرا، چونکە زۆر سەرسام بوو بە گفت و بەڵگە و ڕستەی جوانی، ئەوەش ڕەوانبێژیی مێژوویی عەرەب دەکەین.

# قەسیدەی حاریسی یەشكوری

ئـەم قەسـیدەیە نزیكـەی هەشـتاو پێـنج بەیتـە، دڵـداری، پێداهەڵـدان، سـەناو شـانازیی، بـە جـوانیی ژینگـەی ئـەو ڕۆژەی عـەرەب دیـاری دەكـات لەسـەدەی شەشـەمی زاینیـی و شـەڕی نێـوان تـەغلیب و بـەكر و شـەڕی بەسووسدا.

ئـەم قەسـیدەیە جگـە لـە نرخـی مێـژوویی و وێـژەیی و وتاربێـژیی، سەرپێی و شێوازی بەرگریی لە هۆز و خێـڵ، جۆرێـك لـە خۆهەڵكێشان و بەخۆدا هەڵدانی بۆش دەردەكەوێ، بەڵام كەمتر لـە هاوتەمەنـەكانی، جگـە لە دەقە عەرەبییەكە، تەرجەمە كراوە بە لاتینیی و فەڕەنسیی و بە پێـی كێش و سـەرواى عـەروزى عـەرەبی لـە بـەحری خەفیفـە و بـەم شـێوەیە: پێدانی خوێندنی ئەسماو كۆچ كردنی لـە (١-٨)، وەسـفی وشـترەكەی لـە (٩-١٤)، بەرپەرچی هۆزی تـەغلیب دەداتـەوە لـە (١٥-٣٠)، بەرپەرچـی شـاعیری نەیار لە (٣١-٣٩)، وەسف و مەدحی پادشا عەمری كوڕی هیند لە (٤٠ ـ ٥٨)، ناكۆكی نێوان هۆزی تەغلیب و عەمری كوڕی هیند لە (٥٩-٨٥).

(ئەم قەسیدە هەرچی هـەبێ كەلـەپوری كـۆنی عەرەبـەو شـانازی پێـوە دەكەن دەبێ كورد ئاگاداری بێ).

# قەسیدەی هەڵواسراوی حاریسی یەشکەری

آذَنَتْنَــــا بِبَيْنِهَــــا أَسْـــمَاءُ   رُبَّ ثَــاوٍ يُمَــلُّ مِنْــهُ الثَّــواءُ

أذنت: ئاگاداری کردین، بین: دوورکەوتنەوە، أسماء: ناوی دۆستی شاعیر، ثاوٍ: نیشتەجێ، یملّ: بێتاقەت دەبێ، الثواء: مانەوە.

دەڵێ: ئەسماخان ئاگاداری کردین کە کۆچ ئەکات، تەنها لای ئەو جیابوونەوە ئازار و پەژارەیە، زۆر کەس لەمانەوە لەگەڵیدا بێتاقەتت دەکات، ناحەقی نییە، ئەوکاتە ئەو شۆخە کەس لەگەڵیدا بێ تاقەت نەدەبوو.

بَعْـدَ عَهْـدٍ لَهَـا بِبُرْقَـةِ شَـمَّاءَ   فَـأَدْنَى دِيَارِهَـا الخَلْصَـاءُ
فَالمُحَيَّـاةُ فَالصِّـفَاحُ فَـأَعْلَى   ذِي فِتَـاق فَعَـاذِبٌ فَالْوَفَـاءُ
فَرِيَـاضُ الْقَطَـا فَأَوْدِيَـةُ الشُّـرْ   بُـبِ فَالشُّـعْبَتَانِ فَـالأَبْلاَءُ

شمّا: ناوی بان و پێدەشتە، برقة: گردێکە بە قوڕ و لم دروستکراوە، الخلصاء: ئاوێکی دیارییە لە بیابان، محیّاة: ناوی زەوییەکە، الصفاح: ناوی چەند بانێکی دیارییە، فتاق: چیایەکی دیارە، عاذب: ناوی شیوێکە، وفاء: هەوارێکە، ریاض القطا: یا خێڵێکە بە زۆریی سوێسکە و قەتێی زۆرە، شُربب: شیوە، الأبلاء: بیرە نوێیەکی دیار.

دەڵێ: یادی بوونی خۆم دەکەمەوە لەگەڵ ئەسمادا، لەم شوێنە دیارانە، لە گردی بورقەی بەرز و بڵند و زۆر نزیك لە خەلساوە، ئەوجا لەسەر زەوی موحیات و بانە پڕ لە پووشەکەی سیفاح و لەپاڵ چیای فیتاقدا و لە هەوارگەی عازیب و وەفادا، ئەوجا لە نزیك باخی قەتێ زۆر و شیوەکانی شوربووب و شوعبەتان و ئەبلادا.

(ئەم کاوارایە لەم هەموو جێگەدا ژوانی لەگەڵ ئەسما هەبووە و ئێستە یادی ئەکاتەوە و هۆزی بەکر لەو شوێنانەدا هەواریان بووە و جێگە لەوەڕگای وشتر و مەڕ و بزنەکانیان بووە و ناوەکانی ئێستە یاد و یادەوەریی بەلەزەتە بۆ شاعیر، ئەوە وەك ڕەوەندی جاف لەگەڵیانە بۆ کوێستان و بەناو پێدەشتی شەمێران و بۆ شارەزوور ناوگردان و کوێستانەکانی هەورامان و شنروێ بۆ شاعیرێك وەك وەلی دێوانەیە).

لاَ أَرَى مَنْ عَهِدْتُ فِيهَا فَأَبْكِي الْـ ـيَمْمَ دَلْهاً، وَمَا يَرُدُّ الْبُكَاءُ؟

دەڵێ: لەو شوێنانەدا لەگەڵ ئەو شۆخە ژیاوم، گریانم دێ بۆ شوێنی ژوانەکانم و ئەوەش بێ هۆ و بە خۆڕایی نییە، بەڵام گریان و فرمێسك چی دەگێڕێتەوە بۆ من!؟.

وَبِعَيْنَيْكَ أَوْ قَدَتْ هِنْدٌ النَّارَ أَصِيلاً تُلْوِي بِهَا الْعَلْيَاءُ
أَوْقَدَتْهَا بَيْنَ الْعَقِيقِ فَشَخْصَيْـ ـنِ بِعُودٍ كَمَا يَلُوحُ الضِّيَاءُ

أوقدت: ئاگری کردەوە، اصیلا: ئێواران، عەسران، تلوی: بەرز ئەکاتەوە، العلیاء: شوێنی بەرز، العقیق: ناوی شوێنی دیار، شخصان: گەردەنەی نێوان و چیای بەرز، عود: چیلکەی بۆنخۆش وەك بوخورد.

دەڵێ: بەچاوی سەر دەمبینی کە خاتوو هیند ئێواران ئاگری کردەوە لە شوێنی بەرزی نەجد و حیجاز و ئەو ناوەی ڕووناك دەکردەوە، وەك داری بوخورد هەم بۆندار هەم ڕووناکی هەبوو لە نێوان عەقیق و گەردەنەی هەردوو شاخەکەدا، ئەو ناوەی ڕووناك دەکردەوە.

فَتَنَوَّرْتُ نَارَهَا مِنْ بَعِيدٍ     بِخَزَازٍ، هَيْهَاتَ مِنْكَ الصِّلاَءُ
غَيْرَ أَنِّي قَدْ أَسْتَعِينُ عَلَى الْهَمِّ     إِذَا خَفَّ بِالثَّوِيِّ النَّجَاءُ

تنورت: بە دیقەت تەماشای ئاگرەکەم دەکرد، خزاز: ناوی شوێنە، هیهات: زۆر دوورە، الصلاء: خۆ گەرمکردنەوە، همّ: خەفەت، خفّ: سووك بوو، الثوی: نیشتەجێ، النجاء: پەلەکردن لەڕێگەدا.

دەڵێ: زۆر بە وردیی لە ئاگرەکەم دەڕوانی بۆ ئەوەی دووریی و نزیکیی و کەمیی و زۆریی ئاگرەکەم بۆ شەو لە یاد بێ، هەر لە دەرەوە من لە خەزاز بووم و دوور بووم لە یارەکەم، چۆن ئەتوانم بەو ئاگرە خۆم گەرم بکەمەوە، بەڵام من بە خەفەتخواردن و یادکردنەوەوە لە دەرەوە دڵی خۆم دەدایەوە کە ئەتوانم بە پەلە بچم بۆ لای یاری نازدار و دڵخۆشیی خۆم دەدایەوە.

بِزَفُوفٍ كَأَنَّهَا هِقْلَةٌ     أُمُّ رِئَالٍ دَوِيَّةٌ سَقْفَاءُ
آنَسَتْ نَبْأَةً وَأَفْزَعَهَا الْقُنَّاصُ     عَصْراً وَقَدْ دَنَا الإِمْسَاءُ

زفوف: وشترێك تیژڕەو وەك نەعامە، هقلة: وشترنەعامە، رئال: جوجەڵەی نەعامە، دوية: دەشتی پان و بەرین، سقفاء: دەوروبەری بەرز،

واتە دەشتى بچووك نەك بيابان، آنست: هەستى كرد، نبأة: دەنگى سووكى ترسناك، أفزع: ترساندى، الأساء: شەو، القنا: ڕاوچى.

دەڵێ: بەروپشتى توندوتيژى وشترێك كە وەك نەعامە بێت و كۆمەڵێ جوجكەى بە دواوە بێ و هەستى كردبێ دەنگێكى نامۆيە، بەڵام سووك و ترسناك لە دەنگى ڕاوچيى دەشت بگوترێ بێچووە وشترمرە، كاتێ زەردەخۆر دەپەڕێ و شەو تاريك دەبێ، بەم وشترە دەچێ بۆلاى ئەسماخان.

فَتَرَى خَلْفَهَا مِنَ الرَّجْعِ وَالْوَقْـ ـعِ مَنِيناً كَأَنَّهُ أَهْبَاءُ
وَطِرَاقاً مِنْ خَلْفِهِنّ طِرَاقَ سَاقِطَاتٌ تُلْوِي بِهَا الصَّحْرَاءُ

الرجع: خرمەى پێى جوجكەكان لە هەلگرتن، الوقع: دانان، منين: تۆزێكى ناسك، الأهباء: گەرديلەى ورد كە خۆر لە كلاوڕۆژنەوە دەدات لە ژوورى خانووى لادێ دەردەكەوێ، طراق: تەقە و دەنگى سمى وشترە لە زەوى دەدات، تلوى: دەبڕێ و ڕێ ئەكات.

دەڵێ: ئەو بێچووە نەعامە سووك و سۆلانە لە دواى دايكيانەوە و لە ترسى ڕاوچى و بۆ ئەوەى لە دايكيان دوانەكەون خرمەى پێيان دێت لە هەلگرتن و دانانى هەردوو قاچياندا و لە ئەنجامى ئەو ڕۆيشتنە لەو دەشتە بەرز و نزمە تۆز و غوبارێك بەرز ئەبێتەوە ئەڵێى گەرديلەى ناو ماڵە، خرمە و تەقەى چوارپێى ئەم وشترەى من لەو ديمەنە دەكات.

(وێنەيەكى ناسك و وردە، مەگەر لە شێوەى مشك و پشيلەى فيلمى كارتۆنى ئەمرۆ دەربكەوێ).

أَتَلَهَّـــى بِهَـــا الْهَـــوَاجِرَ إِذْ كُـــ ـــــلّث ابْـــنِ هَـــمّ بِلَيَّـــةٌ عِمْيَـــاءُ

أتلهّى: ڕائەبوێرم، الهواجر: گەرمای نیوەڕۆ، ابن همّ: خەفەتبار، بلية: ئەو وشترەیە کە خاوەنەکەی مرد لەسەری گۆڕەکەی دەیبەسنەوە، بێ ئاڵف و ئاو هەتا ئەویش دەمرێ، بۆ ئەوەی دوای زیندووبوونەوە ئامادە بێت بۆ سەفەری حەشری ئەو دنیا، عمیاء: کوێرە.

دەڵێ: ئەم وشترەم زۆر باش و بە وەفایە و لەگەرمای نیوەڕۆدا خۆمی پێ ئەپارێزم، چونکە هەرکەس کە مرد دەبێ وشترە تایبەتەکەی لەسەر گۆڕەکەی دانرێ، ئەم وشترە لە ژیان و مردن لەگەڵ مندایە.

وَأَتَانَـــا عَـــنِ الأَرَاقِـــمِ انْبَـــاءٌ وَخَطْـــبٌ نُعْنَـــى بِـــهِ وَنُسَـــاءُ

أَنّ إِخْوَانَنَـــا الأَرَاقِـــمَ يَغْلُـــونَ عَلَيْنَـــا، فِـــي قِـــيلِهِمْ إِحْفَـــاءُ

دەڵێ: هەواڵمان بۆ هاتووە کوڕانی خێڵی ئوم ئەراقیم کە تەغلیبین نیازی ئەوان جێگە سەرنج و تێبینی ئێمەیە و بەلامانەوە مەبەستە گرنگی پێ بدەن، ئەو برایانەی کوڕانی ئەراقیم زیادەڕۆیی و توندڕەویی بە سەرمانەوە دەکەن و لە وتار و هەڕەشەیاندا ڕق و کینەی تێدایە و ئێمە تاوانبار دەکەن بە کارێ کە نەمانکردووە، کاتی خۆی ئەم مەلیکە نەفامەی عەرەب عەمری کوڕی حەنیف سەد گەنج لە تەغلیب و سەد گەنج لە بەکر لای خۆی دادەنێ و لەگەردەلولێکی بیاباندا هەموو گەنجە تەغلیبەکان مردن و بەکرییەکان مانەوە، ئەوجا تەغلیب داوای خوێنیان دەکرد و بەکریش ئینکارییان دەکرد، ئەوجا ئەم شاعیرە لە دادگای پادشادا بەرگری لە هۆزی خۆی دەکات کە بێ تاوان و بێ گوناهن.

يَخْلِطُـونَ الْبَـرِيءَ مِنَّـا بِـذِي الذَّنْـ ـــــب وَلاَ يَنْفَعُـــالْخَلِيُّ الْخَـــلاَءُ

يخلطون: تێكەڵ و پێكەڵ دەكەن، الخلی: بێوەیی، بێ گوناح، الخلاء: بێتاوان.

دەڵێ: ئەم برایانە ئیش تێكەڵاو دەكەن، جیاوازیی ناكەن لە نێوان تاوانبار و بێتاواندا.

(ئەوە داب و نەریتی چاخی نەفامییە، بەڵام هەتا ئەمڕۆ ئەم خووە لەناو برا چاوڕەشمارەكانماندا هەر ماوە).

زَعَمُـوا أَنَّ كُـلَّ مَـنْ ضَـرَبَ الْعَـ ـــيْرَ مَـوَالٍ لَنَـا ًأَنَّـا الْـوَلاَءُ

زعموا: گومان دەبەن، ضرب: لێیدا، العیر: گەڵێ مانای هەیە و لێرەدا هەموو جێگەی كراوەتەوە، بە مانای گەورە، كە ماناكەی بەم شێوەیەیە: كوڕانی ئەراقیم دەڵێن هەركەس ڕازی بووە بە لێدانی كولەیب كە گەورەی ئەوان بووە، دەبێ ئێمە باجەكەی بدەین، یان بە مانای كەر كە ماناكەی هەركەس ڕاوی كەری كێوی بكات دەبێ ئێمە تاوانەكەی هەڵگرین، یان بە مانای مێخ كە هەركەس مێخی داكوتا بۆ دەوار دەبێ ئێمە خوێنی تاوانی بۆ بدەین، یان بە مانای پووش و گەرد، كە مانای ئەوەیە هەركەس فووی كرد لە پووشی ناو ئاو، ئەوە لە ئێمەیە، ئێمە تاوانبارین، یان ڕەووەشتر، بە واتەی هەركەس وشتری لێخوڕی و خوسیدا و لێیدا، ئەوە دۆستی ئێمەیە و دەبێ باج بدات.

(ئەوە كێشەی زمانی عەرەبییە، كە چی بۆ كورد ئەگەر لە هەورامان و لە بابان و لە سۆران و لە بادینان و لە بارزان مانایەك بە چەند وشەیەك

بەكاربێت یان یەك وشە بۆ چەند مانایەك بەكار بێت، دەڵێن بابە ئەوە زمانێكی جیاوازە و دەبێ ئەلفبێی خۆی هەبێ).

أَجْمَعُــوا أَمْــرَهُمْ بِلَيْــلٍ فَلَمَّــا أَصْــبَحُوا أَصْــبَحَتْ لَهُــمْ ضَوْضَــاءُ

دەڵێ: ئەم هۆزە كۆدەنگن، بەڵام كە ڕۆژ بووەوە جگە لە قرەقرِ و دەنگەدەنگ هیچ كارێك ناكەن و گەورەیان نییە و بێسەروبەرن.

مِــنْ مُنَــادٍ وَمِــنْ مُجِيــبٍ وَمِــنْ تَصْــ ــهَالِ خَيْــلٍ، خِــلاَلَ ذَاكَ رُغَــاءُ

ئەوەی درێژەی بێ سەروبەری ئەو هۆزە دەكات و دەڵێ: هەندێ بانگ دەكات، هەندێ وەڵام دەداتەوە، كابرایەك دەڵێ: هۆ فلان لە كوێیت؟ ئەویتر دەڵێ: ئەوەتام لێرە، لە نێوان ئەم پرس و وەڵام و گفتو گۆیەدا ئەسپ ئەحیلێنێ وشتر ئەبۆڕێنێ، دەنگی ئەمانیش ئەوەندەی تر ئاژاوە و ژاوەژاوی درووستكردووە.

أَيُّهَــا النَّــاطِقُ الْمُــرَقِّشُ عَنَّــا عِنْــدَ عَمْــرٍو، وَهَــلْ لِــذَاكَ بقَــاءُ؟

النـاطق: قسەكەرێك بە ناوی هۆزەوە، المرقش: ماستاوچی هەریج وموهەرِیج.

دەڵێ: ڕوو لە عەمری كوڕی كولسوم دەكات كە شاعیری ئەولایە و قسەی چەور و شیرین ئەكات و فشە ئەكات و خۆی هەڵئەكێشێ، كاورای قسەزل و هیچ لەباردا نەبوو، ڕاستی دەشێوێنێ لە لای پادشا، عەمری كوڕی هیند خراپەی ئێمە دووبارە دەكەیتەوە، ئەو قسانە ڕەواجی نییە و نامێنێتەوە و بە كەڵكی مەجلیس نایەت.

لاَ تَخَلْنَــا عَلَــى غَرَاتِــكَ، إِنَّــا قَبْــلُ مَــا قَــد، وَشَــى بِنَــا الأَعْــدَاءُ

تخلنا: گومان بردن، غراة: هەڵنان و تیژكردن، وشی: دووزمانیكردن.

دەڵێ: هۆ كابرای هەرزەگۆ، وانەزانی ئێمە ئاگاداری درۆی تۆ نین و تۆ ئەتەوێ لە خزمەتی خاوەنشكۆ لەكەدارمان بكەیت، پێش تۆ زۆر لە دوژمنانی ئێمە هەوڵیانداوە خراپەمان بڵێن، بەڵام سەركەوتوو نەبوون و تۆش نائومێد دەبی لەم كارە خراپەت.

فَبَقِينَــا عَلَــى الشَّــنَاءَةِ تَنْمِيــ ـــنَا جُــدُودٌ وَعِــزَّةٌ قَعْسَــاءُ
قَبْـلَ مَـا الْيَـوْمِ بَيَّضَـتْ بعُيُـونِ الـ ـــنَّاسِ فِيهَــا تَعَــيُّطٌ وَإِبَــاءُ
وَكَــأَنَّ الْمَنُــونَ تَــرْدِي بِنَــا أَرْ عَــنَ جَوْنــاً يَنْجَـابُ عَنْــهُ الْعَمَـاءُ

الشناء: ڕق و كینە، جدود: بەخت و تالع، عزة: بەرزی، قعساء: هەمیشە و جێگیر، بیّضت: چاوی كوێربوو بە ئاوی سپی، تعیط: سەركەوتن و بەرزیی، المنون: مەرگ، تردی: فڕێ دەدات، أرعن: چیای لوتكە بەرز، ینجاب: پەرت دەبێ.

دەڵێ: لە خودا بە زیادبێ لەگەڵ ئەو هەموو كینە و ڕقئەستوورە كەچی ئێمە ڕۆژ بەڕۆژ زیاد دەكەین و بەرز دەبینەوە و سەركەوتنی نەگۆڕ و جێگیرمان لە بەخت و بەشمانە، ئەوەش چاوی دوژمنانی سپی كردووەتەوە و كوێری كردووە و ئێمە بە سەربەرزیی و سەرومریی ماوینەتەوە بە كوێرایی چاویان، ئەو هێز و توانای ئێمە وایكردووە لە خەڵك كە مەرگ دابارێنن بەسەرماندا، بەڵام ئێمە وەك چیایەكی سەربەرز و مانای هەزار بە هەزار واین كە هەور ناتوانێ زیانی پێ

بگەیـەنێ، ئێمـە شـاخ و چـیای بـەرزین، گـەڕە هـەوری بـەتاڵ نـاتوانێ بمانکوژێ، ئێمە بەم جۆرە دوژمنانە لەناو ناچین و زیان تـەنها بـەخۆیان دەگات و بەو ڕق و کینەوە سەردەنێنەوە.

مُكْفَهِـرّاً عَلَـى الْحَـوَادثِ مَـا تَـرْ ‌ ‌ ‌ تُـوهُ لِلـدَّهْرِ مُؤْيِـدٌ صَـمَّاءُ
أَيَّمَـا خُطَّـةٍ أَرَدْتُـمْ فَـأَدُّوا ‌ ‌ ‌ هَـا إِلَيْنَـا تَمْشِـي بِهَـا الأَمْـلاَءُ

مكفهر: ئەستوور و چین لەسـەر چین، ترتـوە: کـەمکردن و لاوازبـوون، یـان مانـای بـەهێزکردن و توانـای بەخشـین، خطـة: سـابات، کـەپری کۆبوونەوە، الأملاء: کۆمەڵ کۆمەڵ.

دەڵـێ: ئێمـە ئـەو چـیا بـەرزەین کـە هـەور پێـی نـاوێرێ و خـۆڕاگرە بەرامبەر هەموو ڕوداوێك، هیچی لێ کەم نابێت و زەمانە کاری تـێ ناکات، وەك هەندێ گردۆڵکەی بچووك وەك دوژمنەکانمان، ئەو چیایە وەك ئێمـە کارەسـاتی زۆر سـەخت پارچـەیەکی بچـووکی لێ کەمناکاتـەوە کـە وەك کارەسات کەڕولاڵ بێ.

ئەوجا دەڵێ: هەرچی کەپر و پیلان هەیە بە نوێنەرتاندا بۆمان بنێرن و ئەوانەی کەوتوونەتە نێوان ئێمـە و ئێـوە شـایەت بـن کـە ئێـوە هەرچـی بڕوبیانوویەك یان پیلان هەیـە بـەکاری بێـنن، ئێمـە بـێ منـەتین لـەپاکی خۆمان و بێ گومانین، بەڵام ئەوانـەش کـە ناوبـژیی دەکـەن دەزانـن ئێـوە پیلانـگێڕن و بەس.

إِنْ نَبَشْـتُمْ مَـا بَـيْنَ مِلْحَـةَ فَالصَّـا ‌ ‌ ‌ قِـبِ فِيـهِ الأَمْـوَاتُ وَالأَحْيَـاءُ
أَوْ نَقَشْـتُمْ فَـالنَّقْشُ يَجْشَـمُهُ النَّـا ‌ ‌ ‌ سُ، وفِيـهِ الصَّـحَاحُ وَالإِبْـرَاءُ

نبشتم: هەڵدەنەوە، ملحة: ناوی شوێنە، الصاقب: چیایە، نقشتم: بەدوایدا بچن و لێی بکۆڵنەوە، یجشمە: خەڵك خۆی پێوە ماندوو دەکات، الصحاح: چاك و بە کەڵك، الابراء: لە کۆڵکردنەوە و خۆشبوونەوە.

دەڵێ: ئەگەر ئێوە دەتانەوێ گۆڕی کوژراوی نێوان میلح و ساقیب هەڵدەنەوە و دووبارە ئەو زامە بەسوێ بێتەوە، ئەوە خۆتان زیانبار دەبن، چونکە لەو شوێنە دوو جۆرە کوژراوی لێیە، تێیدایە تۆڵەی بۆ کراوەتەوە و خوێنی بە ناحەق ڕژاوی وەرگیراوەتەوە و زیندووە، ئەوە کوژراوی ئێمەی تێدایە کەسی نەبووە تۆڵەی بکاتەوە، ئەوە مردووی ئێومیە، یان ئەگەر نیازتان هەیە دووبارە توێژین و کۆڵینەوە بکرێت لەو ڕوداوانە، ئەوە خەڵك زۆری پێوە ماندوو دەبێ و ئەوکاتەش ڕاستی و دروستیی و ئەستۆپاکیی ئێمە و ناپاکیی و خراپیی ئێوە بەدەر دەکەوێ.

أَوْ سَكَتُّمْ عَنَّا فَكُنَّا كَمَنْ أَغْـ ـمَضَ عَيْناً فِي جَفْنِهَا أَقْذَاءُ
أَوْ مَنَعْتُمْ مَا تُسْأَلُونَ، فَمَنْ حُدِّ ثْتُمُوهُ لَهُ عَلَيْنَا العَلاَءُ؟

سكتم: بێ دەنگبوون، أغمض: چاوی قوچاندبێ و لەسەریەکی دانابێ، جفن: پێڵوی چاو، أقذاء: پووش و قەلاسی گەنم، العلاء: بەرزیی.

دەڵێ: خۆ ئەگەر بێدەنگ بن و خۆتان گێل بکەن لە ئاست ئەو ڕابووردووەی ئێمەو ئێوە، ئەوە ئێمە زیاتر زیانمان لێدەکەوێ، وەك ئەو کەسەی پووشی لەناو چووە و بۆی دەرنەهاتووەتەوە و چاوی نوقاندووە لەئاستیدا، خۆ ئەگەر ئەوەی لەسەرتانە ئەنجامی نەدەن، خۆتان باش دەزانن و بۆتان باسکراوە بەرزیی لای ئێمەیە و هەمیشە سەرکەوتن و زاڵبوون بەشی ئێمە بووە و ئێوەش..!!.

هَلْ عَلِمْتُمْ أَيَّامَ يُنْتَهَبُ النَّاسُ غِوَاراً، لِكُلِّ حَيٍّ عُوَاءُ؟

ينتهب: تالآن دەكرا، غوار: چەپاو و داپلۆسين، عواء: قرە قرِ و ئاژاوە و دەنگەدەنگ.

ئەوە باسێكی مێژوویی نیوە دوورگەی عەرەب و نەجد و حیجاز و یەمەن و ناوچەی كەنداو باس دەكات و دەڵێ: دەزانن كە كیسرای شای ئێران شكستی هێناو لاواز بوو و دەسەڵاتی بیانی لەسەرتان نەما، چۆن بەربوونە گیانی یەكتر و دەستتان دایە تالآن و چەپاوی یەكتر، ئەوكاتە عەرەب دوو بەش بوون، نزارییەكان لەسەر فارس بوون و هەركەسی بكردایە بە كوێخا فەرمانڕەوایی دەكرد و غەسانییەكان شاكانی ڕۆمی مەسیحی حوكمی دەكردن و ئەویش لەبەر فراوانی ناوچەی ژێر دەسەڵاتی پێدا ڕانەدەگەیشت كە دەسەڵاتێكی شاریی و ژیاریی لەناو ئێوەدا پیادە بكات و هەر هۆزێك بۆ خۆی و گەورە بچووكی دەخوارد و زۆردار بێ زۆری تالآن دەكرد، ئا لەوكاتەدا ئێمە و ئێوە بەراورد بكەن.

إِذْ رَفَعْنَا الْجِمَالَ مِنْ سَعَفِ الْبَحْـ ـرَيْنِ سَيْراً حَتَّى نَهَاهَا الْحِسَاءُ
ثُمَّ مِلْنَا إِلَى تَمِيمٍ فَأَحْرَمْـ ـنَا، وَفِينَا بَنَاتُ مُرٍّ إِمَاءُ

الجمال: وشترەكان، سعف: پەلكی دارخورما، بحرين: ناوی ناوچەیەكە لە كەنداو، نهانا: كۆتا ڕێگە، الحساء: لی نزیكی ئاو، ملنا: دامان بەسەریاندا، بنات مرّ: كیژی گەردن مەڕمەڕ، إماء: كۆیلە، كەنیزەك و كارەكەری ناومالّ.

دەڵێ: ئەوێ ڕۆژێ کە وشترەکانمان بەرزکردەوە بەرەو کەنداو هەتا گەیشتینە پەلکە دارخورماکانی ولاتی بەحرەین و زۆریش بەپەلە سەفەرمان دەکرد هەتا لێواری لی تەڕی نزیك ئاو و هەرچی بەردەستمان کەوت هەموویانمان هەڵپاچ و داپاچکرد و لاماندایە سەر هۆزی تەمیم و مانگی (حەرام) هات و دەستمان لە تالانی هەلگرت و کیژانی گەردنبلووری وەك مەڕمەڕ سافمان لە لابوو کە کۆیلە و کەنیزەك بوون.

(ئەوە بەشێکە لەمێژووی پڕ لە شانازیی نەفامیی).

لاَ يُقِيـمُ الْعَزِيـزُ بِالْبَلَـدِ السَّهْـ ـلِ، وَلاَ يَنْفَـعُ الـذَّلِيلَ النَّجَـاءُ
لَـيْسَ يُنْجِـي مُـوَائِلاً مِـنْ حِـذَارٍ رَأْسُ طَـوْدٍ وَحَـرَّةٌ رَجْـلاَءُ

دەڵێ: پیاوی بەرز و ئازاو بە غیرەت هەرگیز لە شوێنێ دانانیشێ، لەناوچەیەکی سووکی بێ پەرژین، چونکە هەمیشە ترسی تالانیی و چەپاویی هەیە، بە هەمان شێوە بۆ پیاوی ترسنۆك و سەرشۆڕ هەرگیز ڕەوکردن و کۆچکردن و بارکردن سوودی نییە، چونکە ئەگەر لە شوێنی خۆی نەتوانێ بەرگریی بکات لەشوێنی دیکە زیاتر ناتوانێ، ئەوەی هەمیشە بۆ شوێنی پەنا گری و حەزی لە کزیی بێ، لەسەر چیاش بێ سوودی نییە بۆی و بەردی ڕەق و سەرشکێن و ڕەش و خۆش سوودی نییە بۆ ترسنۆك.

فَمَلَكْنَـا بِـذَلِكَ النَّـاس حَتَّـى مَلَـكَ الْمُنْـذِرُ بْـنُ مَـاءِ السَّـمَاءِ
وَهُـوَ الـرَّبُّ وَالشَّـهِيدُ عَلَـى يَـوْ مِ الْحِيَـارَيْنِ وَالْـبَلاَءُ بَـلاَءُ
مَلِـكٌ أَضْـلَعُ الْبَرِيـةِ، مَـا يُـو جَـدُ فِيهَـا لِمَـا لَدَيْـهِ كِفَـاءُ

الـرب: خـاوەن، میللـەت پـەروەر، الشـهید: وشـیار، زینـدوو، ئامـادە، الحیارین: ناوی شوێنی دیار، بلاء: بەڵاو كارەسات، أضلع: بە توانا و پشت و پەراسوو قایم بۆ باری قورس، كفاء: هاوتا.

دەڵێ: ئێمەبووین كە فەرمانڕەوا و خونكاری خەڵك بووین هەتا پادشا مونزیری كوڕی مَاءِ السَّمَاءِ شا بوو، ئەو پادشایە شان و پشتی وابوو بەر فەرمان و بەخشین و چاكە بوو، هەموو خەڵك پشت و پەنای بوو، كەس نەبوو هاوتا و هاوشانی بكات و لە ناوچەی حەبارین كە كوڕانی یەشكەری لەگەڵ بوو، ئازایەتیی و نەبەردیی ئێمەی بۆ دەركەوت، لەبەر ئەوە سەربەرزیی ئێمە بەشێكە لەو سەربەرزییە.

فَـاتْرُكُوا الطَّـيْخَ والتَّعَـدِّي، وَإِمَّـا  تَتَعَاشَـوْا فَفِـي التَّعَاشِـي الـدَّاءُ
وَاذْكُـرُوا حِلْـفَ ذِي الْمَجَـازِ وَمَـا  قُـدِّمَ فِيـهِ الْعُهُـودُ وَالْكَفَـلاَءُ
حَـذَرَ الْجَـوْرِ وَالتَّعَـدِّي، وَلَـنْ يَنْـ  ـقُضَ مَـا فِـي الْمَهَـارِقِ الأهْـوَاءُ

الطـيخ: قسـەی قـۆڕ و بێمانـا و فشـەی بـۆش و بـێ نـاوەرۆك، التعـدی: دەسـتدرێژیی، تتعاشـوا: خـۆگێلكردن و چـاونوقاندن و خـۆ نـەفامكردن، الداء: دەردوبیماریی و خراپە، ذوالمجاز: ناوی شوێنێكە كە عەمری كوڕی، ئاشـتی دروسـتكرد لـە نێـوان هـۆزی بـەكر و هـۆزی تـەغلیب و لـە هـەر دوولایەكی هەشتا گەنجی بـە بارمتـە لای خـۆی گلدایـەوە، ئەگـەر ئاژاوەی هـەر لایـەك دەركـەوت ئـەو هەشـتا لاوە سـەردەبڕێ، الجـور: سـتەم و زۆرداریی، المهارق: قسەواڵەو بەڵێن و بەڵگەنامە.

دەڵێ: ئەوە بـۆ ئامۆژگـاریی و پـەیڕەوكاری چـاك پێیـان دەڵێن: واز لـە قسەی قۆڕ و فشەی بەتاڵ و بۆش بێنن و پـەلامار و دەسـتدرێژیی مەكـەن

بۆ خۆتـان خراپـه، ئەگـەر خۆتـان گەمـزە و گێـل بكـەن ئـەوە نـەفامیی و بیماریی و نەخۆشیی ئێوەیە، لەبیرتانە ڕێكەوتنی (ذی المجاز) كە مـەلیك عـەمر ئێمـە و ئێـوەی ئاشـتكردەوە و بـەڵێن و پـەیمانی لـە هـەردوولا وەرگـرت؟، لەبـەر ئـەوە كـەس ستەم نـەكات و لـەناو تۆمـار و قەواڵـەی سوڵحەكەدا هەموو شت ڕونكراوەتەوە، كارێ مەكەن ئێمـە عـەیب و عـار و شـورەیی ئێـوە بـدەین بـەدارا و ئابڕووتـان بچێت، چـونكە پەیمانشـكێنی بوون.

وَاعْلَمُـــوا أَنَّنَـــا وَإِيَّـــاكُمْ فِيـــ ـــمَا اشْـتَرَطْنَا يَـوْمَ احْتَلَفْنَـا سَـوَاءُ
أَعَلَيْنَـــا جُنَـــاحُ كِنْـــدَةَ أَنْ يَغْـــ ـــنَمَ غَـــازِيهِمُ وَمِنَّـــا الْجَـــزَاءُ؟

دەڵێ: بـاش بـزانن ئێـوە و ئێمـە لـە شـەرت و مەرجـدا هاوبـەڵێنین، هەركەس بەڵێنشكێن بـێ تـاوانی هەیـە، ئێمـە گوناهمـان چییە كـە هـۆزی كیندە ئێوەی تالانكردووە و چـەپاوی كـردوون، بۆچـی ئێمـە بـاجی كینـدە بدەین؟، ئێمە قەرزی خەڵك نابژێرین!.

أَمْ عَلَيْنَـــا جَـــرَّى حَنِيفَـــةَ أَوْ مَـــا جَمَعَـــتْ مِـــنْ مُحَـــارِبٍ غَبْـــرَاءُ؟
أَمْ جَنَايَـا بَنِـي عَتِيـقٍ، فَمَـــنْ، يَغْـــ ـــدِرْ فَإِنَّـــا مِـــنْ حَـــرْبِهِمْ بُـــرَآءُ؟
أَمْ عَلَيْنَـــاجَرَّى الْعِبَـــادِ كَمَـــا نيـــ ـــطَ بِجَـــوْزِ الْمُحَمَّـــلِ الأَعْبَـــاءُ؟

جرى: كەتن، تاوان، غبراء: لات و لووت و هـەژار و نانەسكیی، جنايـات: كۆی تاوانەكان، يغدر: نهێنگری بكات، براء: بێ تـاوان و پـاك و بـێ گونـاح، نيط: لكاوە، پێوە نووساوە، جوز: سەرباری وشتر، المحمّل: وشتری بارهەڵگر، الأعباء: باری قورس.

دەڵێ: ئێوە چیتان لە ئێمە دەوێ، تاوانی هۆزی حەنیفە لە ئێمە وەردەگرنەوە، خراپەی لات و لووتەكانی خێڵی موحاریب ئێمە بیبژێرین، كەتنەكانی هۆزی عەین لەسەر ئێمە نییە.

ئێمە گەردنپاكین لەو تاوانانە، خراپەی فێڵی عوباد لەسەر ئێمە نییە، ئەگەر ئەم تاوان و كەتنە گەورانەی بەسەر ئێوەدا هاتووە لەسەر ئێمە حساب بكەن، وەك سەربارێكی قورس لەسەر پشتی وشترێكی بارهەڵگر دایبنێن وایە.

كورتەی ئەم چیرۆكە ئەوەیە:

ئەوكاتەی (منذری كوری ماءالسماء) هێرشی كردە سەر غەسانییەكان شمری كوڕی عەمری حەنەفی پەنای برد بۆ حارسی كوڕی جەبەلە ئەویش سەد كوڕی ئازای خستە ژێر فەرماندەی شمر و ناردی بۆلای مونزیر و وتی: بڵێ بە مونزیر ئێمە ئامادەین لەژێر فەرمانی تر بین، ئەگەر هەلت بۆ هەڵكەوت بیكوژە و خۆت دەرباز بكە، شمر بە هەمان پیلان هەستا و بەم سەد لات و لووت و هێزی ڕاوڕووت و تاڵانچییەوە مونزیری كوشت و گەڕایەوە، خوێنی تەغلیبی بڵاوبوویەوە لەناو هۆزی حەنیفە، موحاریب، عوباد، عەتیق، كە هەریەكەیان بە جۆرێك دەستیان هەبووە لە كوشتنی تەغلیبییەكاندا، كەواتە هۆزی بەكر بێ تاوانن، جگە لەو هۆزانەی كە لەدواوە باسیان دەكات.

أَمْ عَلَيْنَا جَرَّى قُضَاعَةَ أَمْ لَيْـ ـسَ عَلَيْنَا فِيمَا جَنَوْا أَنْدَاءُ؟
أَمْ عَلَيْنَا جَرَّى إِيَادٍ كَمَا قِيـ ـلَ لِطَسْمٍ أَخُوكُمُ الأَبَّاءُ؟

دەڵێ: دەبێ شەرم بکەن خێڵی تەغلیب خراپە و تاوانی قوزاعە لەسەر ئێمە حیساب دەکەن؟، بۆچی ئەوەی هۆزی ئەیاد بەسەری ئێوەی هێناوە لە ئێمەی داوا دەکەن، ئەزانن قەسم چی بەئێوە کرد و پاش ئەوەی تالانی پیاوەکانی کیسرای کرد و ژنی نەوشیروانیان ڕووتکردەوە و شوێنی ئەم هۆزە لەنێوان حیرەو ئەبلەدایە و کۆشکی خەومر نەق و سەدیر و بارق جێگەی ئەم خێڵەی نزار بوو کە ئێوەی تەغلیبی تەمێ کردبوو.

لَـيْسَ مِنَّـا الْمُضَـرَّبُونَ، وَلاَ قَيْـــ ـــسٌ، وَلاَ جَنْـدَلٌ، وَلاَ الْحَـدَّاءُ
عَنَنـاً بَـاطِلا وَظُلْمـاً كَمَـا تُعْـــ ـــتَرُ عَـنْ حَجْـرَةِ الـرَّبِيضِ الظِّبَـاءُ
وَثَمَـانُونَ مِـنْ تَمِـيمٍ بِأَيْديـــ ـــهِمْ رِمَـاحٌ صُـدُورُهُنَّ الْقَضَـاءُ

المضرّبون: ئەوانەی لێدران، قەیس، جندل، الحداء: ناوی باڵ و ڕان و بەشێکن لە هۆزی تەغلیب، عننا: بە ملهوڕیی، تعتر: سەردەبڕێ، حجرة: پەچەی حەیوان، الربیض: ڕانی مەڕ، الظباء: ئاسك، القضاء: مەرگ.

دەڵێ: ئەوانەی بە دیلگیراوە و ملیانپەڕاندن خۆ لە ئێمە نەبوون و قەیس و جەندەل و حەداء لەئێمە نەبوون، بۆچی بە ناحەق و بە ستەم تۆڵەی ئەوانە لە ئێمە داوا دەکەن، ئەوە وەك ئەو کابرایە وایە نەزری کردبوو ئەگەر سەد سەر مەڕم هەبوو، بۆ هەر دە سەرێ مەڕێ ئەکەم بە قوربانیی و قۆچ کە نەزرەکە هاتە دی دەچوو ڕاوی ئاسکی دەکرد و لەباتی و بریتی مەڕەکە دەیویست، ئەوجا دەڵێ: خۆ ئەو هەشتا نەفەرە کە ئێومیان کوشت و تالانکرد لە تەمیم بوون و مەرگیان بەسەرتاندا باران.

لَــمْ يُخَلُّــوا بَنِــي رِزَاحٍ بِبَرْقَــاءِ  نَطَــاعٍ لَهُــمْ عَلَــيْهِمْ دُعَــاءُ
تَرَكُــوهُمْ مُلَحَّــبِينَ، وَآبُــوا  بِنِهَــابٍ يَصَــمُّ مِنْــهُ الْحُــدَاءُ
ثُــمَّ جَــاءُوا يَسْــتَرْجِعُونَ، فَلَــمْ تَــرْ  جِــعْ لَهُــمْ شَــامَةٌ، وَلاَ زَهْــرَاءُ

دەڵێ: بابەگیان ئەو خێڵانە ستەمیان کردووە بەڕادەیەك کوڕانی ڕیزاح لە ناوچەی بەرقای نەتاع تەنها ئەوەیان بۆ مابووەوە کە دووعای شەڕیان لێ بکەن، کە پیاوەکانیان بە شمشێر پارچە پارچە کردبوو، ئەوەندە تالانی مالاتیان هێنابوو گوێی بەنی ئادەمی کەڕ دەبوو و لەبەر زۆری دەنگی وشتری تالانیی و مەڕ و بزن گوێت لە گۆرانی وشترەوان نەدەبوو، ئەوجا ئەو خێڵەی ئێوە ویستیان تالانییەکە بگێڕنەوە، بەلام توانایان کورت بوو کە نە حەیوانی ڕەش و نە حەیوانی سپییان بۆ نەگێڕدرایەوە، ئیتر بۆ خۆتان هەڵئەکێشن بەسەر خەڵکدا.

ثُــمَّ فَــاءُوا مِــنْهُمْ بِقَاصِــمَةِ الظَّهْــ  ــرِ، وَلاَ يَبْــرُدُ الْغَلِيــلَ الْمَــاءُ
ثُــمَّ خَيْــلٌ مِــنْ بَعْــدِ ذَاكَ مَــعَ  الْغَــلاَّق، لاَ رَأْفَــةٌ، وَلاَ إِبْقَــاءُ
مَــا أَصَــابُوا مِــنْ تَغْلِبِــيّ فَمَطْلُــولٌ،  عَلَيْــهِ إِذَا تَــوَلَّى الْعَفَــاءُ

فاءوا: گەڕانەوە، قاصمة: پشتشکێن و کەمەربڕ، رأفة: بەزەیی، إبقاء: مانەوە، مظلول: خوێنی حەلاڵ و بەلاش، العفاء: ڕزین و پوترکان.

دەڵێ: چیتان پێ بڵێم خێڵی تەغلیب، کوڕانی ڕازح کە دایان بەسەرتانا، پشتیان شکاندن و بەزەیی و ڕەحمیان پێ نەکردن و هیچیان بۆ بەجێ نەهێشتن، چونکە ئەوەی لە خێڵی تەغلیب کوژراوە خوێنی نییە، بە

هەدمرە و كەس نییە حەقی بۆ وەرگرێ، هەر گەڕانەوە مافەكەیان دەڕژێ و دەپوكێتەوە.

ئەم شاعیرە زۆر شارەزابووە لە ژیانی شەڕی ناوخۆی ئەم دوو خێڵەی بەكر و تەغلیبدا.

كَتَكَـــالِيفِ قَوْمِنَـــا إذء غَـــزَا الْمُنْـــ ـــذِرُ، هَلء نَحْنُ لإبْنِ هِنْـدٍ رِعَـاءُ؟
إِذْ أَحَـــلَّ الْعَـــلاَةَ قُبَّـــةَ مَيْسُـــونَ فَـــأَدْنَى دِيَارِهَـــا الْعَوْصَـــاء

تكاليف: ئەرك و پێداویستیی، رعاء: شوان و گاوان.

دەڵێ: ئەوە ئەرك و پێداویستیی خێڵی ئێمەیە ئەوكاتەی مونزیری كوڕی ماءالسماء دای بەسەرتاندا و ئێوە وتتان ئێمە ڕەعیەتی كوڕی هیند نابین و ئەوكاتە لە ناوچەی عەلان دەوارەكەی بەشوێنەوە گیرا و بەتاڵان برد لە نزیك ماڵەكانی گوندی عەوسارە.

ئەوە چیرۆكی ئێوەیە و پەیوەندیی بە ئێمەوە نییە، حەقی ئێوە لای ئەم پادشایەیە كە ئێوە ئێستە لە ساباتەكەیدا سوڵح دەكەن.

فَتَـــأَوَّتْ لَهُـــمْ قَرَاضِـــبَةٌ مِـــنْ كُـــلِّ حَـــيّ كَـــأَنَّهُمْ أَلْقَـــاءُ

تأوّن: كۆبوونەوە، قراضبة: لاتولووت و هەرچیی و پەرچیی، الألقاء: فرێدراو.

دەڵێ: كە ئێوە نەچوون بۆ یارمەتیی مونزیری كوڕی ماءالسماء كە كوڕەكەی دوای خۆی داوای هاوكاریی لێ كردن، ئەویش لە هەر خێڵێك هەرچی لاتولووت و هەرچیی و پەرچیی هەبوو كۆی كردەوە و كەسانی بێزراو و فرێدراوی كۆكردەوە.

فَهَـدَاهُمْ بِالأَسْـودَيْنِ، وَأَمْـرُ الْـ ـــهِ بَلْـغٌ يَشْـقَى بِـهِ الْأَشْـقِيَاءُ

الأسـودين: ئـاو و خورمـا، چـونكە خورمـا ڕەشـە، ئاوەكەشـی بـە ڕەش دانـاوە، بۆیـە دەڵـێ: دوو ڕەشـەكە، بلـغ: بـە ئـەنجام دەگـات، الأشـقیاء: پیاوخراپ و سەرسەریی.

دەڵـێ: ئـەم مەلیكـە، ئـەم سـوپایەی كـە بـەم جۆرە باسـكرا بـە ئـاو و خورمـاوە ڕەوانـەكرد وتـی بـە فـەرمانی خـودا دەبـێ بـە ئـەنجام بگـات و خەڵكی سەرسەریی پێ تەمێ بكرێ و ئازاریان بدات.

إِذْ تَمَنَّـوْنَهُمْ غُـرُوراً، فَسَاقَتْـ ـــهُمْ إِلَـيْكُمْ أُمْنِيَّـةٌ أَشْـرَاءُ

غرور: لەخۆبایی، ساقت: ڕەوانەی كرد، أمنیة: ئارەزوو و ئاوات، أشـراء: لووتبەرزیی لە خراپەدا.

دەڵـێ: ئێـوە ئازەرووتـان هـەبوو كـە دژی عـەمری كـوڕی مـونزیر وەڵام بدەنەوە و گوتتان عەمر كێیە؟، كۆمەڵێ هیچ و پووچ و تـرۆی لەگەڵدایـە، ئێمە حەزدەكەین لەگەڵ ئەم سەرسەریی و بـێ بەندوباوانـە شـەڕ بكـەین، بەڵام ئەو سوپایە ئێوەی سەرشۆڕكردووە!.

لَـمْ يَغُـرُّوكُمُ غُـرُوراً، وَلَكِـنْ يَرْفَـعُ الآلُ جَمْعَهُـمْ وَالضَّـحَاءُ

لم یغـرّوكم: بـە ناخـافڵی نەهاتنـە سـەرتان، الآل: سـەراب، تراویلكـە، الضحاء: چێشتەنگان.

دەڵـێ: ئـەم سـوپایە كـە ئێـوە سـووكایەتیی و گاڵتـەتان پـێ دەكـرد، غافڵگیریان نەكردن، بەڵكو بە ڕۆژی پاك و چێشتەنگاوی پـڕ لـە تراویلكـە

هاتنە سەرتان، بۆچی ئێوەیان بەزاند و سەریان پێ شۆڕکردن، توخودا ئێوە ئەتوانن دژ بە خێڵی بەکر شەڕ بکەن؟.

أَيُّهَا الشَّانِيُّ الْمُبَلِّغُ عَنَّا عِنْدَ عَمْرٍو، وَهَلْ لِذَاكَ انْتِهَاءُ؟
إِنَّ عَمْراً لَنَا لَدَيْهِ خِلاَلٌ غَيْرَ شَكِّرِفِي كُلِّهِنَّ الْبَلاَءُ
مَلِكٌ مُقْسِطٌ، وَأَكْمَلُ مَنْ يَمْـ ـشِي، وَمِنْ دُونِ مَا لَدَيْهِ الثَّنَاءُ

الشاني: دوژمنی شادكامیی، البلاء: ناز و نیعمەت، مقسط: دادپەروەر.

دەڵێ: هۆكار و ڕای دوژمنی پادشا، مەبەستی شاعیری خێڵی تەغلەبە، كە عەمری كوڕی كولسومە كە دژی عەمری كوڕی هیندە و ئەم شاعیرە لەبەردەمیدا شیعر دەڵێ: تۆیەك كە دژی ئێمە گوتار دەڵێیت مەبەستت كۆتایی هەیە؟، ئەو عەمرەی تۆ شادكامیی پێ دەكەی پادشایەكی دادپەروەرە، لە هەموو شایەك زیاتر ئێمە دەناسێ و سیفەتی هەموومانی لە لا ڕوونە و خاوەنی نازونیعمەت و دەهەندەیە بۆ هەموو شایستەی مەدح و سەنایەك و ئەوەی ئیمە پێیدا هەڵدەدەین هێشتا هەر كەمە و جەنابیان لەوە زیاترن، حاڵی بووی!؟.

أَسَدٌ فِي اللِّقَاءِ وَرْدٌ هَمُوسٌ وَرَبِيعٌ إِنْ شَنَّعَتْ غَبْرَاءُ
فَرَدَدْنَاهُمُ بِطَعْنٍ كَمَا تُنْـ ـهَزُ عَنْ جَمَّةِ الطَّوِيِّ الدِّلاَءُ
وَفَكَكْنَا غُلَّ امْرِىءِ الْقَيْسِ عَنْهُ بَعْدَ مَا طَالَ حَبْسُهُ وَالْعَنَاء

ورد: گوڵباخ، هموس: ئارام و لەسەرخۆ، ربیع: بەهار، شنعت: كاری گەن و خراپی كرد، غبراء: ساڵی وشكەساڵیی و خاكی وشك، جمّة: بیری ئاو، الطوی: پێچاوپێچ.

دەڵێ: ئەو پادشایەی ئێمە کە لەژێر فەرمانیدابووین ئێوە لاساربوون لە ئاستیدا و شێرە لە تەنگانەدا و لەکاتی بەیەکگەیشتندا گوڵی ناو باخە، لەکاتی خۆشیی و پشوودا هێمن و ئارامە و لەسەرخۆیە، لە بەخشندەییدا بەهارە و ڕێژمنەی خەڵاتی زۆر لەو ساڵانەی کە وشکە ساڵیی و بێ بارانی کاری خراپی بەسەر خەڵکدا هێناوە، ئێمە لەگەڵ مەلیکدا دوژمنمان داپڵۆسی و ڕم و شیر و تیری ئێمە لە لاشەی دوژمندا وەك دۆڵچەی ئاوی بیر خوێنی لە لەشیان چۆڕەبڕەی دەکرد و لە هەمان جەنگدا بەرای شامان ڕزگار کرد کە (ئیمرەئول قەیس) لە دیلی و ئەسارەت، وە مەیسوون کچی پادشای غەسانمان بە کەنیزەکی هێنا بۆ برای دیلی خۆمان عەمری کوڕی هیند.

وَأَقَــدْنَاهُ رَبَّ غَسَّــانَ بِالْمُنـــــذِرِ كَرْهــاً، إِذْ لاَ تُكَـالُ الـدِّمَاءُ
وَفَــدَيْنَاهُمُ بِتِسْـــعَةِ أَمْـــلاَ كِ كِـــرَامٍ أَسْـــلاَبُهُمْ أَغْـــلاَءُ

أقدناه: تۆڵەمان وەرگرتەوە، ربّ: مەلیکی غەسان، کرها: بەزۆر، لا تکل: پێوانە ناکرێ.

دەڵێ: تۆڵەی مونزیرمان کردەوە لە مەلیکی غەسان و بە زۆر دیلمان لێ گرتن و لە ڕۆژێکدا ئەوەمان کردبوو کە ئەوەندە خوێن ڕژابوو پێوانە نەدەکرا، ئەوجا نۆ کەس لەسەرکردەمان دیل کرد، بەڵام کام دیل، هەموو ڕەسەن، وەجاخزادە، بەرگ و کاڵایان گرانبەها بوو و لە نازونیعمەتدا ژیابوون.

دەڵێ بە شاعیری تەغلیب کە عەمری کوڕی کولسوم: ڕۆڵەگیان ئەوە ئێمەین بمانناسە!.

وَمَـعَ الْجَـوْنِ جَـوْنِ آلِ بَنِـي الأَوْسِ عَنُـودٌ كَأَنَّهَـا دَفْـوَاءُ
مَا جَزِعْنَا تَحْتَ الْعَجَاجَةِ إِذْ وَلَّـ ـتْ بِأَقْفِائِهَـا وَحَـرَّ الصِّـلاَءُ
وَوَلَـدْنَا عَمْـرَو بْـنَ أُمِّ أُنَـاسٍ مِـنْ قَرِيـبٍ لَمَّـا أَتَانَـا الحِبَـاءُ

جن: مەلیك بووە لە هۆزی كیندە، عنود: سەرچڵ و كەللەڕەق، دفواء: شۆڕ دەبووەوە وەك هەڵۆ لە ئاسمانەوە بۆ نێچیر، العجاجة: تۆز و خۆڵی ساحەی شەڕ، أقفاء: دەوروبەر، الصلاء: گەرمیی ئاگر.

دەڵێ: لەگەڵ ئەم مەلیكە كە بۆ شەڕی ئێمە هاتبوون تیپێكی وای لەگەڵ بوو كە لەهۆزی ئەوسەوە هاتبوون، كەللەڕەق و لارن و شەڕئەنگێز و پادشایان خۆشدەویست وەكو هەڵۆی سەر چیا لە دەووری مەلیك كۆبووبوونەوە، بەڵام ئێمە ترسمان نەبوو لەناو تۆزی شەڕگەدا ڕاومانان بە ئاگر گەرممان كردنەوە.

ئێمە لەگەڵ ئەو پادشایە خزمایەتیمان هەیە عەمری كوڕی ئوم ئەیاس نزیكی ئێمە و شیربایيان بۆ ئێمە هێناوە و ئێمە خاڵۆی پادشاین، بەڵام ئێوە مسكێنی بێ گوێن!.

مِثْلُهَـا يُخْـرِجُ النَّصِـيحَةَ اللقَـوْمِ فَـلاَةٌ مِـنْ دُونِهَـا أَفْـلاَءُ

دەڵێ: ئەم خزمایەتیی و نزیكییە لە مەلیك وا دەكات جەنابی مەلیك ئامۆژگاریی خزمانی خۆی وەرگرێ، چونكە ئەم پارچە زەوییە پەیوەندیی بە زۆر پارچەی دیكەوە هەیە، هەركەس ئەم قەسیدەیە بخوێنێتەوە باش تێ ئەگات كە لەناو ئەو ئەنجوومەنەی كە هۆزی بەكری لێیە و ئەم شاعیرە نوێنەریانە و هۆزی تەغلیب كە عەمری كوڕی كولسوم نوێنەریانە

بـۆی دەرئەکـەوێ کـە مـەلیك کـە عـەمری کـوڕی هینـدە مـەیلی لـە لای بەکرییەکانـە و دژی تەغلیبـەو، لەبـەر ئـەوە ئـەم ئەنجوومەنـە کۆتـایی بـە کوشتنی مەلیکەوە هات و هەرچی ویستی لایـەنی خـاڵوانی بگـرێ سـوودی نەبوو.

# ئەعشای گەورە

ئەم شاعیرە ناوی مەیموون كوڕی قەیسە، لە هۆزی بەكری وائیلە، ناوی (ئەعشای) لەسەر خۆی ناوە، چونكە چاوی كزبووە، یان شەوكوێر بووە، وشەی گەورەی بۆ دانراوە، چونكە زۆر شاعیرمان هەیە بەم ناوەوە، لە گوندێكی چەپی ڕەمەنە بووە و زۆر شوێن گەڕاوە، بە شیعر بژێوی خۆی پەیداكردووە، سەردانی دوورگەی عەرەبی كردووە، چووەتە یەمامەی یەمەن، چووەتە عەدەن و نەجران، هامشۆی حیجازی كردووە و لە بازاڕی ئەدەبی عوكازدا بەشداری كردووە، سەردانی عێراقی كردووە و زمانی فارسی زانیوە و شارەزایی لە ئاینی مەسیحدا هەبووە، كەرەستەی ڕۆشنبیریی چاخی خۆی بە زیادەوە هەبووە، داڕشتنی شیعرەكانی زۆر قووڵ و چڕوپڕی ماناو مەبەست بووە، وشەی ئاسان و سووك و ئاوازی ئەو ڕۆژەی پێوە دیارە و حەزی لە مۆسیقا بووە و شیعرەكانی ئاشنا و دۆستن بە هەست و گیانی مرۆڤ، ئەم قەسیدەی ئەعشا دیارترین شیعرەكانی ئەم شاعیرەیە لە دڵدارییەوە بۆ وەسف، دەربارەی خۆشەویستی ١-١٧، مەی و خواردنەوە ١٨-٢٧، سەفەر ٢٨-٣٠، هەور، باران، بزیسكە و گرمەی هەور ٣١-٣٩، شانازیی لە ٤٠-٦٤ و كۆتایی بە حەرفی لامیش هاتووە.

وَدِّعْ هُرَيْـرَةَ إِنَّ الرَّكْـبَ مُرْتَحِـلُ    وَهَـلْ تُطِيـقُ وَدَاعـاً أَيُّهَـا الرَّجُـلُ؟

هريـــرة: كـــەنيزێكی جوانبـــووە و نازنـــاوە بـــۆ دڵدارەكـــەی واتـــە پشیلەچـكۆلە، ودع: ئیزنـــی لێ بخـوازە، الركـب: قافڵـە، كـاروانی، تطبـق: ئەتوانی.

دەڵـێ: خواحـافیزیی بكـە پشەسوورەی جـوان و خنجیلانـە و ئیزنـی لێ بخوازە، چونكە كاروانی سەفەر ئامادەیە و لەسەر ڕێگەیە، بەڵام بڕواناكەم توانـای جیابوونـەوەت هـەبێ، ئـەتوانی ئیزنـی لێ بخـوازی، هـەی پیـاوی حەساوی!؟.

غَرَّاءُ فَرْعَـاءُ مَصْـقُولٌ عَوَارِضُـهَا     تَمْشِي الْهُوَيْنَا كَمَا يَمْشِي الْوَجِي الْوَحِلُ

غـراء: سـپی تـەواو سـپی و ناوچـاوان پـان و ڕۆشـن، فرعـاء: باڵابـەرزە، شـۆخ، زڵـف و پەلكشـۆڕ، العـواض: لای گـوپ و لای زوڵفـی هـەردوو لای، مصقول: شانەكراو و دەم و ددان سپی و پاك و بـێ گـەرد، الهوینـا: هێـواش ڕێ دەكـات، الـوجی: ئـەو بـانووە كـە سمـی زامـارە و كـەمێ بـۆی ئەلـەنگێ، الوحلُ: كەسێك لەناو قوڕدا ڕێ بكات.

دەڵـێ: ئـەم كیـژە سـپییە پەلكەدرێـژە ددان وردو خاوێنـە، كـە دەچـێ بەڕێوە دەڵێی ئاسكە و سمی زامارە!.

كَـأَنَّ مِشْـيَتَهَا مِـنْ بَيْـتِ جَارَتِهَـا     مُـرُّ السَّـحَابَةِ، لاَ رَيْـثٌ، وَلاَ عَجَـلُ

دەڵـــێ: ڕۆیشـــتنی ئـــەم بەرخـــە، ئـــەم بەرخـــە پشـــیلەیە لـــەماڵی هاوسێكەیانەوە دەڵێی هـەوری تـەڕ و پـاراوە و بـە ئاسمانـدا دەڕوا، نـە زۆر هێواشە و نە زۆر بە لەرز و پەلەیە، ئاخۆ ئەم كیژە چاوشـینە، قژ زەردە،

ئاوريشم لەبەرە، ئەم ناسك و نازدارە، كيژى كام چيانشين و زۆزان و بەفر و هەورى نەرم و پڕ لە ئاو بێ؟، نازانم!.

تَسْمَعُ للْحَلْيِ وَسْوَاساً إِذَا انْصَرَفَتْ     كَمَا اسْتَعَانَ بِرِيحٍ عِشْرِقٌ زَجِلُ

الحلی: خشڵ، زێڕ و زيو، ومسواس: خڕەی كەمەرە و هەياسە و زرنگەی مێخەكبەند، انصرفت: كە بەملاوئەولای خۆيدا پاڵئەكەوێ، عشرق: درەختێكی كورتەبالاّ بە ئەندازەی باڵێك بەرێك دەگرێ، وەك لۆبيا كە با لێيدا دەوەرێ، دەنگی وەك خشڵی ئافرەت دێت، زجل: ڕێك لە ئاوازی عەتابەی عەرەبە.

دەڵی: ئەم كيژە خشڵی زۆری لە خۆداوە، كە لە جێگەدا خۆی دەجوڵێنێ دەنگی وەك كەوتنە خوارەوەی بەری ئەو درەختەی لێ دەبيسترێ.

لَيْسَتْ كَمَنْ يَكْرَهُ الْجِيرَانُ طَلْعَتَهَا     وَلاَ تَرَاهَا لِسِرِّ الْجَارِ تَخْتَتِلُ

طلعة: ڕوو، تختتل: گوێی لێ ناگرێ بۆ بڵاوكردنەوەی.

دەڵێ: ئەم كيژە لەوانە نييە كە دەرودراوسێ حەزيان بە چارەی نەبێ و ڕووی نەدەنێ، بەڵكو لايان خۆشەويستە، چونكە هەرگيز هەوڵ نادات نهێنيی هاوسێ و دراوسێی بڵاوبكاتەوە.

يَكَادُ يَصْرَعُهَا لَوْلاَ تَشَدُّدُهَا     إِذَا تَقُومُ إِلَى جَارَاتِهَا الْكَسَلُ

يصرع: بكەوێ و بدرێ بە زەويدا، تشدد: خۆڕاگری، الكسل: تەمەڵيی لە قورسيی.

دەڵێ: ئەم کیژە قەڵەو و قورسە و کەمێ لەش و باری قورسە، ئەگەر خۆڕاگری خۆی نەبێ کە دەچێ بۆ لای دەستەخوشکەکانی، نزیکە بکەوێ، چونکە لەش و باری چەور و نەرم و گەرمە.

إذَا تُلاَعِبُ قِرْنــاً سَــاعَةً فَتَــرَتْ وَارْتَــجَّ مِنْهَــا ذَنُــوبُ المَـتْنِ وَالكَفَــلُ

تلاعبُ: گەمەو گاڵتە دەکات، قرنـا: هاوشـان و هاوتـا، فقـرت: خـاو ئەبێتەوە، إرتج: ئەلەرێتەوە، ذنوب: مەشکە، کونە، الکفل: سمت و کەفەڵ.
دەڵێ: ئەگەر کەسێ دەستبازیی و گەمە بکات لەگەڵ هاوڕێیەکی خۆی زوو ماندوو دەبێ و سست دەبێ و سمت و سێبەنە و کەفەڵی لەرەی لێوە دێ.
(دەڵێی ئەم شاعیرە چاوی بە کچانی ئەمڕۆ کەوتووە کە دەچن بۆ بازاڕ بە پانتۆڵی کاوبۆیی تەسك و تروسکەوە!).

صِفْرُ الْوِشَاحِ، وَمِلْءُ الدِّرْعِ، بَهْكَنَــةٌ إذَا تَــأَتَّى يَكَــادُ الْخَصْــرُ يَنْخَــزِلُ

صفر الوشاح، قەدباریکە، کەمەری ناسکە، پشتێنی لە پشت شل دەنوێنێ، ملءُ الدرع: پڕ بە کراس و سوخمەیە، بهکنة: بەرز و گەورە نموونە، تأتی: هەڵئەسێتەوە، الخصرُ: ناوقەد، ینخزلُ: جیا دەبێتەوە.
دەڵێ: چی باس بکەم بۆت ئەم کچە هەرچەندە قەڵەو و پڕە، بەڵام ناوقەدی بەڕێکی دیارە و باریکە و سنگ و بەرەکی پڕ بە کراس و سوخمەیە و بەرز و شۆخ دیارە، کە هەڵئەسێتەوە سمت و کەفەڵی خەریکە لە لەشی جیا ئەبێتەوە، بە کورتی ناو ئاخنی لۆکەی بۆ خۆی داناوە.

نِعْمَ الضَّجِيعُ غَـدَاةَ الـدّجْنِ يَصْـرَعُهَا    لِلَــذَّةِ المَــرْءِ، لاَ جَــافٍ، وَلاَ تَفِــلٌ

الضّجيع: نركە و جيرە جيڕ، غداة الدّجن: ئێوارەی داپۆشینی هەور بەسەر زەویدا، يصرعها: ئەیدات بە ئەرزدا، لاجاف: ترش و تاڵ و وشك نییە، لاتفلّ: بۆنی ناخۆشی نییە.

ئەم وێنەیە دەگمەنە، چواندنی کاتی(....) بەرپنەی بارانی هەورێکی باراناوی بەسەر خاکێکداو هەورەکە پاڵی داوەتە سەر زەوی و خۆشی و لەزەتێك دەدات بە هەست و نەستی مرۆڤ و زەوییەکەش وشك نییە، بەڵکو تەڕە و ناسکە و بۆنی ناخۆشی نییە، بەڵکو بۆنی بارانی پەڵەی پایزی لێ دێ، (دەك ماڵت برمێ بۆ ئەم وێنەیە).

هِرْكَوْلَــــةٌ فُنُــــقٌ دُرْمٌ مَرَافِقُهَــــا    كَــأَنَّ أَخْمَصَــهَا بالشَّــوْكِ مُنْتَعِــلُ

هِركولةٌ: ڕان و پوز قەڵەو، ساف و بێ گرێ، ڕاست لە ڕێکردندا، فنقٌ: تازە ڕەس، نۆەبەر، درم: ئانیشك و قۆڵ و باسکیی ناسك و ساف و سپی، أخمص: پاژنەی پێ، الشوك: دڕك.

دەڵێ: وەسفی کوێی بکەم ئەم کیژە بە دیمەنی یەکەمجار قەڵەو دێتە بەرچاو، بەڵام لەبەر ئەوەیە ڕان و پل و پوزی قەڵەو و ساف و بێ موو دەرئەکەوێ، گوڵبەدەم، تازەباڵغ و نەورەسە، باسك و باڵ و مەچەکی دەڵێی داری شمشاڵە، پاژنەی ڕێکە، دەڵێی بەدڕك ساف کراوە، پێی ئەڵێی سمی ئاسکە و دڕکی پێدا چووە، نەرم لەسەر زەوی دایدەنێ.

إِذَا تَقُــومُ يَضُــوعُ المِسْــكُ أَصْــوِرَةً    وَالزَّنْبَــقُ الْــوَرْدُ مِــنْ أَرْدَانِهَــا شَــمِلُ

يضوع: بۆنی خۆشی بلاو دەبێتـەوە، أصورة: بـە جۆراوجـۆر كـات دوای كـات، زنبـق: گـوڵی زەنبـەق، أِردان: قـۆڵ و سـەروقۆڵ و فەقیانـە، شمـل: گەشتگیر.

دەڵـێ: تـام و بـۆن و ڕەنگـی هـەموو نـەوباوە و بەكـەس نـەدارە، بـۆنی میسك و عەنبـەر هەمیشـە وەك گوڵبـاخ بلاوئەبێتـەوە بـە هـەر چوارلادا، ئەڵێی گوڵی سووری زەنبەق لەسەر قۆڵ و فەقیانـە و دەرقاچـەكەی ئـاوی خواردوەتەوە و بە تامی ئەو ئاوە ئەو ڕەنگەی وەرگرتووە.

(مەگەر كامێرای سێ ڕەهەند بتوانێ ئەم وێنە بكێشێ!).

مَا رَوْضَةٌ مِنْ رِيَـاضِ الْحَـزْنِ مُعْشِـبَةٌ     خَضْـرَاءُ جَـادَ عَلَيْهَـا مُسْـبِلٌ هَطِـلُ

روضـةٌ: بـاخی گـوڵ، الحـزن: بـان و قـەد پـاڵ، نـە چیایە و نـە دەشـتە، معشبة: گژوگیای گـەش و تێرئـاو، خضـراء: سـەوزی ڕوون و ناسـك، جـاد: باری بێ، مسبل: هەروی بەڕێژەنە، هطل: نەرم و لەسەرخۆ.

ئەوە پاڵپشتە و گوزارەكەی دوای چەند بـەیتێك دێـت، دەڵـێ: هـەرگیز دیمەن و نیگاری باخچەیەكی تێرئاوی قـەدپاڵێك و لـەنزارێك و شـوێنێكی تەمـداو گیـاو كوڵـوكی سـەوزی هـەبێ و بـارانی هـەورێكی نـەرم هێـواش هێـواش گـوڵ و غونچـەی ئـاو دابـێ تادەگاتـە جـوانی پشـە سوورەی ئـەم شاعیرە چاونەرم و كزە.

يُضَاحِكُ الشَّمْسَ مِنْهَا كَوْكَبٌ شَرِقٌ     مُـؤَزَّرٌ بِعَمِـيمِ النَّبْـتِ مُكْتَهِـلُ
يَوْمـاً بِأَطْيَـبَ مِنْهَـا نَشْـرَ رَائِحَـةٍ،     وَلاَ بِأَحْسَنَ مِنْهَـا إِذْ دَنَـا الأُصُـلُ

يضاحك: بە دەمييەوە پێ ئەكەنێ، كوكب: ئەستێرە، مەبەست گوڵی پشكوتوو كە تازە لە خونچە دەرهاتووە، شرق: تێرئاو، مەست، مۆزر: سەرپۆشدار، عميم النبت: گیای هەرەش، مكتهل: بەرەو باڵغبوون و گەیشتن، أطيب: بۆنخۆشتر، نشر: بڵاوبوونەوەی بۆن و بەرامە، الأصل: زەردەخۆری ئێوارە، پێش ئاوابوونی خۆر.

دەڵێ: گوڵی ئەو باخە وەك ئەستێرەی گەش بە دەمی خۆرەوە پێ ئەكەنێ و شەونم لە قەد و خونچەی وەك زەردەخەنەی یار دەبارێ و چارشێوی گەڵاو پەلكی گیای مەبەست و تێرئاو وەك كراس و كەوا لەسەری دیارە و نیشانەی كامڵیی و گەیشتنی پێوە دیارە، هەرگیز جوانتر نییە لەو یارە چ لە رووی بۆن و عەتری دەم و ددانییەوە، نە لەبەیانیدا كاتی ئاورنگ و شەونم و كاتی زەردەپەڕی ئێواران كە خۆر بە ماندوویی ئاوادەبێ و گوڵ و گیا ڕەونەق پەیدا دەكەن.

عُلِّقْتُهَا عَرَضاً، وَ عُلِّقَتْ رَجُلاً    غَيْرِي، وَ عُلِّقَ أُخْرَى غَيْرَهَا الرَّجُلُ

علقت: دڵم پێوە هەڵواسی، عرضاً: بە ڕێكەوت و سودفە.

دەڵێ: بە ڕێكەوت حەزم لێكرد و دڵی خۆم هەڵواسی پێیەوە، بەڵام حەزی لە پیاوێكی دیكە بوو، پیاوەكەش حەزی لە كچێكی دیكە بوو.

جاوەرە ئەم مەتەڵە هەڵبێنە، ئەمە حەزی لە من نییە و من حەزم لێیە و ئەو حەزی لە یەكێكی دیكەیە و ئەو حەزی لەم نییە!.

وَعُلِّقَتْهُ فَتَاةٌ مَا يُحَاوِلُهَا    وَمِنْ بَنِي عَمِّهَا مَيْتٌ بِهَا وَهِلُ
وَعُلِّقَتْنِي أُخَيْرَى مَا تُلائِمُنِي    فَاجْتَمَعَ الْحُبُّ حُبٌّ كُلُّهُ تَبِلُ

ما يحاولها: دەستی ناکەوێ، ميت: مردو، وهل: شێت و پەتەڕیی، ما تلائمنى: پێم ناشێ، تبل: دێوانە و چۆلگەڕ.

دەڵێ: تەماشای ئەم هەموو دڵدار و عیشقبازییە بکە ئەم پیاوەی کە دنکەکەی ئەو حەزی لەم نییە، کچێکی تر دڵی داوەتێ، کە ئامۆزایەتی، نیوە مردووی شێت بەتەمایەتی و بۆ نەگبەتی منیش کچێك حەزم لێ ئەکات بۆ من ناشێ، زۆر مندالە.

ئەوە چەند دڵدارێك کە بەیەکەوە پەیوەند نەبوون و یەك لایەنەیە، دەی بە خودا لەوە ناخۆشتر نییە تۆ حەزت لێیە و ئەو حەزی لە تۆ نییە و ئەو حەزی لە پیاوێکە و ئەویش حەزی لەم نییە و پیاوەکەش حەزی لەیەکێکی دیکە و ئەو حەزی لێ نییە و کەسێکی دیکە حەزی لەمە و ئەم حەزی لێ نییە.

(ئەوە کۆشکی حوب حوبێنەیە!!).

فَكُلُّنَــا مُغْــرَمٌ يَهْــذِي بِصَــاحِبِهِ نَــاءٍ وَدَانٍ وَمَخْبُــولٌ وَمُخْتَبَــلُ

مغرم: دڵزار بۆی مردووە، مخبول: شێت، مختبل: دێوانە، ناء: دوور، دان: نزیك.

دەڵێ: تەماشای ئەم دیمەنە بکە، سێ جووت، سێ کوڕ، سێ کچ، دڵداری هەیە، خۆشەویستی هەیە بەڵام هەر هەموو دوورن لەیەك، نزیك لەیەك، هەندێ شێت و دێوانە و هەندێ خۆشەویستی یەك لایەنە، دوو لانەی تێدا نییە.

(کورد دەڵێ: خۆشەویستی یەکسەرە ئەوەیە: من بۆ تۆ شێت و تۆش بێ خەبەری).

صَـــدَّتْ هُرَيْـــرَةُ عَنَّـــا مَـــا تُكَلِّمُنَـــا    جَهْـلاً بِـأُمِّ خُلَيْـدٍ حَبْـلَ مَـنْ تَصِـلُ

صدّت: دەستی ناوە بە ڕوومانەوە، تكلمنا: قسەمان لەگەڵ ناكات، جهلا: بە نەزانی، حبل: پەت، پەیوەند.

دەڵێ: بێ بەلاّبێ هورەیرەخان دەستی ناوە بە ڕوومانەوە و قسەمان لەگەڵ ناكات، نا شارەزایی ئێمەیە، ئاخۆ پەتی لەگەڵ كێدا گرێداوە!؟.

أَأَنْ رَأَتْ رَجُـلاً أَعْشَـى أَضَـرَّ بِـهِ    رَيْـبُ المَنُـونِ، وَدَهْـرٌ مُفْنِـدٌ خَبِـلُ

أعشى: شەوكوێر، ريب المنون: گومانی نزیكی مەرگ، مفند: گەندەڵكار، خبل: شێت و كێوی.

دەڵێ: ئەم دڵ نەدانە، لەبەر ئەوەی پیاوێكی چاوكز و شەوكوێر كە گومانی نزیكی مەرگ زیانی لێداوە و چەرخ و زەمانەی گەندەڵكار و شێت و وێت و دێوانە تووشی ژان و دەردە سەریی كردووە، نەخێر وانییە خانم!.

قَالَـتْ هُرَيْـرَةَ لَمَّـا جِئْـتُ زَائِرَهَـا:    وَيْلِي عَلَيْكَ، وَوَيْلِـي مِنْـكَ يَـا رَجُـلُ

دەڵێ: هورەیرەخان فەرمووی وا ڕۆیشتم بۆ دیدەنیی و سەردانی داماوم بە دەستەوەیە و تووشی ناخۆشیی بووم لە تۆوە هەی پیاو!، نازانم چۆن خۆم ڕزگار بكەم لە دەستی تۆ كابرای نەوسن!.

إِمَّـا تَرَيْنَـا حُفَـاةً لاَ نِعَـالَ لَنَـا    إِنَّـا كَـذَلِكِ مَـا نَحْفَـى وَنَنْتَعِـلُ

إمّا: ئەگەر، ترينا: بمانبينى، صفاة: پێخاوس، نحفى: بێ پێڵاوين، ننتعل: پێڵاو لەپێ ئەکەين.

دەڵێ: خانمەکەم ئەگەر جەنابتان هەندێ جار بە بەرەڵايى و پێخاوس بمانبينى و لەبەر ئەوەى خشەى پێماننەيەت، ئەوە سروشتى پياوە، هەندێکجار حەزى لە پێڵاو لەپێکردنە و هەندێکجار پێخاوسە، جارى وا هەيە حەزمان هەيە و هەندێك جار نيمانە!.

وَقَــدْ أُخَــالِسُ رَبَّ الْبَيْــتِ غَفْلَتَــهُ    وَقَــدْ يُخَــاذِرُ مِنِّــي، ثُــمَّ مَــا يِئِــلُ

أخالسُ: هەل وەرئەگرم و بەدزييەوە فرسەت ئەهێنم، يحاذر: لە من خۆى دائەگرێ، ما يئل: سەرکەوتوو نابێ.

دەڵێ: ئەوەستم بۆ ڕاوچى ژنان، زۆر جار فرسەت ئەهێنم خاوەنماڵ ئاگاى لە من نييە خۆم ئەکەم بە ژوردا! و زۆر جاريش کاوراى پەخمە و خانەگومان خۆى دائەگرێ لە من، بەڵام من سەرکەوتووم و نايەڵم ئەو سەرکەوتوو بێت و کارى خۆم ئەکەم!.

وَقَــدْ أَقُــودُ الصَّــبَا يَوْمــاً فَيَتْبَعُنِــي    وَقَــدْ يُصَــاحِبُنِي ذُو الشِّــرَّةِ الغَــزِلُ

أقود: پێشەنگى دەکەم، الصبا: هەرزەکاريى، ذو الشرة: هەندام و بەرگ و شێوازى سەرنج ڕاکێش و شارەزا لە دڵداريى و مێبازيى.

(ئەوە ئەدەبى بێ سەرپۆشە لەو سەردەمەدا و ئەمڕۆ واقيعە و هەيە!).

وَقَد غَـدَوْتُ إِلَـى الْحَـانُوتِ يَتْبَعُنِـي    شَــاوٍ مِشَــلٌّ شَــلُولٌ شُلْشُــلٌ شَــوِلُ

غدوت: بەیانی زوو دەڕۆم، حانوت: مەیخانە، شاو: كەبابچیی، مشل: كاروانی بەزەوق، شلول: بزێو و زیرەك، شول: بوخچەهەلگر.

دەڵێ: من ڕاوچیم كە ئەچم بۆ مەیخانە سەر لەبەیانی، ئەزانی لە دوامەوە كێ دێ؟، گۆشت برژێن، ولاخداری بزێو و زیرەك و ڕێناس و سەرناس و بوخچەهەلگری بۆنخۆش، ئەوەش بۆ ئەوەی بەزم و كۆڕەكە لە هەوای پاك و بێترسدا ئەنجام بدەم، مەی، ژن، كەرەسەی خواردنی خۆش، جێگە و پێگەی حەوانەوە، هەر پێنج (فعلە)كە ئامادەیە بۆ ئەم پیرە كوێرە خواناسە، خواردن، خواردنەوە، جێگەی گەرم، ڕابواردن، ئاواز و گۆرانی.

فِي فِتْيَةٍ كَسُيُفِ الْهِنْدُ قَدْ عَلِمُوا أَنْ هَالِكٌ كُلُّ مَنْ يَحْفَي وَيَنْتَعِلُ

فتیة: كۆمەڵە لاوێك، هالك: فەوتاوە، یحفی: پێخاوس، ینتعل: پێلاولەپێ.

دەڵێ: خۆم تەنیانیم لەگەڵ كۆمەلانی لاوی ئازادا وەك شێری هیند تیژ و بڕندە، دەمانزانی مەرگ لە پێش هەموو كەسە، هەژار و دارا و پێخاوس و كلاشلەپێ.

نَازَعْتُهُمْ قُضُبَ الرَّيْحَانِ مُتَّكِئاً وَقَهْوَةً مُزَّةً رَاوُوقُهَا خَضِلُ

نازعتهم: كێ بەركێم لەگەڵ كردوون، قضب: خۆش و بەتام، الريحان: خۆشەویست بەیەكتر، متكئاً: پاڵم لێدابوو، قهوة: مەی، شەرابی كۆن، مزّة: مێخۆش، ترش و شیرین، راؤوف: سوراحی و گۆزەی شەراب، خضل: هەمیشە تەڕ و ئاودار.

دەڵێ: من لەگەڵ ئەم لاوانە هەمیشە كێ بەركێم دەكرد هەر لە پاڵەوە بە ڕابواردن و قسەی خۆش و شەرابی كۆن و مەزەی ترش و شیرین و لەپاڵ مەسینە و سوراحیی و گۆزە و شەربەتی هەمیشە تەڕو پاراودا.

لاَ يَسْتَفِيقُونَ مِنْهَا وَهْيَ رَاهِنَةٌ    إلاَّ بِهَاتِ، وَإنْ عَلّوا، وَإنْ نَهِلُوا

لا یستفیقون: هۆشیان نایەتەوە بە خۆیاندا، چونكە مەی هەمیشە زۆر و ئامادەیە و لەبەردەستە، مەگەر ئەوكاتەی كە دەڵێن: بێنە، دووبارە بێ، یان یەكبارە، مەبەست ئەوەیە نەبوونی شەراب و مەزە هەمیشە و بە هەموو جۆر هەیە.

يَسْعَى بِهَا ذُو زُجَاجَاتٍ لَهُ نَطَفٌ    مُقَلَّصٌ أَسْفَلَ السِّرْبَالِ مُعْتَمِلُ

یسعی: دەیهێنێ، ذو زجاجات: ئەڵقەی مرواریی لەگوێ، نطف: مرواری دەنككەورە، مقلص: پووز و باڵیان هەڵكردووە بۆ ئیشكردن، السّربا: كراس و دەرپێ، معتمل: كارگوزار و چالاك.

دەڵێ: ئەم كوڕە كۆمەڵێ كارگوزار و بەندەی ناسك و تەڕ و گوارەلەگوێی بە مرواریی نەخشێنراون و دەرۆن پل و پووزیان هەڵكردووە و قۆڵ و باسكیان هەڵماڵیوە بۆ خزمەت و هەمیشە لە هاتن و چووندان بۆ خزمەتكردن.

وَمُسْتَجِيبٍ تَخَالُ الصَّنْجَ يُسْمِعُهُ    إذَا تُرَجِّعُ فِيهِ القَيْنَةُ الفُضُلُ

المستجیب: عوود و كەمان، تخال: گومان دەبات، ترجع: بۆی دووبارە دەكاتەوە، القینة: كەنیزەكی گۆرانیبێژ، الفضل: بەرگی ناسكپۆش.

دەڵێ: کە دەنگی عوود و کەمانچە و مۆسیقا بەرز دەبێتەوە، وا دێتە گوێت کە ئامێری سەنج بە کیژەگۆرانیبێژەکە دەڵێ: دەبۆم بسێنەرەوە بەو دەنگە خۆشەت، ئەم ئاوازە دووبارەکەرەوە، ئەویش دووبارەی دەکاتەوە لەبەرگێکی ناسك و تەرپۆشدا و دەنگی هاوتای ئامێرەکانی مۆسیقایە.

(ئەم وێنەیە ئێستە لە ناوچەی کەنداو هەر ماوە: مەی، مێ، دەنگ، ڕەنگ، بۆن، سەنگ).

وَالسَّاحِبَاتِ ذُيُولَ الرَّيْطِ آوِنَةً    وَالرَّافِلاَتِ عَلَى أَعْجَازِهَا الْعِجَلُ
مِنْ كُلِّ ذَلِكَ يَوْمٌ قَدْ لَهَوْتُ بِهِ    وَفِي التَّجَارِبِ طُولُ اللَّهْوِ وَالغَزَلُ

الساحبات: ژنانی شۆخ کە کراسیان لە زەوی دەخشێ، ذيول: داوێن، الرسط: کراسی ئاودامان، آونة: گشت کاتەکان، الرافلات: ئەوانەی پالێمی کراس بە دوای خۆیاندا دەکێشن، اعجاز: سمت و کەفەڵ، العجل: بوخچەی پڕ لە جل.

دەڵێ: ئەم بەزمی ڕابواردنی منە زۆر تەواوە، تێر و تەسەلە، جگە لە ئامرازی خۆشیی ژنانی شۆخ و شەنگ و لەناز و نیعمەتدا ژیاو، کراسەکانیان بە دوای خۆیاندا کێش دەکەن و سمت و کەفەڵیان لە کراسی شۆڕ و ئاودامانیدا دەردەکەوێ، ئەڵێی بوخچەی جل و کەلوپەلی ژنانەیانە، وەك ئەمڕۆ باوە، لۆکە لەژێر دەرپێ لەپێ ئەکەن، ئەوە ژیانی منە هەموو ڕۆژێ و ئەزموونم هەیە لە ڕاوکردن و ڕامکردندا.

(ئەو ڕۆژەی ئەم شاعیرە باسی ئەکات عەرەب لە چوار مانگی حەرامدا لە ئێستە زیاتر حەزیان لە ئەدەب و مەی و ژن بووە).

وَبَلْـدَةٍ مِثْـلِ ظَهْـرِ التُّـرْسِ مُوحِشَـةٍ     لِلْجِـنِّ بَاللَّيْـلِ فِـي حَافَاتِهَـا زَجَـلُ
لاَ يَتَمَنَّـى لَهَـا بِـالْقَيْظِ يَرْكَبُهَـا     إلاَّ الَّـذِينَ لَهُـمْ فِيمَـا أَتَـوْا مَهَـلُ

تورس: مەتاڵ، قەڵغان، حافات: دەوروبەری، زجل: دەنگ، يتمنى: پێدابڕاو و تێدا تێپەڕیو، القيظ: هاوین، مهل: مۆڵەت و شارەزایی.
دەڵێ: زۆر شارۆچکەم دیوە و پێیدا ڕۆیشتووم وەك سەری قەڵغان ساف و ڕەق و ڕژد بووە، چۆڵ و بێ ئاوەدانیی و جەنگەڵ و لە دەووروبەری دەنگی جنۆکە سەوزەڵەگیانیان دەوت، کەس نەیوێراوە بە گەرمادا پێیدا بڕوا جگە لەوانەی کە مۆڵەتی پیشەی ئازایەتییان هەبووبێت.

جَاوَزْتُهَـا بِطَلِيـحٍ جَسْـرَةٍ سُـرُحٍ     فِـي مِرْفَقَيْهَـا إذَا اسْتَعْرَضْـتَهَا فَتَـلُ
بَلْ هَلْ تَرَى عَارِضاً قَدْ بِتُّ أَرْمُقُـهُ     كَأَنَّمَـا الْبَـرْقُ فِـي حَافَاتِـهِ شُـعَلُ

طليح: وشتری بارگیری زۆر سەفەربکات، جسرة: گەورە وەك پرد، سرح: سووکڕەو، فتل: ناوپەل بلاو، عارضاً: هەور لە دەوری ئاسمان، بت: شەوگارم کردووەتەوە، أرمقة: بۆم ڕوانیوە، شعل: گڕوبلێسە.
دەڵێ: لەو شوێنە سەخت و دژوارەدا بە وشترێکی قۆڕ وەك پردی گەورە، بەڵام سووك و خۆشڕەو، نێوان لاقەکانی ئەگەر تەماشای بکەیت و لێی وردبیتەوە زۆر بلاوە، چونکە سەفەری زۆری پێ کراوە، نەك هەر ئەوە، بەڵکو هەوری چڕ و گشتگیر کە هەمیشە چاوم لێبووە کەی تۆفان بکات و شیوودۆڵ پڕ بکات لە ئاو و تیشکی بزیسکە لەملاوئەولای ئەو هەورەوە وەك ئاگری گڕدار بلێسە و زمانەی کێشابوو.
جاوەرە کاورای دەشتەکیی لەترسا زەندەقت نەڕوا.

لَـــهُ رِدَافٌ وَجَـــوْزٌ مُفْـــأَمٌ عَمِـــلٌ     مُنَطَّـــقٌ بِسِـــجَالِ الْمَـــاءِ مُتَّصِـــلُ

ردِاف: پاشـكۆ، جـوز: نـاوبڕ و ناوەڕاسـت، مفـأم: پـان و بـەرین، عمـل: هەمیشه پڕ لە ڕەعد و بەرق، منطق: پشتێنی قـایمی هـەوری گەواڵـەی لـه دەور بوو، سجال الماء: كونەی ئاو، متصل: پشووی نەبوو.

دەڵێ: ئەو هـەورە گشـتگیرە تـەنها خـۆی ئاسمـانی دانەپۆشـیبوو، بـەڵكو پاشـكۆی بـە دوای خۆیـدا ڕادەكێشـا و ناوەنـاوە ئاسمـان لـە ناوەڕاسـتیدا دەردەكەوت و هەورەكە زۆر گەورەبوو، دەنگـی هەورەتریشـقە و ڕوونـاكیی بزیسكەی هەمیشـەیی بـوو، وەك پشـتێنی ئاسمـانی داگیریكردبێت پێچـی دابوو، وەك دەمی كونـه و جەوەنه بەربدەیت وا بارانی دەباران، مـن كـوڕی ئەو ڕۆژەم بێ ترس ڕێگەم بڕیوه و نەترساوم.

لَـمْ يُلْهِنِـي اللَّهْـوُ عَنْـهُ حِـينَ أَرْقُبُـهُ     وَلاَ اللَّـذَاذَةُ مِـنْ كَـأْسٍ، وَلاَ شُـغُلُ
فَقُلْتُ لِلشَّرْبِ فِي دُرْنَا وَقَدْ ثَمِلُـوا:     شِيمُوا، وَكَيْفَ يَشِيمُ الشَّارِبُ الثَّمِلُ؟

لم یلـهنی: سـەرقاڵی نـەكردم، للـذاذة: سـوود وەرگـرتن، اشـغل: سـەرجەنجاڵیی، للشـرب: مـەیخۆرەكان، شـیموا: بـڕوانن، اثملـوا: بەدمەستبوون.

دەڵێ: لـه كـاتی وردبوونـەوە لـەم هـەموو ئاسـتەنگەدا، ڕێگـەی سـەخت، هـەور و بـاران، جەنگـەڵی چـۆڵ، كاریـان نـەكردە سـەر ڕابـواردن و شەرابخواردنەوەم و مەیلم هەر لای پیاڵـه و جـامی شـەراب بـوو، گـوتم بـه هاوەڵەكانم لە شاری دورنا كه نزیك شاری حیرەیه و دەرگـای وڵاتـی فـارس بووە، كه لەوپەڕی مەستیی و سەرخۆشیدا بوون، گوتم: بڕوانن ئەو دیمەن

و وێنەیە چەندە سامناكە!، بەڵام من خەمی ناخۆم، ئەوجا گوتم: مەیخۆری سەرخۆش كەی توانای بینین و وردبوونەوەی هەیە؟.

قَالُوا: نُمَارٌ فَبَطْنُ الْخَالِ جَادَهُمَا    فَالْعَسْجَدِيَّةُ فَالْأَبْلاَءُ فَالرِّجَلُ
فَالسَّفْحُ يَجْرِي، فَخِنْزِيرٌ، فَبُرْقَتُهُ    حَتَّى تَدَافَعَ مِنْهُ الرَّبْوُ فَالرِّجَلُ

دەڵێ: لە وەڵامدا گوتیان: ئەو هەورە لەسەر (نوومارە) كە لە دۆڵی (خاڵ)ە، بارانی زۆری لێ دەبارێ لە عەسجەدییە، لە ئەبلائە، لە ریجە، لە سەفحە، لە خنزیرە، لە بورقەیە، هەتا لێشاوی باراناو هاتووە بەسەر تەپۆڵكە بچووكەكان و بە لاپاڵی چیاكانیشدا.

مەبەستی ئەم شاعیرە ئەوەیە هاوەڵەكانی شارەزای ناوچەی یەمامە بوون كە ئەم دانیشتنە لە نزیك ئەو شوێنانەیە.

حَتَّى تَحَمَّلَ مِنْهُ الْمَاءَ تَكْلِفَةً    رَوْضُ القَطَا فَكَثِيبُ الْغِينَةِ السَّهِلُ
يَسْقِي دِيَاراً لَهَا قَدْ أَصْبَحَتْ غَرَضاً    زُوراً تَجَانَفَ عَنْهَا القَوْدَ وَالرَّسَلُ

دەڵێ: ئەم بارانە زۆر بە سوود و خێر و بێرە بۆ ناوچەكە، ئاودێریی ناوچەكە دەكات و ئاوەكە دەبات بۆ باخەكانی قەتێ و گردەكانی زەوییە پڕ لە وارەكان و نیشانەی خۆی پێكاوە و پشتی لە خەڵك كردووە و سوودی بۆ ئەسپ و وشترەكان زۆرە، و ئێمەش بەم هۆیەوە دڵخۆشین و باران بۆ ئێمە بارینی شیر و لەوەڕ و ئاو و میوەیە.

أَبْلِغْ يَزِيدَ بَنِي شَيْبَانَ مَأْلُكَةً    أَبَا ثُبَيْتٍ، أَمَا تَنْفَكُّ تَأْتَكِلُ؟
أَلَسْتَ مُنْتَهِياً عَنْ نَحْتِ أَثْلَتِنَا    وضلَسْتَ ضَائِرَهَا مَا أَطَّتِ الإِبِلُ

مالكة: نامە، پەیام، تأتكل: هەوڵی خراپەدان، أثلة: بنەچە و شانازیی بۆماوە، ضائر: زیانكردن، أطلت الإبل: وشتر قۆڕە بكات.

دەڵێ: بڵێن بەو كابرایە كە ناوی یەزیدی شەیبانییە نامەیەكت بۆ هاتووە كە دەڵێ: باوكی سوبەیت! هەتا كەی دەست لە خراپە هەڵناگری؟، تۆ خۆت ناناسی ڕەگت دەگەڕێتەوە سەردارەكەی ئێمە و كەمی تاشراوە و باریك بووە و لەبەركەوتووە!، بەڵام ئەوەش بزانە تۆ ناتوانی زیان بەو دارە گەورەی ئێمە بگەیەنی، هەتا وشترێك مابێ بۆڕە و قۆڕەی لێوە بێت، تێگەیشتی!.

كَنَاطِحٍ صَخْرَةً يَوْماً لِيَفْلِقَهَا فَلَمْ يَضِرْهَا وَأَوْهَى قَرْنَهُ الْوَعِلُ

ناطح: شەڕەقۆچ و شاخلێدان، صخرة: گابەردی گەورە، يفلق: دوولەتی بكات، لم يضر: زیانی نییە، أوهی: سست ئەبێ و ئەشكێ، قرن: شاخ، الوعلُ: بزنەكێویی.

دەڵێ: ئەو هەوڵی خراپكردن و دوو لەتكردنی هۆزی ئێمە وەك ئەوەیە بزنی شاخدار بە شاخ بەردی گەورە دوولەت بكات، زیان بە بەردەكە ناگات، بزنەكە شاخی ئەشكێ و كۆڵەوار دەبێ.

تُغْرِي بِنَا رَهْطَ مَسْعُودٍ وَإِخْوَتِهِ عِنْدَ اللِّقَاءِ فَتُرْدِي، ثُمَّ تَعْتَزِلُ
لاَعْرِفَنَّكَ إِنْ جَدَّتْ دَاوُتُنَا وَالْتُمِسَ النَّصْرُ مِنْكُمْ عَوْضُ تُحْتَمَلُ
تُلْزِمُ أَرْمَاحَ ذِي الْجَدَّيْنِ سَوْرَتَنَا عِنْدَ اللِّقَاءِ فَتُرْدِيهِمْ وَتَعْتَزِلُ

تغری: هان ئەدەی، هەڵئەنێی، رهط: تاقم، دەستە، تردی: خۆت لەناو دەبەی، گۆشەگیر دەبی، جدت: تازەكرایەوە، عوض: چەرخ و زەمانە،

تحتمل: لەسەر شانت دادەنرێ و ئازار دەچێژی، ذي الجدين: نـاوی قەیسـی کوڕی مەسوەدە، واتە خاوەن دوو فدیە، سورة: ڕق.

دەڵێ: ئەوە پەیامە بۆ ئەو یەزیدناوە و دەڵێ بە هەڕەشە ئەوە تۆی هانی تاقم و دەستەی مەسوەدە و براکانی ئەدەی بۆ پێکدادان و ئاژاوە؟، لە ئەنجامدا خۆت تێدا ئەچی و گۆشەگیر دەبی، ئەوکاتە کە هەرا و شەڕ هەلگیرسا من تۆ ناناسم!، مەگەر کات و سات و زەمەن هاوکارت بێ و هەمووی لەسەر تۆ ئەکەوێ و تۆ باجەکەی ئەدەی و ئەوکات ڕق و ڕمی کابرای دووکەسی فدیە دەکەوێتە بەر ڕقی ئێمە و تۆ ئەبیتە هۆکاری لەناوچوونیان، ئێمە ئەوەمان پێ باش نییە.

لاَ تَقْعُدُنَّ وَقَدْ أَكَّلْتَهَا حَطَباً     تَعُوذُ مِنْ شَرِّهَا يَوْماً، وَتَبْتَهِلُ

لا تضقعدنّ: دامەنیشە، أكتلها: ئاگرەکەت ناوەتەوە و داری تەڕکت پێوە ناوە، تعوذ: پەنادەگری، تبتهل: لەخودا ئەپاڕێتەوە، لە شەڕی ئەو شەڕە بتپارێزی.

دەڵێ: بەشێکە لە نامە و پەیامەکە، دامەنیشە و خۆت کەنار مەگرە لەو شەڕەی خۆت ئاگرت کردووەتەوە و داری تەڕ و تەڕکی قایمت پێوە سووتاندووە و ئەمڕۆ خۆتی لێ ئەشاریتەوە و پەناگیریی ئەکەی و دوعاونزا ئەکەی کە خودا بتپارێزێ، بەڵام هەرکەس ئاگری شەڕی براکوژیی کردەوە یاخوا هەر خۆی ببێتە دار و فڕوکەی شەڕەکە و ببێتە قەقنەس.

سَــائِلْ بَنِــي أُسَــدٍ عَنَّــا فَقَــدْ لِمُــوا أَنْ سَــوْفَ يَأْتِيــكَ مِــنْ أَنْبَائِنَــا شَــكَلُ
وَسْــأَلْ قَشَــيْراً وَعَبْــدَ اللهِ كُلَّهُــمُ وَاسْــأَلْ رَبِيعَــةَ عَنَّــا كَيْــفَ نَفْتَعِــلُ
إِنَّــا نُقَــاتِلُهُمْ حَتَّــى نُقَــتِّلَهُمْ عِنْــدَ اللِّقَــاءِ وَإِنْ جَــارُوا وَإِنْ جَهِلُــوا

دەڵێ: ئەگەر زانیاریی باشت لەبارەی ئێمەوە نییە پرسیار لە خێڵی ئوسەدە بکە، چونکە ئەوان ئەزانن هەواڵ و دەنگوباسی ئێمە، زۆر وێنەی جیاوازیان لایە، ئەوجا پرسیاریش بکە لە قەشەیر و عەبدوڵڵا و پرسیار بکە لە ڕەبیعە بزانە کاروکرداری ئێمە چۆنە، ئێمە ئەگەر لەگەڵیاندا شەڕمان بکردایە، هەرڕشەمان نەدەکرد، لە ساحەی شەڕدا وەڵاممان نەدەدانەوە، هەرچەند ئەوان ستەمکار و هێرشبەربوون و نەفام و نەزانبوون بە شەڕ و ئەنجامەکانی شەڕ.

قَدْ كَانَ فِي آلِ كَهْفٍ إِنْ هُمُ احْتَرَبُــوا وَالْجَاشِــرِيَّةِ مَــا تَسْــعَى وَتَنْتَضِــلُ
إِنِّــي لَعَمْــرُ الَّــذِي حَطَّــتْ مَنَاسِــمُهَا تَخْــدِي، وَسِيقَ إِلَيْــهِ الْبَــاقِرُ الغُيُــلُ

دەڵێ: خێڵی کەهف، ئەشکەوتنشینەکە، ئەگەر پاڵی لێ بدەنەوە و داوای تۆڵە نەکەن، ئەوە خەڵکی باش هەیە لە ناویاندا کە خەبات بکات بۆ تۆڵەکردنەوە بۆیان، ژنە جاشری ئەتوانێ کۆششبکات و هەوڵبدات بۆ تۆڵە، ئەوجا دەڵێ بە گیانی ئەو کەسەی وشترەکەی سمەکڕەی دەکرد و بە ڕشمەوە غاری دەدا و زۆر شتی بۆ دابینکرا بە تاك و بەکۆ.

لَــئِنْ قَتَلْــتُمْ عَمِيــداً لَــمْ يَكُــنْ صَــدَداً لَنَقْــتُلَنْ مِثْلَــهُ مِــنْكُمْ فَنَمْتَثِــلُ
لَــئِنْ مُنِيــتَ بِنَــا عَــنْ غِــبِّ مَعْرَكَــةٍ لاَ تُلْفِنَــا عَــنْ دِمَــاءِ الْقَــوْمِ نَنْتَفِــلُ

عمیـد: گـەورە، سـەرکردە، صـدد: هاوشـان، فنمتثـل: هاوشـێوە دەدۆزینەوە، منیت: تووشتبووە بە تووشی ئێمەوە، غب: کەم و سەرەتا، ننتفل: ئینکاریی ناکەین.

دەڵێ: ئەگەر ئێوە گەورەیەك لە ئێمەتان کوشتبێ، ئێمەش بۆ تۆڵە دەگەڕێین بە شوێن سەرکردەیەکی چاکی ئێوەدا، کە هاوتای ئێمە بێت، ئەگەر لە کەمی ماوەی شەڕەکە ئەوەی بە سەرت هات بە چاوی خۆت بینیت، ئەوە لەمەولا لە ڕژانی خوێنی هۆزەکەت سەرپێچیی و ئینکاریی ناکەین و دەست ناپارێزین.

لاَ تَنْتَهُـونَ وَلَـنْ يَنْهَـى ذَوِي شَـطَطٍ     كَالطَّعْنِ يَهْلِـكُ فِيـهِ الزَّيْـتُ وَالْفُتُـلُ
حَتَّـى يَظَـلَّ عَمِيـدُ الْقَـوْمِ مُرْتَفِقـاً     يَـدْفَعُ بِـالرَّاحِ عَنْـهُ نِسْـوَةٌ عُجُـلُ

دەڵێ: ئەگەر دەست هەڵنەگرن لە زۆر و ستەم و خراپەکاریی، ئەوە دەرمانی ئەوەیە زامێکتان لەلاشە بکرێت، کە دەرمانی ڕۆنگەرچەك و پلیتەی ناو زامەکە لە ناوی زامەکەتان ونبێت، ئەوەندە قووڵ بێت، بۆ ئەوەی گەورەکەتان پەلە نەکات لە هەلگیرسانی جەنگ و بۆ پشوودان لە شەڕ و ئاشتبوونەوە ئافرەتانی کۆسکەوتوو ببەخشێت و ئەوانە لە پێش خۆیانەوە بکەنە سەنگەر، چونکە ئەزانن ئێمە دەست لە ئافرت نادەین، بەلامانەوە شورەییە.

أَصَـابَهُ هِنْـدُوَانِيٌّ فَأَقْصَـدَهُ     أَوْ ذَابِـلٌ مِـنْ رِمَـاحِ الْخَـطِّ مُعْتَـدِلُ
كَـلاَّ زَعَمْـتُمْ بِأَنَّـا لاَ نُقَـاتِلُكُمْ     إِنَّـا لِأَمْثَـالِكُمْ يَـا قَوْمَنَـا قُتُـلُ

دەڵێ: ئەو گەورەی ئێمە زامدارمان کردووە بە شمشێری هیندیی و ئێمە پەلامارمانداوە بۆ کوشتنی بەو شمشێرە، یان بە ڕمێکی چەماوەی

دەستكردی وەستاكانی شاری (خەت) لە بەحرەین و لە ئێوەدا ڕاستبووەتەوە، ئێوە واتان دەزانی ئێمە دەستمان ناچێتە كوشتنتان وانیە!، ئێمە بكوژی ئێوەین خزمینە!.

نَحْنُ الْفَوَارِسُ يَوْمَ الْحِنْوِ ضَاحِيَةً     جَنْبَيْ فُطَيْمَةَ لاَ مِيلٌ وَلاَ عُزُلُ

دەڵێ: ئێمە شۆڕەسواری مەیدانین لە ڕۆژی حینو دا بە ڕوونیی و ئاشكرایی دەركەوت بۆتان لە دەوروبەر و ئەملاوئەولای فاتیمە بچكۆلەی خۆتان، باشمان بناسن ئێمە نە كۆڵەسوارین لەسەر ئەسپ خۆمان نەگرین و نەبێ چەك و بە نەبوونیی و ڕەجاڵیی دەچینە گۆڕەپانی شەڕەوە، چاك بزانن!.

قَالُوا: الطِّرَادُ، فَقُلْنَا: تِلْكَ عَادَتُنَا     أَوْ تَنْزِلُونَ فَإِنَّا مَعْشَرٌ نُزُلَ
قَدْ نَخْضِبُ الْعَيْرَ فِي مَكْنُونِ فَائِلِهِ     وَقَدْ يَشِيطُ عَلَى أَرْمَاحِنَا الْبَطَلُ

دەڵێ: ئەگەر دەڵێن: با شەڕەرم بكەین ئەوە زۆر باشە، ئەوە ڕەوشتی ئێمەیە و تێیدا شارەزاین، خۆ ئەگەر بڵێن با دابەزین لە ئەسپ و شەڕەشیر بكەین، ئەوە هەر لە ئێستەوە ئێمە دابەزیوین، فەرموو دابەزن، ئێمە بە هەموو جۆرەكانی شەڕ شارەزاین.

ئەوجا باسی دیاردەیەكی شەڕی ئەوكاتە دەكات كە لەكاتی شەڕ و كوشتاردا و بە تایبەتی شەڕی سواری ولاخ كە ناوڕان و ناوگەڵی سوار سوور ئەبێتەوە و ڕەگی ناوگەڵ خوێنی لێ ئەچۆڕێ، ئێمە لە شەڕدا و لە سواری ئەسپەكانمان خوێنی ژێرزێنی ولاخەكەمان وەك لە خەنە گیرابێ وایە، لەبەر زۆرمانەوە لەسەر ئەسپ و زۆری ماوەی شەڕەكە، لەگەڵ

ئـەوەش توانامـان کـز نـەبووە و پاڵەوانـەکان لەسـەر ڕمـی ئێمـەوە بـەرز دەکرێنەوە و لەسەر ولاخەکانیان دەکەونە خوارەوە.

خوێنەری خۆشەویست! ڕەنگە ئەم جۆرە وێنەکێشانەی شـەڕی ئـەوکات و شـوێن و کەسـانە بـۆ ئێمـە وێنـا نـەکرێن، مەگـەر لەسـەر شـانۆی واقیـع بۆمان نمایش بکرێ، نموونەی شـەڕەکانی چیرۆکی (پـەیام)ی کـاتی یـارانی پێغەمبەر (درودی خوا لەسەر خـۆی و یـارانی)، ئـەو شـێوازەمان بـۆ ڕوون دەکاتـەوە، دەنـا بـە نووسـین توانـای کـەس نییـە مانـای شـیعری (أعشـای گەورە) بە وشەو ڕستە دەربڕێ و لەناو زمانی کوردیدا جێگەی بکاتەوە.

# نابیغەی زوبیانی

**٦٠٤ زاینی**

ئەم کەڵەشاعیرە ناوی زیادی کوڕی مەعاویەیە و لە هۆزی زوبیان و سەردەمی نەفامیدا بە زاراوەی مێژووی ئەدەبی عەرەبی ئیسلامی، وشەی (نابغە) بە مانای بلیمەت، هەڵکەوتوو، دەرکەوتوو دێت.

ئەم پیاوە چینی ناوەندی هۆزەکەیەتی و لە نێوان شاری (حیرە) کە پایتەختی ئەخمییەکان بووە و لە نێوان نەجەف و کوفەی ئەمڕۆدا هەواری کۆنی ماوە و ناوەندی ڕۆشنبیریی و ئەدەب و شیعر بووە و شاعیری وەك تورفە، نابغە، هاتووچۆیان تێدا بووە و شیعری زۆر بەرزی تێدا وتراوە.

ئەم شاعیرە شیعری وتووە بۆ پادشاکانی مەنازیرە و غەساسینە، هەتا کاتی نوعمانی سێیەم (٥٨٠-٦٠٢ )، ئەوجا پاش ئەوەی لە مەنانزیرە تورە دەبێ، ئەگەڕێتەوە بۆلای غەساسینە، بە کورتیی و بە عەرەبیی شاعیری دەربار بووە و هەمیشە مەدحی گەورەپیاوانی سەردەمی کردووە و هەندێ لە ڕەخنەگران دەڵێن: هەر تیرێك بهاوێ نیشانە دەپێکێ.

# دیوانی شاعیر

نابیغە دیوانی هەیە و زۆر گرنگی پێدراوە لەلایەن نووسەرانی ئیسلامیی و ڕۆژئاوایی، وەرگێڕاوە بۆ فەرەنسیی و زۆر شیکردنەوەی بۆ کراوە، بە تایبەتی ئەم قەسیدەیە (بائی)یە، لە سەنای عەمری کوڕی حەرسدا (٥٨٧-٥٩٧ز).

عەمر لە (٤-٥)، جەنگەکانی عەمر لە (٥-٢٣)، چاکەکانی لە (٢٣-٤٠)، بەلام ئێمە لە هەڵبژاردندا قەسیدە دالییەکەمان هەڵبژارد، کە بەم شێوەیە دابەشبووە: باری هەواری کۆن، باسی وشترەکەی، شەڕی نێوان سەگ و گاکێویی، مەدحی نیعمانی کوڕی مونزیر، بەرپەرچدانەوەی ئەو تۆمەتەی بۆ هەڵبەستراوە.

ئەم قەسیدەیە کە ئێمە دیاریمان کردووە بە شاکارێك لە ئەدەبی جاهیلیی دادەنرێ و بەشێکە لە دیوانی نابیغە و زیاتر لای ڕەخنەگرانی ئەدەبی عەرەبیی ناوی هەیە، چونکە کۆتا شیعری شاعیرە و ژمارەی بەیتەکان پەنجا بەیتە و پاش لێخۆشبوونی پادشا وتویەتی، هەرچۆن هەبێ نموونەی ئەدەبی عەرەبیی بەرزە.

# هۆ! ماڵی مەییە!

يَــا دَرَمِيَّــةَ بِالْعَلْيَــاءِ فَالسَّــنَدِ     أَقْـوَتْ، وَطَـالَ عَلَيْهَـا سَـالِفُ الأَبَـدِ

دار: ماڵ، دەوار، علیاء: شوێنی بەرز، السند: سەروی شیعر، أقوت: چۆڵ بووە، سالف: دێرین، الأبد: ساڵ و كات.

دەڵێ: ڕوو لە هەواری خاتوو مەییە ئەكات و وەك كەلەپوورێكی زیندوو بانگی دەكات: هۆ هەوارگەی مەییە، لەسەر چیا بەرزەكە و لەسەرووی شیعرەكە، كە زۆر بە داخەوەم چۆڵە و كەسی لێ نەماوە و بووەتە شوێنەوارێكی دێرین و كۆن و ساڵ و كاتی بەسەردا هاتووە.

ئەم جۆرە گوتارە لەگەڵ بەردودار و دیوار و كوانووی هەوارگەی چۆڵباری ناوی عەرەبە و لە زمانی كوردیشدا باوی ماوە، بە گومانی كۆنی عەرەب كە هەندێ باڵندەی وەك بایەقوش كە بەسەر هەواری چۆڵدا دەخوێنێ گوێبیستی ئەو بانگە دەبێ و هەواڵەكە دەگەیەنێ بە گیانی مردووی ئەو هەوار و داروبەرد و شاخ و دۆڵ و شیوە، نیشتمانی عەرەب یەكەمجار چاویان بە بیابان و چیای ڕەق و تەق و بێ گیا و لەوەڕ دەكەوێ و ئالوودەی ئەو دیمەنە بوون و پاش مردنیان سەردانی هەواری خۆیان دەكەن، بۆیە شاعیر بەم شێوە بانگی ئەو شوێنە دەكات بە پەیام و نامەیەك، بەڵكو بگاتە گوێی مەییەخانی كۆنە دنكی خۆی.

وَقَفْـتُ عِيهَـا أَصِـيلاً كَـيْ أُسَـائِلَهَا    عَيَّـتْ جَوَابـاً وَمَـا بِـالرَّبْعِ مِـنْ أَحَـدِ

أصيلا: ئێوارەوەختە كە كاتی گەڕانەوەی گشت كەسانی هەوارە، عیّت: بێدەنگ بوو، لاڵبوو لە وەڵامدانەوە، الرّبع: دەوارنشین، یان هەوارگە.

دەڵـێ: لـە ئێـوارە وەختەیەكـدا كـە خـۆر لـە ئاوابووندایـە و كـەش و هەوایـەكی شـاعیرانە دەبەخشـێتە ئـەو چیاوچۆڵە و منـیش بـانگم كـرد و زۆر وەستام بۆ ئەوەی پرسیار بكەم، ئەم خێڵە بۆ كوێ سەفەریان كـردووە و بۆ چۆڵە و كەسی لێ نـەماوە، بـەڵام سـەد داخ، وەڵام نـەبوو، لـەو هـەوارە كەسی لێ نـەمابوو، هـەتا وەڵامـم بداتـەوە، دار و سێ كوچـكە و پـارگێنی دەواریش وەڵامیان نەبوو.

ألاَّ أَوَارِيَّ لَأْيـــاً مَـــا أُبَيِّنُهَــا    وَالنُّؤْيَ كَالْحَوْضِ بِالْمَظْلُومَـةِ الْجلَـدِ

أواری: مـێخ و داری كەڵەی حـەیوان بەسـتنەوە، اللأي: زۆر سست، زۆر درەنگ، أبَینها: بـۆم ڕوون دەبێتـەوە، النؤي: دیـواری پشـتی دەوار، كـە بـە كـوردی پارگێنـە بـۆ ئـەوەی باران نەیەتـە نـاو ماڵـەوە، الحـوض: چـاڵ، المظلومة: زەوی هەڵكۆڵراوە، كە شوێنی خۆی نییە بۆ چاڵهەڵكەندن، الجلد: زەوی ڕەقان و سەخت.

دەڵـێ: كـەس نـەبووە وەڵامـم بداتـەوە، ئـەوەی بـە زمـانی حـاڵ وەڵامـی دامەوە تەنها دارمێخ بـوو كـە زۆر بـە ئەسـتەم دەمبینـی، چونكە ڕۆچـوو بـووە زەوی و هەنـدێ پـارگێنی دارەكـەیان بـۆ پاراسـتنی دارەكـە لـە ئـاوی بارانەكەوە چاڵێكی قووڵ لە زەوییەكی سەخت و ڕەق هەڵكەنرابێ وابوو،

دیاره لەبەر ڕەقیی ئەرزەکە ئەو جۆگەلە بە چاڵیی مابووەوە، دیاره لە مێژە لێرە نەماون و باریان کردووە بۆ شوێنی دوور.

رَدَّتْ عَلَيْـــهِ أَقَاصِـــيهِ وَلَبَّـــدَهُ    ضَرْبُ الْوَلِيـدَةِ بِالْمِسْـحَاةِ فِـي الثَّـأَدِ

ردّت: داویەتە دواوە، أقاصي: خۆڵە پرژوبڵاوەکەی دەوروبەر، لبّدة: شێلاویەتیی و لەسەریەکی داناوە، ضرب: هەڵکۆڵین، الولیدة: کیژی تازە هەرزەکار، مسحاة: پاچ، الثأد: زەوی تەڕ و لمدار.

دەڵێ: ئەم هەوار و شوێن و ڕەشماڵەی یارەکەمم بە ئەستەم دۆزییەوە، بە هۆی گلێ مێخ کە داکوتراوە بە زەویدا و بە هۆی چاڵی پارگێنی لە پشتی ماڵەوە هەڵکەنراوە کە خۆڵ و قوڕی دووری ئەملاوئەولاشی بۆ کۆکراوەتەوە، جوان خوساوە و ترشاوە و لەسەریەك وەك خشت دانراوە، کیژۆڵە ناسکەکان بە پاچ و زەنگن لە زەوی شێداری نزیك خۆیان هەڵیانکەندووە، وەك دیوارێکی چکۆلە هەر ماوە و با و ڕەشەبا تەختی نەکردووە.

دیاره شاعیر یادی ئەو ڕۆژە دەکاتەوە کە ئەو کچ و کوڕە هەرزانە زۆر بە شەوقەوە کاریانکردووە بە دەست و بە چاو هانی یەکتریانداوە بۆ ئەو تۆزە دیوارە و زۆر خۆیان پێوە ماندوو کردووە، بەڵکو چەندین ڕۆژیان بۆ داناوە، چونکە تەنها بیانوو بووە.

خَلَّـتْ سَـبِيلَ أَتِـيّ كَـانَ يَحْبِسُـهُ    وَرَفَّعَتْـــهُ إِلى السِّـــجْفَيْنِ فَالنَّضَـــدِ

خلت: بەری گرت، اتی: جۆگەلەی بچووکی بەرماڵ، يحبسە: ڕايگرت، رفعتە: بەرزی كردەوە، السجفين: دوو پەردەی بەر دەواری ماڵ كە لە چيخ و زەل پێكدێ، التضد: هەرزاڵە و كونەلانی ناو ماڵ و بەرماڵ.

دەڵێ: ئەو كيژۆڵەيە زۆر چالاك و ئازا و بە دەست و گورج و گۆڵە، لەبەر جۆگەلەی بەرماڵ حەوزێكی بچووكی درووستكرد و ماوەی نەدا ئاوەكە بڕوا و لە نزيكەوە چاڵی هەڵكەند و قوڕی گرتەوە و بەرماڵی سواقدا و شوێنی هەردوو دەرگای دەوارەكەی هێلەساوەدا و شوێنی مەشكە و كونەی بەرماڵی بەرزكردەوە، هەتا شۆڕاوگەی ئاوی هەرزاڵەی كونە و مەشكە نەچێتەوە، ئەوە دووبارە دۆبلاجكردنی يادی شاعيرە.

أَضْحَتْ خَلاَءً، وَأَضْحَى أَهْلُهَا احْتَمَلُوا     أَخْنَى عَلَيْهَا الَّذِي أَخْنَى عَلَى لُبَدِ

أضحى: دەمەوبەيانی بارو كۆچ، خلاء: چۆڵ، إحتملوا: باريان كرد، أخنى: وێرانی كرد و لە ناوی برد، لُبد: ناوی دوا هەڵۆی لوقمانی عادە، كە حەوت هەڵۆ بوون، تەمەنی زۆر بووە هەتا دووسەد ساڵ بە مەرگی (لوبەد) و (ئوم حەكيم) مردووە.

دەڵێ: ئەم هەوارە چۆڵ و هۆڵە و كەسی تێدا نەماوە و باريان كردووە، ئەوەی هەڵۆی (لوبەد)ی لوقمانی لەناو برد ئەم هەوارەشی كاول و وێران كردووە، بە مەبەستی ئەوميە كە چەرخ و زەمەن شەو و ڕۆژ شوێنەوار كوێر ئەكاتەوە.

فَعَدِّ عَمَّا تَرَى إِذْ لاَ ارْتِجَاعَ لَهُ     وَانْمِ الْقُتُودَ عَلَى عَيْرَانَةٍ أُجُدِ

عدّ: وازبێنە، دەستی لێ هەڵبگرە، ارتجاع: گەڕانەوە بۆ دواوە، إنم: بەرز بکەرەوە، القتود: داری باری وشتر، عیرانة: وشتری وەك گاکێویی بەرز و بەهێز، أجد: پشتپان و بڕبڕەقایم.

دەڵێ: ڕوو لە خۆی دەکات و پێی دەڵێ: دەوازبێنە لەو ئاسەوار و کەپرەی جێماوە، چونکە ئەو ڕۆژەی ئەوانەی تێدا ئەنجامدراوە ناگەڕێتەوە، دەست هەڵگرە لە ڕاوەستانی وشترەکان، کە دەڵێی گاکێویی بەرەڵای چیایە و بەهێزە و شان و مل و پشتی پتەو و قایمە و کاروباری سەفەری خۆتی پێ ئەنجامبدە، چیتداوە لەم هەوارە کۆنە!؟.

مَقْذُوفَـةٍ بِـدَخِيسِ الـنَّحْض بَازِلُهَـا     لَـهُ صَـرِيفٌ صَـرِيفَ الْقَعْـوِ بَالْمَسَـدِ

مقذوفة: قەڵەو و گۆشتن و چاخە، بدخیس: چین لە چین، بەز و گۆشتی لەسەریەك داناوە، النحض: گۆشت، بازل: گەورە، الصریف: شەش دەنگی ولاخی ماندوو، ئەگەر مێ بێ، بەلام ئەگەر نێر بوو نیشانەی چالاکیی و ماندوو نەبوونە، القعو: خەڕەك و تەشیبەن و خوری ڕێسراو، المسد: گوریس، حەبل.

دەڵێ: ئەو وشترەی من زۆر بەهێزە، بە توانایە، قەڵەوە، ئەڵێی گۆشتی پێدا داکوتراوە، کە کاوێژ ئەکات جیڕەی ددانەکانی دێت و ئەڵێی دەنگی خەڕەك و تەشییە کە دەخولێتەوە و چالاکیی لە ڕادەبەدەرە، وەك تەشیی بە دەوری خۆیدا ئەسوڕێتەوە.

كَـأَنَّ رَحْلِـي وَقَـدْ زَالَ النَّهَـارُ بِنَـا     بِـذِي الْجَلِيـلِ عَلَـى مُسْـتَأْنِسٍ وَحَـدِ

رحل: وشتر، زال: خۆرلادان لە نیوەڕۆدا، ذی الجلیل: شیوێکە لە مەککە، مستأنس: گاکێویی، وحد: تاك.

دەڵێ: لەم سەفەرەمدا لەسەر وشترێك دەڕۆم لە قوڵەی گەرمای نیوەڕۆدا، لەناو شیوی جەلیلدا لە نزیك مەککە، دەڵێی گاکێوییە بەملاولادا دەیڕوانی بۆ سەروخوار و ترسی دوژمنی هەیە و حەزی لە ئاوەدانیی نییە و تەنها ڕێگە ئەبڕێ.

لەناو عەرەبی ئەو ڕۆژەدا ئەم جۆرە گیاندارە زۆر گەورە و بە توانا و تیژڕەو بووە، بە تایبەتی لە شیوەکانی مەککە و دەوروبەری، لەبەر ئەو وشترە کەسی چواندووە بەم حەیوانە چیانشینە.

مِنْـوَحْشِ وَجْـرَةَ مَوْشِـيِّ أَكَارِعُـهُ    طَاوِي المَصِيرِ كَسَيْفِ الصَّيْقَلِ الْفَـرَدِ

وحش: کێوی، وجرة: ناوی بیابانە، موشیّ: ڕەنگاو ڕەنگ، أکارع: چوار پەل، طاوی المصیر: ژێرسك بەناودا چوو، الصّیقل: هەسان کە تێغی پێ تیژ دەکرێ، الفرد: بێ وێنە و بێ نەزیر.

دەڵێ: ئەم وشترەی من لەم ڕۆیشتنەیدا وەك ئەو گاکێوییە وابوو لە حەیوانە کێویی و یاخییەکانی بیانی وەجرەیە، کە چوارپەلیان ڕەش و سپی و ڕەنگاو ڕەنگن و نەخش و نیگارکراون و لەبەر زۆر ڕاکردن بە دوای هاوسەرەکانیاندا، ناوسك و ژێرەوەیان چووە بە ناودا و ساف بووە و سپی و بریقەدارە، ئەڵێی شمشێری تازە ساودراوە و بێ وێنەیە لە جوانیدا.

(ئەم جۆرە دیمەنە بۆ مرۆڤی ئەو سەردەمە زۆر جوان و دڵڕفێنە و سەرنجی گوێگر ڕائەکێشێ، چۆن ئەم دیمەنەی کێشاوە وەك لەبەرچاوی

بێ، چواندنی دوو شتی بینراوە بەیەك، وەك ئێمەی كورد ئەڵێین ئەو شۆخە ئەڵێی كەڵەكێوییە یان ئاسكە).

سَـرَتْ عَلَيْـهِ مِـنَ الْجَـوْزَاءِ سَـارِيَةٌ تُزْجِـي الشَّـمَالُ عَلَيْـهِ جَامِـدَ الْبَـرَدِ

سرت: ڕێژمنەی كردووە، ڕەهێڵەی كردووە، جوزاء: ناوی ئەستێرمیەك لە بیست و هەشت ئەستێرە و بە گومانی عەرەب، باران ئەوانە دەیبارێنن بەسەر زەویدا و جەوز لە هەموویان زیاتر باراناوییە، سارية: هەوری گەڕۆك و باراناویی، تزجی: دەهاژوێ، دەنێرێ، الشمال: بای شەماڵ و سروەی فێنك، جامد: سەهۆڵی بەستوو، البرد: تەرزە.

دەڵێ: ئەم گاكێوییە لەم دەشتەدا زۆر بە پەلە دەڕوا و هەوری گەڕۆك و ئاوس بە باران شۆردویەتی و سەروملی ساف و تەڕ كردووە، خۆی گۆشتی سارد و بارانیش لە سەری باریوە و بای شەماڵ و سروەی باكوریش تەرزەی باراندووە بەسەر پشت و سەروملیدا.

جا وەرە ئەم حەیوانە چەند ساف و بێ گرێ و پاك و خاوێن بێ و فێری جۆرە كەش و هەوایەك بێت، وشتری مام و شەوكوێر بەو جۆرە بووە!.

فَارْتَاعَ مِنْ صَوْتِ كَلاَّبٍ، فَبَـاتَ لَـهُ طَوْعُ الشَّوَامِتِ مِنْ خَوْفٍ وَمِنْ صَرَدِ

إرتاع: ترساوە، زراوی تەقیوە، صوت: وەڕە و دەنگ، كلاب: سەگەوان، خاوەن سەگی ڕاو، یان ڕاوچییەك سەگی ڕاوی هەبێت، بات: لە شەودا، طوع: بەگوێكارە، الشوامت: چوارپەلی حەیوان، یان ڕاوچی دوژمن، خوف: ترس، صرد: سەرما.

دەڵێ: ئەم گاکێوییە زۆر بە پەلە غار ئەدا، هۆکاری پەلەکردن و ڕاکردنی خێرای دەگەڕێتەوە بۆ چەند شتێك، یەك لەوانە: ترسی ڕاوچی دوور هەیە و وەڕەی سەگی تالیمدراوی ڕاو کە بە دوایەوەبن، دوو: باران و تەرزە و تەڕیی لەش و بەدەنی.

(جا وەرە گاکێوی ترست هەبێ و سەگ بە دواتەوە بێت و تەڕ بیت و سەرمای باران و تەرزە لە بەدەنت بدات و کاری کردبێ، ئەبێ چۆن غار بدات لەو شیو و دۆڵ و تەن و بێ دار و بێ دەوەن و بێ پەنایە، بە ڕاستیی وێنەیەکی دەگمەن و جوانی ئەو کاتەیە).

فَبَثَّهُنَّ عَلَيْهِ، وَاسْتَمَرَّ بِهِ      صُمْعُ الْكُعُبِ بَرِيئَاتٌ مِنَ الْحَرَدِ

بثهنّ: پرش و بڵاوی کردووەتەوە، استمرّ: لە سەری ڕۆیشت، الصمع: چوار پەلی وڵاخ بە لەڕیی و باریکیی، کعوب: پاژنەی سمی حەیوان، بریئات: دوورە، الحرد: خاویی و نەرمیی.

دەڵێ: ئەوجا باسی وشترەبۆرە کە هەردوو دەست و هەردوو قاچی بڵاو دەکاتەوە و چوار ناڵە غار ئەڕوا بە ڕێگەدا و لەسەریان ڕێگە ئەبڕێ، نەرمی قاپارە و پاژنەکانی دوورە لە خاویی و نەرم و شلی بەڵکو پتەوە و مەحکەم لە زەوی دەدا، مەبەستی ئەوە ئەم وشترە هەرچی بیماریی و سەقەتیی و نەخۆشیی هەیە بۆ وشتر لەم وشترەدا نییە، لە ڕاستیدا چوار پەل بۆ وشتر وەك تایەی ماشین وایە، عەیبی هەبێ ڕێگەی پێ نابڕێ، هەندێ نەخۆشیی بۆ سمدار هەیە، وەك (تەبەق) کە ناوی سم زامارە و وشتر و گا لەپێ ئەخات، یان (پەی زەن) کە هەردوو ئەژنۆی دواوە لەیەك دەدەن، ئەم وشترە دوورە لەو نەخۆشیانە، یان مەبەست ئەوەیە کە ڕاوچی

سەگەلەكانی بەرداوە كە ئەم گاكێوییە و ڕاوی ئەنێین بە سەر و بە خواردا، ئەو گایەش كە سەگ بە دوایەوە بوو ترسی زیاترە، بەلام چوارپەلی ئەم گایە ساق و سەلیم و بێ عەیبە و نەخۆش نییە و بیماری تایبەتی ئەم حەیوانە كە تەبەق و پەیزەن و ناوسم زامارییە، ئەوجا بزانە تانجی ڕاوچی ناگات بە قولیا.

فَهَابَ ضُمْرَانُ مِنْهُ حَيْثُ يُوزِعُهُ    طَعْنُ الْمُعَارِكِ عِنْدَ الْمُجْحَرِ النَّجُدِ

هاب: ترسا، ضمران: ناوی سەگێكی دیارییە، مِنْهُ: لە گاكێوییەكە، یوزعە: هانی ئەداو تێی بەرئەدا، طعن: لێدان، المعارك: ئازا، چالاك، جەنگاوەر، المجحر: پەناگە، التجد دەستوەشێن و پالەوان.

دەڵێ: كە سەگەكان پەلاماری گاكێوییەكەیاندەدا، سەگی زۆر دڕ و ئازایان ناوی زەمران بوو، زۆر ئەترسا لە گاكێوییەكە لەوكاتەی كە ڕاوچی دنەی ئەدا و هانی ئەدا بۆ قەپگرتن لە گاكە، بەلام دەستوەشاندنی گاكە لە دەستوەشاندنی شەڕكەرێكی ئازا لە پەنگاكەدا و ماوەی زەمرانی نەدا.

شَكَّ الْفَرِيصَةَ بِالْمِدْرَى فَأَنْفَذَهَا    شَكَّ الْمُبَيْطِرِ إِذْ يَشْفِي مِنَ الْعَضَدِ

شكَ: لێیدا، وەشاندی، الفریصة: ناوشان، المدری: شاخ، أنفذها: بردی بە ناودا، المبیطر: بەیتاڵ، پزیشكی حەیوان، شیفی: تیمار ئەكات، العضد: زامی باسك و باڵ كە خوێنی لێ ئەگیرێ.

دەڵێ: ئەو گاكێوییە نەبەرد و ئازا پەلاماری سەگە بۆری دا، كە ناوی زەمران بوو، شاخی كرد بە ناوشانیدا، ئەو شوێنەی زاماركرد كە بەیتاڵ

تیماری نەخۆشی ئاژەڵی پشت و ناوشانی پێ ئەكات، وەك چۆن بەیتاڵ ئەزانێ خوێن لە كوێ ئەگرێ، ئەو گاكێوییە ئەیزانی شاخ لە كوێ ئەدا.

جا وەرە ئەم وێنە تەماشاكە وێنەی گاكێویی ناو چیا و چۆڵ و یاخی لە هەموو بوونەوەرێكی دژ بەم حەیوانە و كۆمەڵی سەگی هار و شەڕانی لەلایەن ڕاوچییەكی شارەزاوە هاندرابێ لەو گایە و لە پەناگایە پشتی كردبێ لە پتەوێ و بە شاخەكانی كە لە ڕم تیژترە و لە سەگان دەسرەوێ و زاماریان دەكات، وەك پزیشكی بەیتاڵ شارەزایە كوێی زامار ئەكات.

كَأَنَّــهُ خَارِجــاً مِــنْ جَنْــبِ صَــفْحَتِهِ     سَــفُّودُ شَــرْبٍ نَسُــوهُ عِنْــدَ مُفْتَــأَدِ

خارجاً: لە دەرەوە، جنب: لاصفحة: كەللەی سەری ولاخ، سفود: شیشی سووركراوە بە ئاگر، شرب: تاقمی مەیخۆر لە كۆڕدا، یان سیخی گۆشت برژاندنی عەرەقخۆر لەسەر مەقەڵیی پڕ لە پشكۆ، مُفتأد: مەقەڵیی و ئاگردان.

دەڵێ: شاخی ئەم گاكێوییە كە لەملاوئەولای كەللەسەرییەوە دەرچوون و سووربوونەتەوە و گەرم و تیژە و پلەگۆشتی سەگە پەلاماردەرەكانی پێوەیە، ڕێك ئەڵێی سیخی سووركراوە و پلەگۆشتە و لەسەر ئاگری مەقەڵیی دانراوە.

كەبابخانەیەك لەو جەنگەڵە دروست بووە، ڕاوچی ئەیەوێ گۆشتی گاكێویی بكات بە شیشی گۆشتبرژاندندا، بەڵام ئەو گاكێوییە كارەكەی پێچەوانە كردووەتەوە، هەردوو شاخە تیژەكانی كە لە كەللە سەری گاكەوە دەرچووە وەك شیش سووربووەتەوە و پلەگۆشتی پشتی سەگی ڕاوی پێوە كراوە و لەسەر مەقەڵیی پڕ لە پشكۆكە كەللەسەرەكە داناوە.

فَظَـلَّ يَعْجُـمُ أَعْلَـى الـرَّوْقِ مُنْقَبِضـاً    فِي حَالِكِ اللَّوْنِ صَدْقٍ غَيْـرِ ذِي أَوَدِ

يعجمُ: ئەیجویّ، الروق: شاخەكە، منقبض: ناڕەحەتـە، ئیّش و ئازاری، حال: ڕەش، صدق: زۆر ڕەق، أود: لاریی و خیّچیی.

دەڵیّ: سەگە بۆرە بەسەر شاخی گاكەوە لەگەڵ ئەوەی ناڵە و قوزەی هەیە لەبەر ئیّش و زامی سەخت قەپی لە شاخیّكی ڕەش و ڕەق و بیّ گریّ و لاروخیّچ گرتووە، بەڵام بیّ سوود بوو، چونكە گاكیّوییەكە شاخی كردبوو بە لەشی سەگەكەدا، ئەگەر چی ئەویش قەپی گرتبوو لە شاخی، بەڵام شاخەكە ڕەق و بیّ گریّ بوو، كەڵبەی سەگەكە كاری نەدەكرد لە شاخەكە.

كیّشانی ئەم ویّنەیە ئەوە دەگەیەنیّ ئەم شاعیرە زۆر نزیك بووە لە ڕوداوەكەوە و بە چاوی خۆی ئەم دیمەنەی ویّنە كیّشاوە و لە چوار چیّوەی ئەم بەیتەدا ویّنەی كیّشاوە، یان هەر خۆی ڕاوچی بووە، چونكە ئەوەندەی ڕمبازیی و شمشیّر وەشاندن باو بووە هیّندەش دەست و برد لە ڕاودا نیشانەی نەبەردیی بووە.

لَمَّـا رَأَى وَاشِـقٌ إِقْعَـاصَ صَـاحِبِهِ    وَلاَ سَـبِيلَ إِلَـى عَقْـلٍ وَلاَ قَـوَدِ

واشق: ناوی سەگیّكی دیكەیە لەو گەڵەسەگەی پەلاماری گاكەیانداوە و ئیّستە زەمران بەسەر شاخی گاكەوەیە، إقعاص: مەرگ و گیاندەرچوون بە پەلە، سبیل: ڕیّگە، عقل: خویّنوەرگرتن لە كاتی كوشتنی كەسیّك، یان تۆڵە هەیە، یان خویّن كە پارە و وشترە، قود: تۆڵە و قیساس.

دەڵێ: لەو کاتەی واشق کە سەگێکی دڕ و ئازای ڕاوچییە بە چاوی خۆی هاوڕێکەی بەسەر شاخی گاکێوییەکەوە بینی و مردنی زۆر بە پەلەی چاوەڕوان دەکرد، چونکە شاخی گاکە چووبووە ناو هەناوی، ئەمیش داماو بوو، نەیدەزانی چ بکات، توانای نییە داوای خوێنی لێ بکات و سوڵح بکەن بەشێکیان تۆڵەی لێ بکاتەوە، چونکە خوێنی ئەم سەگە بە واشق ڕەوا نییە، ئەبێ خاوەنەکەی وەریگرێ، زات و زۆریشی نییە کە تۆڵە و قیساسی لێ وەرگرێ، لەوە ئەچێ هەر قووزە و نووزەی هەبووبێ.

قَالَتْ لَهُ النَّفْسُ: أَنِّي لاَ أَرَى طَمَعَاً    وَإِنَّ مَوْلاَكَ لَمْ يَسْلَمْ وَلَمْ يَصِدِ

دەڵێ: سەگەکە کە ناوی واشق بوو وەك لە کوردیدا ناوی سەگە بۆرە، بازە، قەلاش و ناوی تر هەیە لەناو عەرەبیشدا، زەمران و واشق هەیە، ئەو سەگە لە دەروونی خۆیدا گفتوگۆی دەکرد و خۆی بە خۆی دەگوت: وا نازانم بتوانم ڕزگاری بکەم، یان خۆی لە مەرگی چاوەڕوانکراودا ڕزگار بکات و سەگە هاوسوێنەکەش کە لە دوورەوە ئەوەڕێ ئەویش بە سەلامەتیی دەرچوونی نییە و پاش تۆ لەوانەیە پەلاماری هاوڕێکەت بدات و ئەم ڕاوەمان بە نسیب نەبوو.

ئەم وێنەیە کە شاعیر کێشاویەتی بۆچونی خۆیەتی، دەنا ئەم چۆن دڵی ئەو سەگەی خوێندەوە کە ناتوانێ ڕزگاری بکات، یان تۆڵەی وەربگرێ، لەوانەیە وشەی (مەولا) بە مانای خاوەن، ئاغا، ڕاوچی لێکبدرێتەوە، ئەوکاتە دەڵێ: من توانام نییە و خاوەن خۆیشی ترسی هەیە و ئەم ڕاوەی بە نسیب نەبووە.

فَتِلْــكَ تُبْلِغُنِــي النُّعْمَــانَ" إِنَّ لَــهُ    فَضْلاً عَلَى النَّاسِ فِي الأَدْنَى وَفِي الْبَعَدِ

بەخێربێیتەوە شاعیر!، تازەبەتازە دێتە سەر باسی سەفەرەکەی بۆ لای نوعمانی کوڕی مونزیر، بە سواری ئەو وشترە نازدارە کە ئەم چۆڵ و بیابانە ڕاوە گاکێویی و شەڕە سەگی بینیوە و دەڵێ: بەم وشترە، بەم جۆرە کەشتییەی بیابان دەچم  بۆ لای نوعمان، چوون بۆ لای ئەم سەرەککۆمارە ئەرکی هەمووانە، چاکەی زۆرە، بەخشندەیە، دەستگوشادە، نەك بەسەر شاعیرەوە، بەڵکو بەسەر هەموو خەڵکی ناوچەکەوە، نزیك بن وەك خێڵ و هۆزی دەوروبەری خۆی و ئەو خێڵانەی لەژێر فەرمانیدا دەژین، یان دەوروبەرمان، ئەوانیش چاکە و مەردایەتیی ئەم پادشایان لەبەرچاوە.

(من بڕوام وایە ئەگەر عەرەب بیانیپەرست نەبوونایە و گوێڕایەڵی گەورەی خۆیان بوونایە لەو زەمەن و سەردەمەدا بۆ ئێستەیان دەبوو بە مێژوو، بەڵام بەداخەوە وانەبوون).

وَلاَ أَرَى فَـاعِلاً فِـي النَّـاسِ يُشْـبِهُهُ    وَمَـا أُحَاشِـي مِـنَ الأَقْـوَامِ مِـنْ أَحَـدِ

دەڵێ: ئەم پادشایە زۆر گەورەیە، بەخشندەیە، چاکەی هەموو لایەکی گرتووەتەوە، دوور و نزیك سوودمەندە لەم مەردە سەرکردەیە، کەس گومان نابات وەك ئەم وابێ و هاوشان و هاوتای بێ، لەم بڕیارەمدا کەس نابوێرم و کەس جیاناکەمەوە، بڵێم جگە لە فلانەکەس!.

إِلاَّ سُــلَيْمَانَ إِذْ قَــالَ الإِلَــهُ لَــهُ:    قُمْ فِـي الْبَرِيَّـةِ فَاحْـدُدْهَا عَـنِ الْفَنَـدِ

البرية: خەڵك، مرۆڤ، أحدد: بیپارێزە و دووری بخەرەوە، الفند: هەڵە، لادان، سەرپێچیی.

دەڵێ: كەس نابوێرم كە لەم پادشا و مەلیكەی من باسی ئەكەم، جگە لە حەزرەتی سولەیمان پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت)، كە مرۆڤ و دێو و جنۆكە و باڵندەی بۆ دانرابوو، كە لەژێر فەرمانیدابن و خودا فەرمانی پێدا بۆ خەڵك لە بتپەرستیی و ڕۆژ پەرستیی و مرۆڤپەرستیی دوور بخاتەوە، دیارە ئەم بیروباوەڕەی شاعیر زۆر جیاوازە لە بیروبۆچوونی جنۆكان كەلایاندابوو، لەم پێغەمبەرە مەزنە پادشایە.

وَخَيِّسِ الْجِنَّ" إِنِّي قَدْ أَذِنْتُ لَهُمْ    يَبْنُونَ تَدْمُرَ بالصُّفَّاحِ وَالْعُمُدِ

خیّس: موسەخەرێكە، لەژێر باراندا كاریان پێ بكە، چونكە ئەم بوونەوەرە توانای بێ سنووریان هەیە، أذنت: ماوەمانداون و هێزمان پێداون، تدمر: شارێكە لەناو جەرگەی بیابانی سوریەدا، نزیك شاری (حمص)، ناوی بووكی بیابان بوو، ئیمپراتۆری ڕۆما داگیری كرد و وێرانی كرد، ساڵی دووسەد و حەفتا و دووی زاینی و لە ساڵی شەش سەد و سی و سێ، خالیدی كوڕی وەلید داگیری كرد، الصفاح: گابەردی گەورەی درێژ، كە نەقاری كرابێ و لە چینی دیواری كۆشكی كۆن یان پردی درێژ دانراوە، العمد: پایەی گەورە.

دەڵێ: خودا فەرمانیدا بە حەزرەتی سولەیمان پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێت)، كە جنۆكە و دێوم بۆ مسەخەر كردووی كە دووریی و هێز و توانام پێداون كە شاری تەدموور دروست بكەن و لەناو بیاباندا شارێك

دروست بکەن بۆت بۆ ئەوەی فەرمانڕەوایی هەموو جیهان بکەیت و خەڵك لە بتپەرستیی و مرۆڤپەرستیی ڕزگار بکەیت.

فَمَـــنْ أَطَـــاعَ فَأَعْقِبْـــهُ بِطَاعَتِـــهِ    كَمَـا أَطَاعَـكَ وَادْلُلْـهُ عَلَـى الرَّشَـدِ

دەڵێ: خودای سولەیمان فەرمانی پێدا ئەوەی بە فەرمانی تۆ بکات تووشی پاداشتی بە ئەندازەی بەجێهێنانی فەرمانەکە بدەرەوە، چۆن ئەو بە فەرمانی تۆ هەستاوە، تۆش پاداشتی بدەرەوە، چونکە ئەوەی بە فەرمانی پێغەمبەر هەڵسوکەوت بکات، بە فەرمانی خودا هەستاوە، ئەو پێغەمبەرە فەرمان بە چاکە و نا لە خراپە دەکات، ئەوجا ڕێنومایی بکە و ڕابەری بە بۆ ڕێگەی چاك و پاك، ئەم بەیتە بە شێوەی ناڕاستەوخۆ بە نوعمان دەڵێ: جەناب! تۆش وەك ئەو ڕەوانەکراوەی خودابە بۆ فەرمان بە چاکە و نا لە خراپە، فەرمان و ڕێنمایی بکە و پەلە مەکە لە سزادانی بێ گوێ و نا فەرمانیی.

وَمَـــنْ عَصَـــاكَ فَعَاقِبْـــهُ مُعَاقَبَـــةً    تَنْهَى الظَّلُومَ، وَلاَ تَقْعُـدْ عَلَـى ضَـمَدِ

دەڵێ: ئەوەی بێفەرمانیی کردی سزای بدە بە گوێرەی تاوانەکەی، بۆ کەتن سزای خۆی و بۆ تاوان سزای خۆی و بۆ نەزان و نەفام ڕێنمایی و ئامۆژگاریی، بەڵام بۆ هێرشکار و ستەمپیشە و ملهوڕ، سزای وای بدە کە جارێکی تر نە خۆی و نە خەڵکی تر نەتوانن کاری لەو جۆرە بکەن و هەرگیزیش ڕق و کینە لە کەس هەڵمەگرە، چونکە پیاوی گەورە دەبێ دڵفراوان بێت و جێگەی ڕقی تێدا نەبێتەوە، ئەوە یەکێکە لە پایەکانی

فەرمانڕەوایی، بە تایبەتی ئەگەر لەسەر هاوزمان و هاونیشتمان و هاوڕەگەزی خۆی بن.

إلاَّ لِمِثْلِكَ أَوْ مَنْ أَنْتَ سَابِقُهُ    سَبْقَ الْجَوَادِ إِذَا اسْتَوْلَى عَلَى الأَمَدِ

دەڵێ: ئەو پاداشت و سزایە بۆ هەموو کەس تەنها بۆ ئەومیە وەك تۆ ڕێیان لەپێشە و پێشبڕکێ دەکەن لە نێوان سواری مەیدانی ڕمبازیی، ئەوە چەندە زۆر بڕۆی بۆ تۆ باشە.

وَاحْكُمْ كَحُكْمِ فَتَاةِ الْحَيِّ إِذْ نَظَرَتْ    إِلَى حَمَامٍ سِرَاعٍ وَارِدِ الثَّمَدِ

فتاة: کچ، کیژی تازە پێگەیشتوو، نظرت: تەماشای کرد، حمام: بڕە کۆترێك، سراع: توند و بە پەلە دەڕۆیشتن، الثمد: ئاوێکی کەم.

دەڵێ بە پادشاکەی: گەورەم، جەناب، ئەگەر ویستت بڕیارێك، فەرمانێك بدەیت، دەبێ زۆر بیری لێ بکەیتەوە و سەروژێری بکەیت و هەر چوار کاری ژمێریاری لەگەڵدا بەکاربێنی، (لێکدان، دابەشکردن، کۆکردنەوە، لێدەرکردن)، وەك ئەو کیژە چاو تیژە، بیر تیژە، تەماشای پۆلێ کۆتری دەکرد کە بە ئاسماندا دەفڕین بۆ سەر ئاوێکی تەنکاو.

قَالَتْ: أَلاَ لَيْتَمَا هَذَا الحَمَامُ لَنَا    إِلَى حَمَامَتِنَا، وَنِصْفُهُ فَقَدِ

گوتی: خۆزگە ئەم ڕەوەکۆترە هی ئێمە بوبایە و لەگەڵ کۆترەکانی ئێمەدا بوایە، ئەم کۆترانە و نیوەی ئەم کۆترانە و کۆترەکەی خۆمان هینی ئێمە بوایە، ئێمە ئیتر بەسمان بوو، پێویستیمان بە کۆتر نەدەبوو.

يَحُفُّــــهُ جَانِبَـــا نِيـــقٍ وَتُتْبِعُـــهُ      مِثْلَ الزُّجَاجَةِ لَـمْ تُكْحَـلْ مِـنَ الرَّمَـدِ

يحفّهُ: له نزيك چياكەوه دەهاتنه خوارەوه، نيق: چياى بەرز، الزجاجة: شووشه، لم تكحل: كلى تێدانەكرابوو، الرّمد: چاوئێشه.

دەڵێ: ئەو پۆلەكۆتره لەسەر چياكەوه هاتنەخوارەوه بە پەلە و ئەم كیژه بە چاوێكی وەك ئاوێنە و شووشە پاك و بێ گرێ و بێ نەخۆشیی و چاوی خۆی بە كل نەڕشتبوو لەبەر چاوئێشه، چاوێكی تیژ، شەش لەسەر شەشی ئەمڕۆ بۆ كۆترەكانی دەڕوانی و زۆر بە ئاسانی هەموویانی ژمارەكرد و لەگەڵ كۆترەكانی خۆیان كۆیكردەوه و ژمارەیەكی بۆ دەركەوت كە ڕاست دەرچوو.

مەبەستی ئەوەیە پادشا و میری وڵات دەبێ هەر كارێكی كرد سەر و ژێری بخوێنێتەوه و حیسابی هەموو شتێ بكات و ئەوجا حوكم بدات، لە گۆترە حوكم نەدات، بە ڕاستیی ئەوه حیكمەته، ژیرییه لەوكاتەدا شاعیر باسی كردووه ڕامیاریی ژیرانه بووه.

فَحَسَّبُوهُ فَـأَلْفَوْهُ كَمَـا حَسَـبَتْ      تِسْعاً وَتِسْعِينَ لَـمْ تَـنْقُصْ وَلَـمْ تَـزِدِ

حسّبوه: ژمارە دەكرا، ألفوه: بۆیان دەركەوت، حسبت: وەك حسابی كیژەكە بوو.

دەڵێ: كاتی ئەو پۆلە كۆترەیان بە ئاهیستە ژماركرد بۆیان دەركەوت كە ئەو بڕەكۆترە ئەوەندە كۆتر بوون.

فَكَمَّلَـتْ مِائَـةً فِيهَـا حَمَامَتُهَـا      وَأَسْـرَعَتْ حِسْـبَةً فِـي ذَلِـكَ الْعَـدَدِ

دەڵێ: بەو حیساب و ژمارەی کە داینابوو، ژمارەی کۆترەکان بۆ سەد کۆتر و بەو گورجیی و پەلەیە ئەو پۆلە کۆترەی ژمارد و هەڵەی تێدا نەکرد و بێ کەم و کورپی و بێ زیادە، بەم شێوەیە ئەو کۆترەی بۆ سەرئاو دەرچوون ژمارەیان شەست و شەش کۆتر بوو و نیوەی بۆ زیاد بکەیت کە دەکاتە سی و سێ کۆتر، ئەم دوانە کۆکەرەوە، دەکاتە نەوەدونۆ کۆتر، کە لەگەڵ یەك کۆتری ئەم کیژە دەکاتە سەد کۆتری تەواو، دەبێ حوکمی حاکم بەم شێوەبێ.

أَعْطَــى لِفَارِهَــةٍ حُلْــوٍ تَوَابِعُهَــا  مِـنَ الْمَوَاهِـبِ لاَ تُعْطَـى عَلَـى نَكَـدِ

أعطى: بەخشی، فارهة: وشتری زۆر جوان و ڕەسەن و شیرین، حلو توابعها: بەچکە وشترەکان زۆر شیرین و جوان بوون، المواهب: خەڵات و بەرات و بەخشندەیی، نکد: دڵی لە شوێنان نەبوو و پەشیمان نەبوو لە بەخشینی.

دەڵێ: من ئەم پادشایەم وا بەرچاو کەوتووە کەس وەکو ئەم دەستگوشاد و بەرچاوتێر نەبووە لە بەخشندەییدا، کەس وەك ئەم نەبووە، سەدان وشتری جوان و پاك و بە نرخ لەگەڵ بێچوە جوانەکانیان لەخەڵاتدا کە دەیدا بە شاعیر و داواکاری ناو کۆشك، کە ئەو بەخشندەیی هەبوو هەرگیز چاو لە شوێنی ئەو بەخشندەییەی خۆی نەدەبوو، ڕەزیلی تێدا نەدەکرد، حاتەم لەچاویدا ئەشعەب بووە!

ئەم جۆرە زیادەوتنە لە خەڵات و بەراتی ئەو میر و پادشایانە، وەك شاباشی زەماوەندی کوردی دێتە بەرچاو کە لەکاتی ڕەشبەڵەکدا دەهەزار دینار دەدا، بەڵام هەزار حیسابە.

الْوَاهِـــبُ الْمِائَـــةَ الأبْكَـــارَ زَيَّنَهَـــا     سَـعْدَانُ تُوضِـحَ فِـي أَوْبَارِهَـا الْبَـدِ

الواهـب: بەخشـندە، الأبكـار: وشـتری مـێ، زیّنهـا: قەڵـەوی کردبـوون، سعدان: دڕکی وشترخۆر کە چاکترین ئاڵفە بۆ وشتر، توضـح: نـاوی شـوێنە، اوبـار: کـورگ و تـوك و خـوری وشـتر بـە تایبـەتی، اللبـد: تێکئـاڵاو و لەیەکپێچراو لەبەر ئەوەی نە سواری بوون و نە باریان لێبار کردووە.

دەڵێ: ئەم پادشایە لەو گەورە بەخشندە و پیاوانەیە کە سەد وشتری مـێ دەبەخشـێ و ئـەو وشـترانە تایبەتـە بـە ڕەوی مەلیکـەوە و هەمیشـە خواردنی گەڵای درەختی سـەعدانە کـە وشـتر زۆر زوو قەڵـەو دەکات، ئـەو وشترانە لەبەر ئـەوەی کـەس سواریان نـابێ و بارنـاکرێن خـوری و تـووکی لەشـیان لەیـەك ئـاڵاوە و وەك لـەباوی لێ هـاتووە، ئـەم سـەد وشـترە بـەکێ دراوە، دیار نییە؟.

بەڵام شاعیر مەدحی پادشا ئەکات بە ڕاست یا زیادەڕۆیی.

وَالسَّـاحِبَاتِ ذُيُـولَ الْمِـرْطِ فَنَّقَهَـا     بَـرْدُ الْهَـوَاجِرِ كَـالْغِزْلاَنِ بِـالْجَرَدِ

الساحبات: کەنیزەکی کراسشۆڕ، بەدوای خۆیـدا ئەیکێشـێ، چونکە لـەو کۆشکەدایە، ذیـول: دێـوان، پـەراوێزی کـراس، المـرط: کراسـی ناسـك، فنـق: نەرم و ناسکی کردووە، خۆشی کردووە، برد: فێنکیـی و ساردیی، الهواجر: گەرمای نیوەڕۆی وڵاتی عەرەب، الجرد: ڕوتەنی دەشتودەر.

دەڵـێ: بەخشـندەیی و دەستگوشـادیی و دەهەنـدەیی ئـەم پیـاوە لـە سـنووری تێپەڕانـدووە، لەلایـەك بـە سـەدان وشـتر بـە بەچـکەکانەوە دەبەخشێ، لە لایەکی ترەوە کیژانی کەنیزەکی ناسك و بەنازپـەروەری نـاو

کۆشـك کـە نـە گـەرمای دوورگـەی عـەرەبیی ڕەشـی کردونەتـەوە و نـە کارەکەی و ئیشکردنی زۆر ماندووی کـردوون و پـالێمی کراسـیان لـە ئـەرز ئەخشێ و هەمیشە لە سێبەر و فێنکییدا ژیاون وەك کارمامزی ڕووتـەنیی کە هەمیشە لە خۆشیدا دەژین، ئەم ناسك و نازدارانە دەبەخشێ بە شاعیر و وەزیر و گزیری دەرباری پادشا.

وَالْخَيْـــلَ تَمْزَغَرْبـــاً فِـــي أَعِنَّتِهَـــا     كَالطُّيْرِ تَنْجُو مِنَ الشُّؤْبُوبِ ذِي البَرَدِ

الخیل: ئەسپ و ماین بە کۆمەڵ و بە تاك، تمـزع: زۆر تیـژڕەون، غربـا: بە پەلە و بەلەز و تووندڕەو، أعنة: لەغاو و ڕەشمەیان لەسـەرە، الشؤبوب: هەوری چڕی باراناویی نەرم، بَرَد: تەرزە.

دەڵێ: ئەم پیـاوە بەخشـندەیی تـەنها وشـتر و کـەنیزەك و غـولام نییـە، بەڵکو بەخشندەیی گەیشتووەتە ئەوەی کە ڕەوی ئەسـپ و ماینـەکانی بـە کۆمەڵ و بە تاك دەیانبەخشێ، بەڵام چۆن ئەسپ و ماینی تیژ و ئازا و بە پەلە لەغارکار و مۆچێنراو بۆ سواری و لـەغاو ڕەشمـەیان بـە سـەرەوەیە و ئامادەن بۆ سواری خۆی، وەك چـی؟، وەك ئـەو قـەتێ و کۆترانـەی بـە نـاو هەوری باراناویی و تەرزە بارین چۆن دەدەن لە شەقەی باڵ، ئەم ئەسـپانە وەك با و وەك بۆران ڕێگە دەبـڕن، ئـەو باڵنـدە سووك و باڵدارە چۆن بـۆ خۆڕزگارکردن لە تەرزە دەفڕن، ئەمانیش بەو شێوەیەن.

وَالْـأُدْمَ قَـدْ خُيِّسَـتْ فُـتْلاً مَرَافِقُهَـا     مَشْـدُودَةً بِرِحَـالِ الْحِـيرَةِ الْجُـدُدِ

الادم: وشتری سپی کە دەگمەنە و ڕەسەنە، خیّست: ڕامکـراوە و بـەرباره و فێری بڕینی ڕێگەی دوور کراوە، فتلاً: بـادراوە مەحکـەم، پتـەو، مرافـق:

چوار پەل و لولاقی ئەژنۆ و مەچەکی و بیماری و پەیزەنی نییە، مشدودة: بەستراوە کۆپان و جل و سەر حەبلی، الحيرة: پایتەختی نوعمانە، الجدد: تازە و سفت و نوێ.

دەڵێ: دەهەندەیی ئەم پادشای عەرەبە کە پایتەختی لە حیرەی شام چووەتە ناو ڕەوە وشترەکەی، بەڵام کام ڕەوە وشتر، ئەو وشترانەی کە فێرکراون و تەدریبکراون، ئامادەکراون بۆ بار و بۆ سەفەر، دوورن لە نەخۆشیی وشتر وەك مقا و تەبەقی ژێر سم و پەیزەنی سەر دوو قاچی و چوار پەلی دوورە لە یەکەوە و جل و کورتانی جوانی وڵاتی حیرەی بۆ دوراوە کە ئەوکاتە کۆپاندووری زۆر شارەزای لێ بووە و هەموویان تازەن.

فَـلاَ لَعَمْـرُ الَّـذِي قَـدْ زُرْتُـهُ حِجَجاً     وَمَا هُرِيقَ عَلَى الأَنْصَابِ مِنْ جَسَدِ

فلا: نەخێر، لعمر: بە گیانی، زرتە: دیدەنیم کردووە، حججا: ساڵانێکی زۆر و لەمێژ، هریق: ڕژاوە، سەربڕاوە، الانصاب: بت، ئەو بەردە تاشراوانەی کە هەر هۆزێك وەك خودا بۆخۆیان دایانناون بۆ پەرستنی و قۆچ و قوربانیان بۆ دەکرد، جسد: خوێن، قوربانیی.

دەڵێ: گەورەم من هەرگیز لە ڕووی تۆدا بێ ئەدەبیم نەکردووە، نەخێر، سوێند دەخۆم بە گیانی ئەو کەسەی ساڵانێك لەخزمەتیدا بووم و نان و نمەکەم کردووە و لە بەردەمیدا شیعرم خوێندووەتەوە و سوێندیش ئەخۆم بە گیانی ئەو بتە نازدارانە کە ساڵانە قۆچیان بۆ دەکرێ و قوربانییان بۆ سەردەبڕدرێ و خوێنیان بۆ دەڕێژرێ، سوێندەکە لە دوای ئەم بەیتە دێت کە پاکانە دەکات کە قسەی خراپی بە شا نەگوتووە.

وَالْمُؤْمِنِ الْعَائِـذَاتِ الطَّيْـرَ يَمْسَـحُهَا    رُكْبَـانُ مَكَّـةَ بَـيْنَ الْغَيْـلِ وَاسَّـنَدِ

المـؤمن: پـەنادەر و بەخێوکـەر، العائـذات: باڵنـدەی کۆچـبەر و داوای پەناکەر، رکبان: وشترسواران، مكّه: ناوی شاری کەعبەی پیرۆزە کە لەکاتی نەفامیدا هـەر پیرۆز بـووە، الغيـل: چاڵاو و درووستکەری واحـەی شـین و سەوز، السند: ئاوێك لە نزیك سینا، نزیك مەککە.

دەڵێ: سوێند دەخۆم بەو خودایە کە پەنای ئارام و هێمنی کردووەتەوە بـۆ باڵنـدەی نزیـك حـەرەمی مەککـە و لـە نزیـك ئـەو چیاو و شـینایيە کۆدەبنـەوە و وشترسـوارەکان دەسـت دێـنن بـە سـەریاندا، چونکە ترسـیان نییـە لـەگرتن و سـەربڕین و حـەیوان و تـەیری حـەرەمی مەککـە، ئـەو کاتەش ڕاو درووست نەبووە و کـەس توانـای نـەبووە کۆترێـك، باڵندەیـەك بگرێ و سەری ببڕێ و ئەوانیش ترسیان نەبووە.

مَـا إِنْ أَتَيْـتُ بِشَـيْءٍ أَنْـتَ تَكْرَهُـهُ    إِذاً فَـلاً رَفَعَـتْ سَـوْطِي إِلَـيَّ يَـدِي

ئەوە وەڵامی سوێندەکەیە لـە بـەیتی پێشوو، دەڵـێ: ئـەوە سـوێندم بـێ هەرگیز من کارێکم نەکردووە کە تۆ لات ناپەسەندبێ و پێت ناخۆش بـێ، یاخوا دەستم بشکێ و دەستم گۆج بێ، ئەگەر بەرامبەر بە تۆ کاری خراپم کردبێ.

إِذاً فَعَـــاقَبَنِي رَبِّـــي مُعَاقَبَـــةً    قَرَّتْ بِهَا عِـيْنُ مَـنْ يَأْتِيـكَ بِالْحَسَـدِ

ئەگەر خوانەخواستە ڕۆژێ لە ڕۆژان بە خەیاڵ و دڵمدا هـاتبێ لـە دژی خاوەنشکۆ کـاری ناپەسـەند بکـەم، داوا دەکـەم لـە پـەروەردگارم کـە سـزام

بدات و تۆڵەی بە زەبرم لێ بستێنێ، بە ڕادەیەك چاوی ئەوانەی شاتوشوتیان كردووە بۆ لای جەنابت، ون بێتەوە، چونكە دەڵێن ئەوە خودا حەقی ئەو قسە خراپانەی لێسەندووەتەوە كە بەخاوەنشكۆت وتووە.

هَـذَا لِـأبرَأَ مِـنْ قَـوْلٍ قُـذِفتُ بِـهِ    طَـارَتْ نَوَافِـذُهُ حَـرّاً عَلَـى كَبِـدِي

ئەم هەموو سوێندە قورسەم بۆیە بۆت خواردووە لەبەر ئەوە خۆم پاك بكەمەوە لەو دووزمانیی و بوختان و هەڵبەستە كە بۆ من دروستكراوە و ئەوەندە قورسە لە پەنجەرەكانەوە كونی كردووەتە جەرگم و بە سەختیی برینداری كردووە، چونكە تۆ لەوە گەورەتری كە من بتوانم قسەی ناشیرین بكەم.

مَهْـلاً فِـدَاءٌ لَـكَ الأقْـوَامُ كُلُّهُـمُ    وَمَـا أُثمِّـرُ مِـنْ مَـالٍ وَمِـنْ وَلَـدِ

مهلاً: لەسەرخۆبە، پەلە مەكە، فداء: بە قوربانت بێ، الأقوام: هەموو خزمانم، أثمر: كۆمكردووەتەوە، مال ولد: ماڵ و منداڵ.

دە كەوابوو لەسەرخۆبە، پەلە مەكە، گەورەم، من خۆم ئەكەم بە قوربانت، هەموو خزم و كەس و كارم بە قوربانت بێ، بە سەدەقەی تۆبێ، هەرچی كە من هەمە لە ماڵ و منداڵ، منێك ئەوەندە تۆم خۆشدەوێ، چۆن وشەو شیعر و قسەی ناخۆش بە تۆ دەڵێم.

لاَ تَقْـذِفَنِّي بِـرُكْنٍ لاَ كِفَـاءَ لَـهُ    وَلَـوْ تَأَثَّفَـكَ الأَعْـدَاءُ بالرِّفَـدِ

تقذفنی: فڕێدان و دوورخستنەوە، ركن: كەنار، شوێن، كفاء: هاوكار، یارمەتیدەر، تأثف: وازت لێ ناهێنن وەك سێكوچكە دەوریانداوی، الرفد:

پەیتاپەیتا هاوكاریت دەكەن بۆ زیادەڕق لە من.

دەڵێ: گەورەم توخودا من كە ئەوەندە پەیوەندیم بە جەنابتەوە هەیە و ئەوەندە تۆم خۆشئەوێ و ئەوەندە خۆم و ماڵ و منداڵ و هەرچیم هەیە ئەیكێڕم لە دەورت، دەرم مەكە، فڕێم مەدە، لە كەنارەوە دام مەنێ، هەرچەندە من بەخت و ناوچاوم نییە، دوژمنەكانم دەوریانداوی وەك سێ بەردی كوانووی ئاگر و پەیتاپەیتا داری ئەخەنە ژێر قازانی ڕەق و كینە لە من، بەڵام من بێ تاوانم، بڕوا بكە بێ گوناهم، دوژمنم زۆرە و ئێرەیم پێ دەبەن.

فَمَــا الْفُــرَاتُ إِذَا جَاشَــتْ غَوَارِبُــهُ     تَرْمِــي أَوَاذِيُّــهُ الْعِبْــرَيْنِ بالزَّبَــدِ

فرات: ناوی ئەو ڕووبارەیە لە كوردستانی باكوورەوە دێتە سووریا و لەوێشەوە دێتە عێراق و لە ڕومادییە بەرەو كەنداو دەڕوات، جاشت: كە لافاو ئەكات و ئەرخەوانسوورە زیاد ئەبێ، غوراب: شەپۆل و سەرووی ڕووبارەكە، ترمی: فڕێ دەدات، أواذي: شەپۆلی بۆ كەنار و دەوروبەر، العبرين: هەردوو بەری چۆمی فورات، الزّبد: كەف.

ئەم شاعیرە زۆر هاتووچۆی ناوچەی كوردستانی كردووە كە ڕووباری فورات پێیدا ئەڕوا و كەفوكوڵ و لافاو و شەتاوی بەهارانی پێش شازدە سەدە لەمەوپێش كە بەنداوی لەسەر نەبووە و بەهاری كوردستان بەفری تواوەتەوە، ئاخۆ چۆن لافاوێكی هێنابێ بۆ دۆڵ و ڕووباری فوراتی كوردان، كاتێ بەفری كوێستان ئەتوێتەوە و گرمە و كەفوكوڵی بۆ پێشەوە و بۆ كەناری هەردوولای ڕووبارەكە دێت و دەڕوا.

يَمُـــدُّهُ كُـــلُّ وَادٍ مُزْبِـــدٍ لَجِـــبٍ      فِيـهِ حُطَـامٌ مِـنَ الْيَنْبُـوتِ وَالْخَضَـدِ

یمدە: زۆری دەكـات و فراوانـی دەكـات، وادِ: شـیوودۆڵ، مزبـد: فراوانـی دەكات، لجبِ: هاژەی دێ و نرکە و ناڵەی لافاوی شـیوەکانی کـە دێتـە سـەر فـورات، حُكـام: لەشـی دار و پـردی لافاوهێنـەر، الینبـوت: داروپـەردوو و گژوگیای ئاوڕامالیو، الخضد: ساقی ڕووەکی وشك و بێ ئاو.

هەروەها دەڵێ: ئەو ڕووبارە گەورەیە نەك هەر خۆی بـەڵکو ئـاوی ئـەو هەموو شـیو و دۆڵ و  چۆم و کانیـاوە دێتـە سـەری و هـاژە و ناڵـەی ئـاوی قەدپاڵەكان كە چەندانجار ئاوی فورات زیاددەکەن و هەزاران دار و درەخت و ڕووەکی لەگەڵ خۆی هێناوە بۆ ناو ئەم ڕووبارە، ئەوانە هـەرگیز ناگاتـە لافاوی بەخشندەی خاوەنشکۆ لەكاتی بەخشندەییدا.

يَظَـلُّ مِـنْ خَوْفِـهِ الْمَـلاَّحُ مُعْتَصِـماً      بِالْخَيْزُرَانَـةِ بَعْـدَ الأيْـنِ وَالنَّجَـدِ

یظل: لە ناوەڕاستی ڕۆژدا، خوف: ترس، الملاح: کەڵەکەوان و گـەمی نـاو ڕووباری فورات، معتصم: توونـد دەستی گرتووە، الخیـزان: سـوکانی بەلـەم، الاین: ماندووبوون و شەکەتبوون، النجد: ئارەقکردن و ماندووبوون.

دەڵـێ: ئـەم ڕووبـارە زیـاد لـە سـنووری خـۆی لافـاوی هـەبێ و بـواری پەڕینـەوەی نـەبێ و خـاوەن گـەمی و کەڵـەك و بەلەمـەکان لەترسـی خنکاندن و ئاوبردن دەستیان توونـد گرتووە بـە سـوکانی بەلەمەکەیانـەوە و زۆر ماندوو و شەکەت بوون و ئـارەقی زۆریـان دەرداوە، ئەوەنـدە شـان و قۆڵیـان کـوتراوە بـە سـەوڵی دەسـتیان، ئەوکاتـە شـەتاوی فـورات ڕێگـەی گواستنەوەی ئاوی بووە لە چیاکانی کوردستانەوە بەرەو بەسـرە و کوفـە و

له نزيك حيرەوە.

ئەم شاعيرە شارەزا بووە بە لافاوی فورات.

يَوْمــاً بِــأَجْوَدَ مِنْــهُ سَــيْبَ نَافِلَــةٍ    وَلاَ يَحُــولُ عَطَــاءُ الْيَــوْمِ دُونَ غَــدِ

ئەوە وەڵامی مەرجەکەی پێشەوەیە کە وتی فورات بەو هەموو لافاو و شەتاو و کەف و کوڵی بەهارانەی هەرگیز لە دەست و بەخشندەیی تۆ سەختر نییە، بەڵکو دەستی بەخشندەیی تۆ زیادەشی هەیە لە فورات کاتی لافاوی بەهاران هەمیشە بەخشندەی ئەمڕۆ نابێتە کەمکردنەوەی بەخشندەیی سبەی.

ئەم شاعیرە باش لەوە شارەزابووە کە ئاو یانی ئاوەدانیی و سەرچاوەی ئاوەدانی شام و جەزیرە و باشووری عێراقی عەرەبی بە کوفەو بەسرەشەوە، تەنها ڕەگی ژیانیان ئاوی فوراتە و فورات بەخشندەیە، لەوانەیە ناوی کوردی بێ و کرابێ بە عەرەبی (فرەهات) بووە و کەمکەم عەرەبەکان عەرەباندویانە وەك ڕووباری دیجلە کە (دەچڵە)یە و عەرەبێنراوە!!.

ئەوەش تەوەری ئەم دوو ئاوەی سەرچاوەی ژیان.

أُنْبِئْــتُ أَنْ أَبَــا قَــابُوسَ أَوْعَــدَنِي    وَلاَ قَــرَارَ عَلَــى زَأْرٍ مِــنَ الأَسَــدِ

أنبئت: ئاگادارکراوم، بۆیان باسکردووم، أبا قابوس: نازناوی نوعمانی کوڕی مونزیرە، أوعد: هەڕەشەی لێ کردووم و بە نیازە ئازارم بدات، قرار: ڕاکردن و مانەوە، زأر: نرکەی شێری دڕندە.

دەڵێ: بۆیان باسکردووم کە ئەباقابووس هەڕەشەی لێ کردووم و منیش

ناتوانم جێگە بەخۆم بگرم لە نرکە و ناڵەی شێری دڕندە.

هَـذَا الثَّنَـاءُ فَـإِنْ تَسْـمَعْ لِقَائِلِـهِ    فَمَا عَرَضْتُ - أَبَيْتَ اللَّعْنَ- بِالصَّفَدِ

هەموو ئەم ستایش و سەنایە کە بەندەی دڵسۆزتان بۆتـان دەڵێ تـەنها لەبـەر گـەورەیی و مەردایـەتیی و جـوامێریی ئێوەیـە، هـەرگیز (خـودا دوورتان بخاتەوە لە خراپە) نیازم بەخشین و خـەڵات نییـە، ئـەم ڕسـتەیە (بیت اللعن)، بە کوردی پەرژین و دیواری قایم بێ لە ڕووتان!.

هَـا إِنَّ تَـا عِـذْرَةٌ إِلاَّ تَكُـنْ نَفَعَـتْ    فَـإِنَّ صَـاحِبَهَا قَـدْ تَـاهَ فِـي الْبَلَـدِ

ها: ئاگادار بـە، تَـا: ئـەم قەسـیدەیە، عـذرة: پـۆزش و عوزرخواییـە بـۆ جەنابی مەلیك.

خۆ ئەگـەر سـوودی نـەبوو داوای بەخشـینی بـۆ مـن تێـدا نـەبوو، ئـەوە خاوەنەکەی سەرگەردانە لەو وڵات و نیشتمانەی خۆیدا.

خوێنەری کوردی بەڕێز ئەوە قەسیدەکەی نابیغەی زووبیانی بەکوردی و بـە پەخشـان و ڕاڤـەکردن و مانـای کـورتی بەیتـەکان، ئـەم قەسـیدەیە تەمـەنی هـەزار و پێـنج سـەد سـاڵ لەمەوپێشـە و کـاتێ گـوێ ئـەگری لـە شاعیرێکی سەدەی بیست و یەك، هەسـت دەکـەیت هـەمان ڕسـتە و هـەمان وشە و هەمان مەبەست دووبارە دەکاتـەوە بەرامبـەر بـە میرێکـی عـەرەب، یـان شـایەك، یـان سـەرۆککۆمارێك، ئـەوەش وانەیەکە بـۆ کـورد کـە نـابێ ڕۆشنبیر، شاعیر، هەرگیز بە ماری گەورەوە بە پیاوی خۆیەوە بدات، بەڵکو هەمیشە مەدح و سەنای بکات.

# عەبید كوڕی ئەبرەسی ئەسەدی

## ٦٠٠ زاینی

ئەم شاعیرە یەكێكە لە كەڵەشاعیرەكانی سەردەمی بەناو نەفامیی و هەندێ لە ڕەخنەگرانی ئەدەبی كلاسیكی كۆنی عەرەب پلەی چوارەمی بۆ دادەنێن، بوێژێكی دەستكورت و هەژار بووە، بەڵام نەفسبەرز و دەروونبڵند وەك مێژوونووسان دەڵێن پادشای عەرەب مونزیری كوڕی ماءالسماء دوو هاوڕێ و هاودەمی خۆی دەكوژێ و لە پاشان زۆر پەشیمان دەبێتەوە، بڕیار دەدات دوو كێلی بەرز لەسەر گۆڕەكەیان دروست بكات، ساڵی دووجار سەردانی ئەو دوو گۆڕە دەكات، ڕۆژێك موژدەبەخش و ڕۆژێك شووم، جا هەركەس لە ڕۆژی موژدە سەردانی بكات سەد وشتری دەداتێ و هەركەس ڕۆژی شووم بڕواتە خزمەتی، ملیان دەپەڕێنێ و خوێنەكەی دەدات بە كێلەكاندا، ئەم دوو ڕۆژە تەنها لای پادشا دەزانرا، ئەوجا بۆ بەختڕەشیی عەبیدی شاعیر، ڕۆژی شووم دەچێتە لای، ئەویش دەڵێ ئەوە چار نییە دەبێ بتكوژم!، چۆنت حەز لێیە بەو جۆرە ئەتكوژم، یەكەم ڕەگی خوێنهاومر، دووەم ڕەگی خوێنبەر لە باڵ، سێیەم ڕەگی لامل كە بە ڕەگی حەیات ناوی هەیە، شاعیر لەوەڵامدا دەڵێ: هەر سێ جۆر هەر مردنە، بەڵام بە مەی سەرخۆشم بكە هەتا ئاگام لە خۆم نامێنێ، ئەوكات خۆت چۆنت پێ باشە وا بكە، بەو شێوەیە ئەم شا نەفامە ئەم شاعیرە ئەكوژێ.

# قەسیدەكەی عەبید

خەتیبی تەبریزی بە دەیەم قەسیدەی زێرینی عەرەبی داناوە و هەندێك لە چوارەم، بەڵام ئەم قەسیدەیە ئەو قەسیدەیەیە كە پادشا پێش كوشتنی داوای لێ كرد كە پارچە شیعرێكی بۆ بڵێ، ئەویش دەستی پێكرد بە یادی وڵاتی چۆڵ و وێران لە (١-٦ )، شیوەن لە (٧-١٠ )، گۆڕان و ژیان و ئامۆژگاری لە (١١-٢٤ )، سەفەری لەسەر وشترێك لە (٢٥-٣١ )، وەسفی ئەسپەكە لە(٣٢-٤٨).

بەپێی دەستووری كێش و سەرواى عەرەبیی، زۆر لەنگی لە شیعرەكانیدا هەیە، لە ڕووی داڕشتنەوە زۆر لاوازە و كەموكوڕیی قاعیدەی عەروزی تێدایە، بەڵام لێوانلێوە لە وێنەی شیعریی كۆنی عەرەب و ژیانی كۆمەڵایەتیی ئەو سەردەمە.

# قەسیدەی عەبیدی ئەبرەس

أَقْفَــرَ مِــنْ أَهْلِــهِ مَلْحُــوبُ    فَالْقُطَبِيَّــاتُ، فَالــذَّنُوبُ
فَــرَاكِسٌ، فَثُعَالِبَــاتٌ،    فَــذَاتُ فِــرْقَيْنِ، فَالْقَلِيــبُ
فَعَــرْدَةٌ فَقَفَــا حِبِــرّ    لَــيْسَ بِهَــا مِــنْهُمْ عَرِيــبُ

**أقفر**: چۆڵ و هۆڵ و بێ ئاوەدانییە، **أهل**: دانیشتوان، **ملحوب**: کانی و ئاوێکی هۆزی شاعیر، **قطبیّات**: ناوی چیایەکە لە هەمان هەواری شاعیر، **الذنوب**: هەوارێکی هۆزی کوڕانی ئەسەد، **راکس**، ناوی شوێنی لەوەڕگەی هۆزەکەی، **تعالبات**: ناوی شوێنی دیاری هۆزەکەی، **ذات فرقین**: ناوی بانێکی دیارییە لەنێوان بەسرە و کووفە پێش هاتنی سوپای ئیسلام و کردنی ئەو دژ و قەڵا و شوێنە بە سەربازگە و پاشان بە شاری گەورە، **القلیب**: بیری ئاوی شیرین لە بیابان، **عردە**: شوێنحەوانەوەی هۆزی ئەسەد، **قفا**: بە مانای پشتمل، واتە پشتی ئەو گردۆڵکەیە کە ناوی (حبر)ە و هۆزی کوڕانی سولەیم تێیدا هەوار دەگرن، **عریب**: هیچ کەس، وشەیەکە لە بریتی (أحد) بەکاردێ.

ئەم شاعیرە کە مەرگی خۆی لەبەرچاوە و زۆر ئاگای لە خۆ نییە، چونکە سەرخۆشکراوە و خوێنی باڵی چەپی بەردراوە بۆ مەرگی و شای عەرەب داوای شیعری لێ دەکات و ئەمیش بە یادی ئەو شوێنانە باسی بۆ

ئەكات و دەڵێ: جەناب! هۆزی كوڕانی ئەسەد قەرەچۆڵیان بڕاوەتەوە و خوێنی شاعیرەكەیان بە خۆڕایی و لە ئەنجامی هەڵەی پادشا كە هاودەمی خۆی كوشتووە و هەموو ساڵێ بڕیاریداوە قوربانییان بۆ بكات بەم شێوەیە!، كەس نەماوە لە دانیشتوانی هۆزەكەم، نە هاوینەهەوار، نە زستانەهەوار، نە گرد و چیا و نە بان و دۆڵ و دەشت، ئەوەتا مەلحوب چۆڵە، قوتبیات كەسی لێ نەماوە، راكیس پەپوو تێیدا دەخوێنێ، سەعالبات بووەتە جێگەی ڕێوی و چەقەڵ و گردی فرقەین كەسی لێ نەماوە، بیری قەلیب كەس نییە ئاوی لێ دەربهێنێ، باسی عەردە ناكەم كە زۆر لە مێژە هۆزی لێ دانەبەزیوە، پشتی گردەكەی حیبر كەسی لێ نییە كە جاران كوڕانی ئەسەد خاوەن مەڕ و مالات و وشتر بوون و گەورەی ناوچەكە بوون، ئەوەش هەموو لە سایەی سەری جەنابی پادشای عەرەب، ئەم سەرەتا خۆی لەخۆیدا ئاماژەیە بۆ نەفامیی و ستەمكاریی ئەم میری عەرەبە، كە دژی شیعر و مرۆڤ و ئاوەدانیی و بۆ ڕەعییەتی خۆی هەمیشە شمشێری تیژە، بەلام بۆ ڕۆم و عەجەم ڕێوی دەشتەكیی و بێ هونەرە، دەنا چۆن هۆزێكی وەك كوڕانی ئەسەد ئەمڕۆ بەم شێوە ناشیرینە گیانی شاعیرەكەیان دەردەكەن.

هەموو شاعیرێك لە سەرەتای یەكەم دێڕەوە مەبەستی خۆی دیاری دەكات، خۆ بە ڕاستیی كارەساتە پادشایەك ئەوەندە ستەمكاربێ شاعیرێك بۆ سواڵ هاتبێ و دەرۆزە پیشەی بێ بەم دەردەی بەرێ و ڕۆژێكی دیكە سەد وشتر بدات بە شاعیرێكی دیكە!.

ئەگەر نەخشەی هۆزی ئەسەد هەبوایە و سات و كات و شوێنەكان دیاری بكرایە ئەوكاتە مانای ئەم سەرەتا بە ڕوونیی دەردەكەوت، بەلام

ئافەرین عەبید لەسەر مەرگی ناکامدا مێژووی ئەم پادشا نەفامەت بۆ ئێمە تۆمار کردووە!، عەرەب لە پەندی خۆیاندا دەڵێن: (رائِدُ القوم لا یکذِب أهلَهُ)، واتە: (سەرکردە نابێ درۆ لەگەڵ میللەتی خۆی بکات!).

وَبُـــدِّلَتْ مِـــنْ أَهْلِهَـــا وُحُشـــاً وَغَيَّـــرَتْ حَلَهَـــا الخُطُـــوبُ

بدّت: گۆڕاوە، وحوش: دڕندەی جەنگەڵ، غیّرت: وەك خۆی نەماوە، الخطوب: کارەسات و ڕووداوی دژوار.

دەڵێ: ئەو شوێن و جێگە و هەوارە، شوێنەواری کوڕانی ئەسەدە کە هەموو کوێربووەتەوە و کەسی تێدا نەماوە و دانیشتنی تێدا نەماوە، نەك هەر چۆڵە، بەڵکو بووە بە بێشەلانی دڕندەی جەنگەڵ و پادشا، لەو شوێنانە گیانداری پیاوخۆری لێیە و ماڵ و ژیانی خەڵك گۆڕاوە، بەهۆی کارەساتی جەرگبڕ و میری ستەمکار و دوژمن بە هۆزەکەم.

أَرْضٌ تَوَارَثُهَـــــا شَـــــعُوبُ، وَكُلُّـــث مَـــنْ حَلَّهَـــا مَحْـــرُوبُ

تـوارث: بەدوای یەکدا هاتووە، ئەم ڕووداوی جەرگبڕە داویەتییە دەستی ئەو کارەساتە، شعوب: مەرگ، مردن، حلّ: ڕێگەی لێ بکەوێ و گوزەری تێدا بکات، محروب: تالانکراوە و ڕووتکراوەتەوە.

دەڵێ: ئەو شوێن و خاك و زەمینەی باسمکرد هەموو وێرانە و کاول بووە، کارەسات بۆ کارەساتی تر بەجێ ماوە و هەر کەس گوزەری پێدا بکات ئەوە ڕووتکراوەتەوە و تالانکراوە، چونکە چەتە و ڕێگر فەرمانڕەوایە لەو ناوچانەدا.

إِمَّـــا قَتِيـــلٌ، وَإِمَّـــا هَالِـــكٌ، وَالشَّـــيْبُ شَـــيْنٌ لِمَـــنْ يَشِـــيبُ

قتيل: كوژراوە، هالك، تێداچووە، الشيب: مووی سپیی و پیریی، شین: شورەیی و عار، يشيب: بۆ ئەوەی ڕزگار دەبێ و پیر دەبێ.

دەڵێ: ئەو خاكەی ئێمە ئەوەی ڕێگەی تێ بكەوێ، یان كوژراوە، یان لە بێ ئاوەدانیی و زیندەگانیدا لەت بووە و بە برسێتیی و گەرما خۆی لەناو دەچێ و دەبێتە خۆراكی گورگ و ڕێوی و داڵ و باڵندی گۆشتخۆر، نموونەش خودی شاعیر خۆیەتی ئاوا بێكەس دەكوژرێ بێ تاوان، بێ دادگایی، بێ پارێزەر، بێ هۆز.

عَيْنَـــاكَ دَمْعُهُمَـــا سَـــرُوبُ كَـــأَنَّ شَـــأنَيْهِمَا شَـــعِيبُ

عيناك: هەردوو چاوت، دمع: فرمێسك، سروب: پلوسك، شانی: هەردوو لای چاو كە فرمێسكی لێ دەڕژێ، شعيب: تۆشەبەرەی دڕاوی كونكون.

دەڵێ: لە خودی خۆی دەدوێ، هەردوو چاوت فرمێسك ئەبارێنێ، وەك پلوسكی گوێسەبانە هەردوولای چاوەكانت وەك تۆشەبەرەی دڕاوی لێهاتووە، ئەوەندە فرمێسكی لێ باریوە، ئەگەر ئەو میرەی عەرەب ئاگای لە خۆی بایە و سەرخۆش نەبووایە و بە ئەندازەی گەردیلە پیاوەتیی و جوامێریی تێدابوایە، شاعیری هۆزێكی ئەسەدی بەو داماوییە لەبەر دەستی خۆی بێ تاوان سەرنەدەبڕی!.

وَاهِيَـــةٌ، أَوْ مَعِيـــنٌ مُمْعِـــنٌ مشـــنْ هَضْـــبَةٍ دُونَهَـــا لُهُـــوبُ

واهية: ڕزیوە، پووترکاوە، معين: ئاوەخوێڕی سەرزەوی، ممن: بەلەز و تیژڕەو، هضبة: بان، نەچیا، نەدەشت، لهوب: شیوی نێوان دوو شاخی بەرز.

دەڵێ: فرمێسك و ئاوی چاوم لافاوی كردووە و ڕژاوە، دڵۆپی ئاوەكەی ڕزیوە، یان ئەڵێی ئاوێكی خوێڕییە و ڕێگە ئەكات بەبێ ئامانج و نیشان دادەبارێ لە بانێك لە نێوان دوو چیادا، واتە چاوی چووە بە قوڵا، وەك ئەشكەوتی لێهاتووە و چۆڕەچۆڕە ئاوی پێدا دێتە خوارەوە و دەڕوا بێ ئامانج و بێ مەبەست.

ئەم شاعیرە ئەو وێنەی بۆیە كێشاوە كە پادشا بە ناخێری گیانی بەزەیی پێدا بێتەوە، بەڵام مرۆڤی ناپەسەند و نارەسەن و نانەجیب هەرگیز بەزەیی بە زمان و هاوهۆز و هاونەتەوەی خۆیدا نایەتەوە.

أَوْ فَلَـــــــجٌ بِـــــــبَطْنِ وَادٍ     لِلْمَـــاءِ مِـــنْ تَحْتِـــهِ قَسِـــيبُ

فلج: ڕووباری چكۆلە، قسیب، الیل، شجیج، هجیج: هەموویان ناوی دەنگی ئاوە، كە لە قەڵبەزەدا دەدەبەزێ بۆ خوارەوە، لەوە دەچێ ناوی هەجێج لەو وشەوە وەرگیرابێ كە لەدواوە هاتووە، بەم شێوەیە داخوراوە (عجیج، أجیج، هجیج).

دەڵێ: دوو كونەچاوم وەك دوو جۆگەلە ئاوی پێدا دێتەخوارەوە، لەناو شیوی دوو گلێنەی چاوم، ئاوی قەڵبەزە، یان تاڤگە چۆن هاژەی دێت بەو شێوە فرمێسكم دێتەخوار، ئەوە وێنەی ئەم شاعیرەیە لەبەردەم شایەكی بێ ئینسافدا.

أَوْ جَـــدْوَلٌ فِـــي ظِـــلاَلِ نَخْـــلٍ    لِلْمَـــاءِ مِـــنْ تَحْتِـــهِ سُـــكُوبُ

جدول: جۆگەلەی بچووك، ظلال: سێبەر، سكوب: دەنگێ كە بە جۆگەدا دەڕوا.

دەڵێ: یان چاوم ئەڵێی جۆگەلەیە و بەناو باخی خورمادا دەڕوا و سێبەری خورما ساردی كردووە، دەنگی ڕۆیشتنی بەناو دارخورمادا بە ئاستەم دەبیسترێ. ئەوەی وێنەی زیندووە و بە وشە و ڕستە تۆمار كراوەو گەورەیی زمانی عەرەبی تێدا دەرئەكەوێ كە وێنەی زیندووی ڕەوانبێژیی دەردەبڕێ.

تَصْـــبُو وَأَنَّـــى لَـــكَ التَّصَـــابِي؟    أَنَّـــى وَقَـــدْ رَاعَـــكَ الْمَشِـــيبُ؟

تصبو: دڵداری ئەكەی، خۆشەویستیی ئەكەی، راعك: ناڕەحەتی كردووی.

دەڵێ: تازەبەتازە دڵداری دەكەی؟، چۆن بۆت ئەكرێ خۆشەویستیی بكەی؟، بۆت ناكرێ، تۆیەك كە پیریی ناڕەحەتی كردووی و سەروریشی سپی كردووی، پێی دەڵێ: تۆ لەم ئاخری پیرییەوە چیتداوە لە خۆشەویستی!.

إِنْ يَـــكُ حُـــوِّلَ مِنْهَـــا أَهْلُهَـــا    فَـــلاَ بَـــدِيءٌ، وَلاَ عَجِيـــبُ

دەڵێ: ئەو هەوار و شوێن و ڕەشماڵەی هۆزەكەم گوێزراوەتەوە، شتێكی تازە نییە و جێگەی سەرسوڕمان نییە.

أَوْ يَــكُ قَــدْ أَقْفَــرَ مِنْهَــا جَوُّهَــا وَعَادَهَـــا المَحْـــلُ وَالجُـــدُوبُ

اقفـر: چۆڵ کـراوە، جوّ: ناوەڕاسـت، عادهـا: سـەردانی کـردووە، المحل: قـاتوقڕیی و گرانیـی، الجـدوب: ئـەم شـوێنە هـەوارەی هۆزەکـەم ئەگـەر چـۆڵکراوە و کەسـی لێ نـەماوە و قـاتوقڕیی و گرانیـی و بـێ بـارانیی و وشکەساڵیی سەری لێ داوە، بەلاتەوە سەیر نەبێ، چونکە دەسـەڵاتی سـتەم زاڵە بەسەریدا.

فَكُـــلُّ ذِي نِعْمَـــةٍ مَخْلُوسُـــهَا وَكُـــلُّ ذِي أَمَـــلٍ مَكْـــذُوبُ

مخلوس: تاڵانکراوە و ڕووتکراوەتەوە، مکذوب: بە درۆی دەخاتەوە.
دەڵـێ: هـەموو کـەس نیعمـەت و خۆشـیی و کامـەرانیی وەدەسـت هێنـا ڕۆژێـك دێ ڕووتـی بکەنـەوە و هـەمووی لێ وەربگـرن، هەرچـی هیـوا و ئومێدی هەیە جێبەجێ نابێ.

وَكُـــلُّ ذِي إِبِـــلٍ مَـــوْرُوثٌ وَكُـــلُّ ذِي سَـــلَبٍ مَسْـــلُوبُ

إبل: وشتر، موروث: دەبێتە میراتیی و خەڵك دەیبا بۆ خۆی، سلب: ماڵی تاڵانکراو و لەبەر خەڵك داکەندراو، سلبو: دادەماڵێ و دادەکەنرێ.
دەڵێ: هەرکەس وشتری ئەوەندە زۆری هـەبێ هـەتا دەمـرێ پـاش خـۆی بە میرات کوڕوکاڵ دەیبەن بۆ خۆیان و جێ دەمێنێ و لەگەڵ خۆی نایبات بـۆ گـڵ و هەرکـەس کەسـێك ڕووتبکاتـەوە و تـاڵانی بکـات ڕۆژێ ئـەویش

دەمـرێ و لیباسـەكانی كـە تـالانی كـردووە لەبـەری دادەكـەنرێ، ئـەوە سوننەتی ژیانە.

وَكُــــلُّ ذِي غَيْبَــــةٍ يَــــؤُوبُ     وَغَائِــــبُ المَــــوْتِ لاَ يَــــؤُوبُ

هەركـەس كەسـێكی لـە نادیـار بـێ و مـابێ لـە ژیانـدا، ڕۆژێ دەبـێ بگەڕێتەوە و هەواڵی بزانێ، بەڵام ونبوونی مردن ناگەڕێتەوە.

أَعَــــاقِرٌ مِثْــــلُ ذَاتِ رِحْــــمٍ؟     أَوْ غَــــانِمٌ مِثْــــلُ مَــــنْ يَخِيــــبُ؟

عاقر: نەزۆك و بـێ منـداڵ لـە ئافرەتـدا و لـە زەویـدا ئـەو خاكەیـە كـە گیـای لەسـەر شـین نـابێ، ذات رحـم: ئـەو ئافرەتـەی منـداڵی زۆری ئـەبێ، غانم: مرۆ نییە دەستكەوت و گەڕاوە بە كۆڵ و بـارەوە، یخیـب: نائومێـد و مایەپووچ و دەستبەتاڵ.

دەڵێ: هەرگیز لە بەرهەمهێنان و نـەوە خستنەوەدا ئـافرەتی نـەزۆك و ئافرەتی منداڵزۆر وەك یـەك نـین!، ئـەو كەسـەی لـە كـاروان و سـەفەر بـە دەستی پڕ گەڕاوەتەوە وەك ئەوە نییە كـە بـە دەسـتی بـەتاڵ و مایـەپووچ گەڕاوەتەوە.

مَــــنْ يَسْــــأَلِ النَّــــاسَ يَحْرِمُــــوهُ     وَسَــــائِلُ اللهِ لاَ يَخِيــــبُ

ئەوەی پیشەی سواڵكردن و دەرۆزە بێ هەندێ جار دەستكەوتی ئەبێ و هەندێ جاریش نائومێدە و كەس خێری پێ ناكات، چونكە تووشـی دەبـێ بە تووشی كەسانی ڕژد و ڕەزیل، بەڵام ئەوەی داوا لە خودا بكـات هـەرگیز

نائومێد نابێ، ئەگەر کتوپڕ دەستکەوتی نەبێ، خودا بە پاداشت بۆی دەنوسێ، خودا بەخشندەیە.

بِـــاللهِ يُـــدْرَكُ كُـــلُّ خَيْـــرٍ     وَالْقَـــوْلُ فِـــي بَعْضِـــهِ تَلْغِيـــبُ

تلغیب: زۆر لاواز و پوچ، بە تایبەتی تیری کەوان کە لار بوو لاوازە لەکاریگەریدا.

دەڵێ: تەنها لەڕێگەی خوداوە خێر و چاکە چاوەڕوانکراوە و تەنها خێر لە خوداوەیە و خودا خێری مەحزە و هەندێ خێر ئەگەر لە خەڵکەوە بێ، غەیری خودا ئەوە زۆر کەمە و لاوازە و ئەم نموونە دەبێ مرۆڤ تەنها خێر لە خودا داوا بکات.

ئەوە ئامۆژگاریی خۆی و خەڵك دەکات کە نەدەبوو بۆ خێر پەنا بۆ ئەم پادشا نەفام و نەزان و بێ وێڵە بێنێ، ئەم شاگەمژەیە خێری ئەم سەرئەنجامەیە!.

وَاللهُ لَـــيْسَ لَـــهُ شَـــرِيكٌ     عَـــلاَّمُ مَـــا أَخْفَـــتِ الْقُلُـــوبُ

شریك: هاوتا و هاوڕێ، علام: زۆر زانا بە هەموو ئاشکرا و نهێنییەك، أخفت: شاراوەتەوە و دیار نییە، القلقوب: دڵەکان.

دەڵێ: خودا بێ شەریکە، بێ ڕەفیقە، تەنها خۆی بەدیهێنەری زەوی و ئاسمانە، دروستکاری هەموو بوونەوەرە، هەر خودایە زانا بە نهێنیی و نادیارەکان، چونکە هەر ئەوە ئەم جیهانەی ئافەریدە کردووە، ئاگادار لە دروستکردنی گشت بوونەوەرەکان ورد و درشت.

خودا ئاگاداره لە نیازە شاراوەكانی دڵ، ئەوە پاكانەیە كە هاتی بۆ لای ئەم شایە لەبەر هەژاریی و نەداریی و نەبوونیی نەبووە و مەبەستی ئەوە نەبووە شیعری پێ بفرۆشێ و پارە و پوولی لێ بكێشێتەوە، بەڵام ئەم كابرا گەمژە كە خۆی سەپاندووە بەسەر ئەم خەڵكە نەفامەدا هەر ئەمەی بە دەستە كە ئەنجامی دەدا.

أَفلِحِ بِمَا شِئْتَ، فَقَدْ يُبْلَغُ بالـ ـــضَّعْفِ، وَقَدْ يُخْدَعُ الْأَرِيبُ

أفلح: بژی، بنێژە، بكێڵە، الضعف: لاوازیی و كەمدەرامەتیی، یخدع: فێڵی لێ ئەكرێ، الاریب: ژیر و دانا و زیرەك.

دەڵێ: چۆن كار بكەیت و چی كشت بكەیت هەر ئەوە ئەدوریتەوە و دەسكەوتت بەرهەمی كاری خۆتە، ڕۆزیی بە زیرەكیی و تەمەڵیی نییە، دەوڵەت بە ئازایەتیی و جەربەزەیی نییە، پادشایەتیی بە بەخشندەیی و ڕەزیلیی نییە.

زۆر جار كەسانێك بە هەژاریی و لاوازیی زیاتر دەستكەوت وەدەست دێنن، ئەوجا سەركەوتن بە زۆرزانیی و شارەزایی و شاعیری نییە، لەوانەیە شاعیر لە شا زیرەكتربێ، كەچی بۆ سواڵ شاعیر دێتە لای شا و ئەوەش كاری شایە بە ناحەق خوێنی شاعیر دەڕێژێ، دەبخۆ بەو پەندەبی كە ئەم شاعیرە بۆت دەبێژێ!.

لاَ يَعِظ النَّاسُ مَنْ لاَ يَعِظُ الـ ـــدَّهْرُ، وَلاَ يَنْفَعُ التَّلْبِيبُ

لـە کوردیـدا دەڵـێ: ئـەوەی بـاوك و دایکـی ئامۆژگـاریی نـەکات زەمانـە ئامۆژگاری دەکات، (من لم يُؤدبه أبواهُ أدّبهُ الدّهر)، ئەوە لەم شـیعرەی مـام عەبیدی هەژاری شاعیر وەرگیراوە کە دەڵێ: پەند و ئامۆژگاریی وەرنـاگرێ خەڵك، ئەگەر پەند و ئامۆژگاریی لـە چـەرخ و زەمـەن وەرنـەگرێ، خـەڵك نـاتوانێ پیـاوی لار و ناپەسـەند ڕاسـت بکاتـەوە، ئەگـەر زەمانـە ڕاسـتی نەکاتەوە، ئەگەر چاکە و خێر و پیاوەتیی سروشتی مرۆڤ نەبوو، دەسەڵات ناتوانێ فێری پیاوەتیی بکات.

ئەوە چیرۆکی ئەم شاعیرە هەژارەیە کە پێمان دەڵـێ: ئاگـاداربن داوا لـە مرۆڤـی نارەسـەن و ناپەسـەند مەکـەن، چـونکە ئەوانـە خێریـان لـەخۆ نەگرتووە، بەڵام مرۆڤی چاك، سەرکردەی چاك، پێشـەوای بـاش، هەمیشـە جێگەی ئومێدە، نەوەك پادشا سووك و بێ کەڵکەکان.

إلاَّ سَـــــجِيَّاتُ مَـــــا الْقُلُـــــوبِ     وَكَـــمْ يَصِـــيِرَنْ شَـــائِناً حَبِيـــبُ

ئـەوە وەڵامـی بـەیتی پێشـەوەیە کـە دەڵـێ: خـۆ بـەزیرەکزانین سـوودی نییە، تەنها ڕەوشتی خۆڕسك سوودی هەیە، سجيات: ڕەوشت و خووخـدەی مـرۆڤ، يصيرن: دۆست.

دەڵێ: ئەوە ڕاست نییە کە مـرۆڤ بـە زۆر و خۆسـەغڵەتکردن خـۆی بـە زیر و عاقڵ دابنـێ، بـەڵکو تـەنها ڕەوشـتی سروشـتیی و خۆڕسـك دەتـوانێ مـرۆڤ بەرەو ڕێگەی ڕاست بـەرێ، زۆرجـار ڕێـك دەکـەوێ دۆسـت دەبـێ بـە دوژمن و دوژمن دەبێ بە دۆست.

ئەوە حاڵی ئەم شاعیرەیە بۆ خەڵات و بەرات هاتووە بۆ لای پادشای بێ تەخت و تاج و سەرۆكهۆزێك كە قەدەر كردویەتی بە خونكار و بە دۆستی زانیوە، هاتووە بۆ لای بەڵام ئەم هاتنە بوو بە هۆی كوشتنی شاعیرێكی حەكیم و زانا.

سَـــاعِدْ بِـــأَرْض إِذَا كُنْـــتَ بِهَـــا     وَلاَ تَقُـــــلْ إِنَّنِـــــي غَرِيـــــبُ

ساعد: خۆبساچێنە و مودارا بكە.

دەڵێ: ئەگەر ڕێكەت كەوتە وڵاتێك و دوور لە زێد و ماوای خۆت، خۆت ڕێك بكە لەگەڵ كاروكردار و نەریت و خووی ئەو خەڵكە و خۆت بە نامۆ مەزانە، فێری داب و ئوسلوبی ئەوان ببە، چونكە ئەگەر وەك ئەوان ڕەفتار نەكەی باوەڕت پێ ناكەن و بە غەریب و نامۆت دەزانن و كێشەت بۆ درووست دەكەن.

قَـدْ يُوصَـلُ النَّـازِحُ النَّـائِي، وَقَـدْ     يُقْطَـعُ ذُو السُّـهْمَةِ الْقَرِيـبُ

دەڵێ: ئەوە یاسای كۆمەڵە و لە كۆنەوەیە، ئەزموون كراوە، زۆر كەس ئاوارە و دوورەوڵات و نەناسراو گەیشتووە بە پلەوپایەی بەرز، چونكە عەقڵی بەڕێوەبردنی كاری هەبووە، زۆر كەس خاوەن بەشە، خەڵكی وڵاتە، بەڵام نەزانە، بێ بەش كراوە، خەڵك پیاوی دوور زیاتر بەرز ئەكاتەوە، هەتا خزم و نزیك و میرات بەیەك ڕەوا، هاوكاری خەڵكی وڵات بكە و خۆت بە نامۆ مەزانە.

وَالِمَـــرْءُ مَـــا عَـــاشَ فِـــي تَكْـــذِيبٍ     طُـــولُ الْحَيـــاةِ لَـــهُ تَعْـــذِيبُ

دەڵێ: ژیان هەمووی چاوبەسە، درۆیە، خۆخەڵەفاندنە، دەبێ چەندە بۆ خۆت دەژی ئەوەندەش بۆ خەڵك بژی، لە داب و نەریتی خەڵك دەرنەچی، بەرپەرچی شتی باویان نەدەیتەوە، ڕەخنەی بێجێ نەگری كە بزانی بە گوێت ناكەن، ژیان و مان چەندە درێژ بێت هەر ئازارە، پەژارەی خەم و خەفەتە، زەمانە سپڵەیەكە نرخی خەڵك نیشان نادات بە خەڵك، هەموو كەس هەر خۆی خۆش دەوێ و كار بۆ خۆی ئەكات، ئەوە سوننەتی ژیانە، بە تایبەتی لەو چەرخی نەفامیی و بێوێڵیی و بێژیارەییەی كە عەرەبی تێدا بووە.

بَـــلْ رُبَّ مَـــاءٍ وَرَدْتُـــهُ آجِـــنٍ     سَـــبِيلُهُ خَـــائِفٌ جَـــدِيبُ

آجن: شیلێو، بۆگەن، تەخڵ، خائن: جێگەی مەترسی و تیاچوونە، جدیب: چۆڵ و بێ دانیشتوو.

دەڵێ: نەك ئەوەی باسمكردووە بۆت جەنابی پادشا كە چەقۆت بەدەستە بۆ ئەوەی ڕەگی حەیاتم ببڕی، بەڵكو زۆرجار تووشی ناڕەحەتیی بووم و لە ئاوی لێڵ و شلێوم داوە و ڕێگەی پڕ مەترسیم بڕیوە و تۆش بێمنەتبە لە كوشتنم!.

فَـــرِيشُ الْحَمَـــامِ عَلَـــى أَرْجَائِـــهِ     لِلْقَلْـــبِ مِـــنْ خَوْفِـــهِ وَجِيـــبُ

ریش: پەڕی باڵندە، حمام: كۆتر، أرجاء: كەنار و دەوروبەری، خوف: ترس، وجیب: دڵەڕاوكێ و هەناسەسواریی.

دەڵێ: لەسەر ئەو ئاوە دەیان باڵندە و كۆتر خوراوە و پەڕی بڵاوبووەتەوە لەلایەك و دڕندەی وەك تۆ جەنابی پادشا دڵ لە ئاستی ترپەی كردووە و ترساوە، ئێستە چۆن دەترسم لە مەرگ.

قَطَعْتُــــهُ غُـــدْوَةً مُشِيــــحاً　　وَصَـــاحِبِي بَـــادِنٌ خَبُـــوبُ

قطعتە: پێدا تێپەڕیوم، غدوة: ئێواران، شیما: بە پەلە و بە ئاگاداریی تەواو، بادن: وشتری قەڵەو و پتەو، خیوت: تیژڕەو و شارەزای ڕۆیشتن بە هەموو جۆرەكانی.

دەڵێ: من ئەو ڕێگەم بڕیوە و سەفەرم تێدا كردووە و لە تەنگی مەغریبدا و زۆر بەدڵقایمیی و ئازایانە و وڵاخی ژێریشم وشترێكی گەورە و پتەو و تیژڕەو بووە.

عَيْرَانَــــةٌ مُؤْجَـــدٌ فَقَارُهَـــا　　كَـــأَنَّ حَارِكَهَـــا كَثِيـــبُ

عیرانة: وەسفی وشترە، یانی وەك گاكێویی تۆكمەیە، مؤجد: بڕبڕەی پشتی وەك یەك ساف و بێ گرێیە، حارك: دووگی وشتر كە لەسەر پشتی بێ، كثیب: لی نەرم.

دەڵێ: زۆر كارەساتم بەسەر هاتووە، واتە سەفەر بە وشترێك وەك گاكێوییەك بڕبڕەی پشتی ساف و بێگرێیە و دوگی پشتی نەرم و چەور و پتەوە.

أَخْلَفَ مَا بَازِلاً سَدِيسُهَا لاَ حِقَّةٌ هِيَ، وَلاَ نَيُوبُ

بەچكەی وشتر بۆ پلەیەك ناوی خۆی هەیە، نێربێ، یان مێ، پاش حەوت ساڵ دانی تەختی دەردەكەوێ، ئەوە (أخلف)ە، پاش ئەوە بە ساڵێك دانێكی تری دەردێ ئەوە (بازل)ە، كە بوو بە هەشت ساڵ ئەوە (حقه)، تەمەنی گەیشتە حەڤدە ساڵ ئەوە (ناب)ە كە تاكە و كۆی (نیوب)ە، واتە وشترەكە حەوت ساڵی پڕكردووەتەوە و حەقی نییە و نەبووە بە (كەناب بازل) و دانی هەر ساڵێ كەوتووە.

كَأَنَّهَا مِنْ حَمِيرِ عَانَاتٍ جَوْنٌ بِصَفْحَتِهِ نُدُوبُ

دەڵێ: ئەم وشترە كەری جەنگەڵە، ڕەش و سپییە، ئەملاو ئەولای گازی نێرەی پێوەیە، وەك پەڵەی لێ هاتووە، كەری وەحشیی لەناو عەرەبدا بوونی هەبووە، یان بۆیان وەسفكراوە.

أَوْ شَبَبٍ يَرْتَعِي الرُّخَامَي تَلُفُّهُ شَمْأَلٌ هَبُوبُ

شبب: هەرزەكارە، گەنجە، یرتعی: لوول ئەدا و ئەیكرمێنێ، الرخامی: جۆرە گیایەك وەك چاوبازەڵەی كوردەواریی، یان دڕكی كەرتەشی كەژ و كێو، تألفه: دەوری ئەدا بۆ كاری خێر، شمال: نێرە، هەر حەیوانێكی وەك وشتر.

دەڵێ: ئەم وشترەى من هەرزەكارە، گەنجە، كە درِكى بەهارە لوول ئەدا و ئەيگلێنێ و نێرەكەرى كێويى دەوروخولى ئەدا و بە تەماى كارى زەماوەندە لەگەڵیدا.

فَــذَاكَ عصْــرٌ، وَقَــدْ أَرَانِــي تَحْمِلُنِــي نَهْــدَةٌ سُــرْحُوبُ

ئەوە چەرخ و زەمانێك بوو من بەو شێوەبووم و زۆر جار جگە لە وشتر كە وەك كەرى كێويى بووە سوارى ئەسپ بووم، بەڵام كام ئەسپ؟، ئەسپى ملبەرز، كلكشۆڕ لە مەيدانى ئەسپسواريدا تيژ ڕەو و ئازا.

مُضَــبَّرٌ خَلْقُهَــا تَضْــبِيراً يَنْشَــقُّ عَــنْ وَجْهِهَــا السَّــبِيبُ

مضبّر: جێى متمانە و باوەڕ پێكراو و ڕام، ينشق: باڵى ناوچاوى و باڵى ملى شۆڕ بووەتەوە، بەڵام چاوى نەگرتووە.

دەڵێ: من زۆرجار ئەسپم هەبووە، بەڵام ئەسپ نەبووە، بەڵكو مۆچێنراوە و ڕامكراوە و جێگەى باوەڕ بووە و متمانەى پێكراوە.

زَيْتِيَّــةٌ نَــائِمٌ عُرُوقُهَــا وَلَــيِّنٌ أَسْــرُهَا رَطِيــبُ

ڕەنگى ئەو ئەسپەم وەك ڕۆن بوو، زەردى كاڵ و ڕەگى لەشى بەدەرەوە نەبووە، لە بەر قەڵەويى، وەك ڕەگەكەى خەوى لێ كەوتبێ و مت بووبێ و لەشى نەرم و تەڕ و جوان بووە و هيچ جۆرە نەخۆشييەكى ئەسپى سوارى نەبووە.

كَأَنَّهَـــا لِقْـــوَةٌ طَلُـــوبُ   تَخِـــرُّ فِـــي وَكْرِهَـــا القُلُـــوبِ

لقوة: هەڵۆی چیانشین، طلوب: ڕاوچی شارەزا بۆ باڵداری بچووك و گیانداری بچووك، تخرّ: نووچی داوە و سەری بە زەوییەوە ناوە، القلوب: دڵی ناسکی باڵندەی خوراو.

دەڵێ: ئەو ئەسپەی من وەك هەڵۆی چیانشین و شارەزای ڕاوی کەروێشك و قەل و باڵندەی ترە، ئەوەندە ڕاوی کردووە، لەناو هێلانەی هەناو و دڵ و ناوسکی باڵندەی زۆردا بڵاو بووەتەوە.

بَاتَـــتْ عَلَـــى إِرَمٍ عَـــذُوباً   كَأَنَّهَـــا شَـــيْخَةٌ رَقُـــوبُ

بانت: دامەزراوە، إرم: ئاڵا، چیای بەرز، عذوباً: حەزی لە خۆرك نییە، شیخة: ژنی شیوەنگێڕ، رقوب: منداڵی مردووە. ئەوە وەسفی هەڵۆی پێشووە کە ئەو هەڵۆیە نیشتووەتەوە بەسەر شاخێکی بەرزەوە و دۆشداماوە و تێری خواردووە.

فَأَصْـــبَحَتْ فِـــي غَـــدَاةٍ قِـــرَّةٍ   يَسْـــقُطُ عَـــنْ رِيشِـــهَا الضَّـــرِيبُ

اصبحت: دەمی بەیانیی، قرّة: زۆر سارد و بەفر و سەختە، ریش: پەڕ، الضریب: پارچەسەهۆڵ.

دەڵێ: ئەو هەڵۆیە لە ڕۆژێکی زۆر سارد و لەسەر شاخێکی بەرز لەسەر هەردوو لاقی وەستاوە و بەفر و سەهۆڵ لە پەڕەکانی دەوەرێ.

فَأَبْصَرَتْ ثَعْلَباً سَرِيعاً     وَدُونَهُ سَبْسَبٌ جَدِيبُ

ئەو هەڵۆیە ڕێویەکی بینی غاری دەکرد بەپەلە دەڕۆیشت، سبسب: ئەرزێکی پان و چۆڵ و بێ پەناگەی درەخت و دەوەن، جدیب: بێ پووش و ڕووتەن.

دەڵێ: ئەم هەڵۆیە لە سەرەوە چاوی کەوت بە ڕێوییەکی قەڵەو و بە پەلە ڕێی دەکرد و لە بەردەمی ئەم ڕێوییە ئەرزێکی دەشت و بێ پەنابوو، جا وەرە هەڵۆ پەلاماری بدە.

فَنَفَضَتْ رِيشَهَا وَوَلَّتْ     فَذَاكَ مِنْ نَهْضَةٍ قَرِيبُ

فنفضت: وەراندی و لە خۆی کردەوە، نهضة: ڕاپەڕین.

دەڵێ: ئەو هەڵۆیە خۆی جوان ئەکات و سەهۆڵ و بەفرەکەی لە خۆی لابرد و ڕاپەڕی بەرەو ڕێوییەکە و زۆر نزیك کەوتەوە و بە هەردوو دەستی ڕێوی هەلگرت بۆ هێلانەکەی لەسەر چیا و خواردنی ژەمێکی فەرخەکانی تێدایە، خودا نەبینرێ ژەمێکی چەورە!.

فَاشْتَالَ وَارْتَاعَ مِنْ حَسِيسٍ     وَفِعْلَهُ يَفْعَلُ الْمَذْؤُوبُ

إشتال: کلکی نا بەشانەوە و غاریدا، حسیس: کە هەستیکرد هەڵۆ لە سەرەوەیە بۆ گرتنی، المذؤوب: هەموو ترساوێ.

دەڵێ: جەنابی مام ڕێوی کلکی بەرزکردەوە و غاریدا، کە هەستیکرد هەڵۆ وا بە سەریەوە، ئەوە کاری هەموو کەسێکە کە بترسێ.

فَنَهَضَــــــتْ نَحْـــوَهُ حَثِيثَــــةً وَحَـــرَدَتْ حَـــرْدَهُ تَسِـــيبُ

بالّی خۆی تەکان، هەلّۆئاسا بەرەو مام ڕێوی دای لە شەقەی باڵ و بەرەو ئەو کشا و تەپی کوتایە سەری و زرمەی لێ هەڵسان و هەردوو چەنگالّی گیرکرد لە ملی مام ڕێوی.

فَـــدَبَّ مِـــنْ رَأْيِهـــا دَبِيبـــاً وَالْعَـــيْنُ حِمْلاَقُهَـــا مقْلُـــوبُ

دبّ: کەوتە نەرمەغار بۆ خۆشاردنەوە، حملاق: ڕەگی چاوی مام ڕێوی ڕێشکە و بێشکەی ئەکرد.

دەلّێ: جا وەرە مام ڕێوی لە ترسی ئەو هەلّۆیە بەغار تێیقوچێنە و ڕاکە و چاوت ڕیشکە و بێشکە بکات و بەرپێی خۆت نەبینی.

ئەو وێنەیە بۆ نوعمانی کوڕی مونزیری کێشاوە کە شای ئێران پەلاماری ڕێوییە فێڵبازەکانی عەرەبی دەدا و لەسەر چیاکان ڕاوی ئەم جۆرە پادشایانەی دەکرد.

فَأَدْرَكَتْـــــــهُ، فَطَرَّحَتْـــــــهُ وَالصَّـــيْدُ مِـــنْ تَحْتِهَـــا مَكْـــرُوبُ

دەلّێ: دەستی گەیشتە مام ڕێوی و دای بە زەویدا و داماوە لەژێر چنگیدا و دەنووکی هەلّۆی چیاش دەلەرزیی و ترسی لێ نیشتبوو.

فَجَدَّلَتْــــــهُ، فَطَرَّحَتْـــــــهُ فَكَـــدَّحَتْ وَجْهَـــهُ الْجَبُـــوبُ

دەڵێ: دای بە ئەرزا و نیشتە سەری و پاڵی خست و چرنووکی لەدەم و چاوی گرت و زۆری هەڵکۆڵی و پەکی خست و ئەوجا بەرزی کردەوە بۆسەر چیا بەرزەکە بۆ خۆراکی ژەمی بێچووەکانی.

ئەم شاعیرە دەخوازێ هەڵۆیەك پەیدا بێ بۆ ئەم ڕێوی بیابانە کە بە ناحەقی خوێنی شاعیر دەڕێژێ، هەروایش دەرچوو، شای ئێران نەوشیروان، ئەو شا گەندەڵەی لەناوبرد.

فَعَاوَدَتْــــــــهُ، فَرَفَّعَتْــــــــــهُ    فَأَرْسَــــلَتْهُ وَهْــــوَ مَكْــــرُوبُ

عاودتــەی: دووبــارە هــەڵۆ کــە پــەلاماری ڕێوییەکەیــدا، فرفعتــە: بەرزیکردەوە و قاچی لە زەوی بڕی و بەرەو سەرەوە هەڵیگرت، أرسلتە: ڕەوانەی کرد بۆ هێلانە، مکروب: داماوی بۆ مام ڕێوی.

دەڵێ: ئەو هەڵۆیە لە بەرزەوە پەلاماری ڕێوییەکەیدا و جاری یەکەم بەر چنگ و دەنووکی نەکەوت، بەڵام ئەمجارە هاتەوە سەری و پەلاماریدا و چنگ و دەنووکی گرت لە سنگ و ملی و بەرزیکردەوە و دەست و قاچی لە زەوی بەرزکردەوە و ڕەوانەی هێلانەکەی کرد بۆ خۆراکی بەچکە هەڵۆکان.

خۆزگە هەڵۆیەك وەك ئەم هەڵۆیە پەلاماری ئەم ڕێوییە فێڵبازەی بدایە کە بە ناحەق خوێنی ئەم شاعیرە دەڕێژێ.

يَضْــــغُو، وَمُخْلَبُهَــــا فِــــي دَفِّــــهِ    لاَبُــــدَّ حَيْزُومُــــهُ مَنْقُــــوبُ

یضغو: ئەیقوزان و هاواری ئەكرد، مخلب: چنگولّ، نینۆك بە تایبەت بۆ سیسرگ و هەلۆ و واشەی گۆشتخۆر، دف: پەراسووی هەردوو بنبالّی، یان سنگی بەرەو ناوسكی، منقوب: كونی كرد.

دەلّیّ: كە هەلّۆی مەردی چیانشین ئەمجارە هاتەوە گیانی ڕیّوی فیّلّباز و مریشكخۆر و كەلّەشیّری مالّهەژارەكان، چنگی گیر كرد لە سنگی، ئەویش هاوار و قووزەی بەرزبووەوە، بەلاّم چنگی لە دەفەی شان و سنگی گرتبوو، دەنووكی لە دەم و چاوی و لە هەردوولاوە ورگ و ڕیخۆلّەی كون كرد، دەستتخۆش! تۆلّەی هەژارانی كردەوە.

ئەوە كۆتایی ڕاڤەكردن و كوردانـدنی ئەم قەسیدەی عەبیدە، ئەمرۆ چوار شەممە هەژدەی ئابی دوو هەزار و دە لە هەلّەبجە، تەواو بووم سوپاس بۆ خودا.

مەلا عەبدوللەتیف بامۆكی

# وەك پاشكۆ

ئەوەی جێگەی گومانی بەهێز نییە، ئەوەیە كە قەسیدە هەڵواسراوەكان و چامە زێڕینــەكان پــوختترین بەرهــەمی ئــەدەبی زمــانی عــەرەبی و هۆكـارێكی سـەرەكین بـۆ زمـانی یـەكگرتووی عـەرەب، كـە قورئـانی پـیرۆز كۆتایی هێنا بە جیاوازی لەهجەو بن لە هجەی كۆنی زمانەكـە و، بـوو بـە زمانی فەرمیی دەوڵەتی نوێی ئیسلام لە دوورگەی عەرەب و پاش ئـەو لـە خەلافەتی كوڕانی ئەمـەویی و عەباسـیی بـوو بـە زمـانی هـەموو جیهـانی ئیسلامیی، كـە ئێسـتە زیـاتر لـە پـەنجا دەوڵـەت تێیـدا دەژی و لـەناو ئـەو نەتەوە و زمان و كلتورەی لەم ناوچەدا دەژیـن، نەتـەوە و زمـان و كلتـوری كـوردە، هـەر لەسـەرەتای گەشەسـەندن و پەرەسـەندنی زمـانی عەرەبیـدا تەنها زمانێ كە بەرگری لە مانەوەی خۆی كردبێ زمانی فارسی بوو، بەڵام بە تێكەڵ و پێكەڵ و عەرەباندنی زۆری وشەكانی، پاش ئەو زمانە، زمـانی كوردی وەك كێـو و شـاخەكانی كوردسـتان خـۆی ڕاگـرت و بـە زینـدوویی مایەوە و هەوڵی توانەوە و پوچەڵكردن و پەراوێزخستنی لەبار برا، بـەڵام وەك زمـانی فـەرمیی كـورد خـۆی نیشـان نـەدا، بـەڵكو بـە شـێوەی زاراوەی ناوچەیی، لەبەر ئـەوە دەوڵـەت و كیـان و پەرچـەم و فـەرمانڕەوایی خـۆی نەبوو، هەتا سەدەی نۆزدەهەم، كە نەتـەوە و نـەژاد و زمانـەكان گەشـەیان كرد، زمانی كوردیش كەوتە خۆی و گەشەی بەرچاوی بەخۆیەوە بینـی.

ئەوجا دەوڵەمەندیی زمان و یەكگرتنی هەموو زاراوەكان بە چی بە زیندویی دەمێنێتەوە؟، بە بەكارهێنانی و دەوڵەمەندكردنی بە دەق و شاكاری زمانەكانی دەوروبەری خۆی، لە زمانە كاریگەرەكانیش لەسەر زمان تەنها زمانی عەرەبییە و پیرۆزترین و جوانترین و ڕاستترین و توناپرترین دەق تەنها و تەنها قورئانە و دەقی فەرموودەكانی ڕاستی پێغەمبەرە (دروودی خودا لە گیانی پاكی بێت)، پاش ئەم دوو دەقە شیعری ئەو سەردەمی پێش ئیسلامە، كە تەنها بە بۆچوونی بیر و هزری ئاینیی و خوداپەرەستیی ناونراوە چاخی نەفامیی.

ئەدەبی عەرەبی چاخی بەناو نەفامیی زۆر و فراوانە لە چوارچێوەی دەقگەلێكدا، هەندێ دەڵێن حەوتە و بە حەوتە درێژەكە ناوی دەركردووە و هەندێ دەڵێن دەیە، بەڵام زۆربەی ڕاڤەكارانی عەرەب بەلایانەوە حەوت ڕاستە، كە (ئیمرەئولقەیس، تورفەی كوڕی عەبدە، زوهەیری كوڕی ئەبی سولما، عەمری كوڕی كولسوم، حەرسی كوڕی حەللەزە، لەبیدی كوڕی ڕەبیعە، عەنتەرەی كوڕی شەداد)ە، زانای وەك حوسەینی زەوزەنی لەسەر ئەم ڕایەیە، بەڵام ڕای دووەم كە خەتیبی تەبریزیی لەسەری ڕای هەیە، دەڵێ: قەسیدە هەڵواسراوەكان ژمارەیان دە قەسیدەیە، ئەویش ڕای وایە تەنها حەوتە ناوبراوەكە هەڵواسراوە.

ئەو سیانە كە (نابیغەی زوبیانی و ئەعشای گەورە و عەبیدی كوڕی ئەبرەس)ە، ئەم سێ و حەوتە پێشووەكە بە ناوی دە قەسیدە زێڕینەكە ناونراوە، كە ئەم قەسیدانە تەعبیر لە ژیانی سیاسیی و كۆمەڵایەتیی و خێڵایەتیی و ئابووریی و دەروونیی ئەو سەردەمە دەكەن، بەڵام ڕەخنەگران و ئەدەبزانانی عەرەبی سەردەم لایان وایە ئەم سێ شاعیرەی

دوایی بە شاعیری دەربار ناسراون و ناودەبرێن، هەرچەندە لە پێش ئیسلامدا دەوڵەتێك كە خاوەنی ئاڵا و سوپا و سكە و دەسەڵاتی سەربەخۆ بێ نەبووە.

هەندێ میرنشینی عەرەب، لە یەمەن، لە كەنداو، لە نەجد، لە حیجاز، بوونی هەبووە و یاسا و ڕێسای فەرمانڕەواییان نەبووە، مەنازیرە لە حیرە بووە، لە ژێر دەسەڵاتی فارسە ساسانیەكاندا بوون و لاسایی ئەوانیان كردووەتەوە لە شێوەی دانایی، دەركەوان، نووسەر، كۆشك و پەردە و كۆڕی شاهانە، دەوڵەتی بەناو فەسانییەكان لە بەڵقای، ئەوانە وەك بەدەوی وان لە هەوارێكەوە بۆ هەوارێك كۆچیان كردووە.

# بەکوردی کردن

هەرچەندە ئێمە زۆر تووشی ئازار و توێژینەوە نەهاتووین لە ڕاستکردنەوەی ئەم دەقە شیعرییانەدا، بەڵکو دەقەکان لەناو دەیان کتێبی وەك: (الأغانی ابو فرج اصفهانی، الشعر والشعراء ابن نوقیبة، المزهر السیوطی، شرح المعلقات زوزنی، جمهرة اشعار العرب أبو زید القوریشی، شرح المعلقات خطیب تبریزی) دا هاتووە و دەیان و سەدان جێگۆڕکێ لە فەردێکەوە بۆ فەردێك و لە ڕستەیەکەوە بۆ ڕستەیەك و لە ژمارەی دەقە شیعرەکان جیاوازی زۆری تێدایە، بەڵام ئێمە دەقێکی پەسەندمان هەڵبژاردووە و کردوومانە بە کوردی، بۆ دوو مەبەست:

یەکەم: شارەزاکردنی کورد بە دەقە شیعرییەکان و بە ئاگاهێنانی کورد کە عەرەب ئێستە بیست و چوار دەوڵەت و کیان و قەوارەی سیاسییان هەیە، بەم شێوەیە ژیاون.

دووەم: دەوڵەمەندکردنی زمانی کوردی لە ئاستی ئەدەبی ئەو سەردەمە و زۆر بیروبۆچوون هەیە لەدەقەکاندا ئێستەش ئاسەواریان هەر ماوە.

ئەوە نیازی ئێمە و پاداشتیش تەنها لە خودا داوا دەکەم.

مەلا عەبدوللەتیف بامۆکی

## ناوەرۆك

## لەبەرهەمەكانی نووسەر و وەرگێڕ:

١ـ وەرگێڕانی كتێبی (سراج القلوب)ی شێخ عوسمان سراج الدین، لە فارسیەوە بۆ عەرەبی، ١٩٨٩,

٢ـ بانگەوازێك لە میحرابی عەبابەیلیێ وە–راڤەی دەقێكی شیعریی شێخ بابا ڕەسوڵی بێدەن. ٢٠٠٨,

٣ـ سروودی بیابان و شاخ (شەنفەرا–توغرایی)، وەرگێڕان و ڕاڤەكردن. ٢٠٠٩,

٤ـ لامیەی كورد، وەرگێڕان و ڕاڤەكردن. ٢٠٠٩,

٥ـ بانت سعاد (قەسیدەی بوردە) بە كوردی. ٢٠١٠.

٦ـ نهج البلاغە ـ ئیمامی عەلی ـ وەرگێڕان. لەژێر چاپدایە.

٧ـ ئاژاوە گەورەكە ـ تەها حسەین ـ بەكوردی ئامادەیە بۆ چاپ. ٢٠١١.

